ئۆرهان پاموک

# قەڵای سپی

هەڵگری خەڵاتی نۆبڵی ئەدەبیات ٢٠٠٦

**بەکر شوانی**

لە تورکییەوە وەری گێڕاوە

ناوی کتێب: قەڵای سپی – ڕۆمان
نووسینی: ئۆرهان پاموک
وەرگێڕانی لە تورکییەوە: بەکر شوانی
بڵاوکراوەی ئاراس– ژمارە: ٧٩٨
دەرهێنانی هونەریی ناوەوە: بەدران ئەحمەد
بەرگ: مریەم موتەقییان
چاپی یەکەم، ٢٠٠٨
لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان لە هەولێر ژمارە ١٨٥٧ی ساڵی ٢٠٠٨ی دراوەتێ

بۆ:

مرۆڤی باش، خوشکی باش

نیلگوین دارڤینئۆغڵو

١٩٦١-١٩٨٠

"پێشبینیکردنی ئەوەی کەسێکی مایەی بایەخ پێدانی ئێمە تێکەڵ بەرەگەزەکانی ژیانێکی نادیار و بارتەقای نادیارییەکەشی، سەرنجڕاکێش بووە و بیرکردنەوە لەوەی، کە تەنیا بەخۆشەویستیی ئەوەوە دەتوانین پێ بنێینە ژیانەوە، ئەگەر ئاماژە نەبێ بۆ دەسپێکی ئەڤینێک، ئەدی چ واتایەکی تر دەگەیەنێ؟"

ی. ک. قەرەعوسمانئۆغڵو

لە مارسێل پرۆستەوە وەری گێڕاوە

# ئۆرهان پاموک

لە ساڵی ١٩٥٢ لە ئەستەنبوڵ لە دایک بووە. لە خێزانێکی هاوشێوەی خێزانەکانی ناو ڕۆمانەکانی "جەودەت بەگ و کوڕەکانی" و "کتێبی ڕەش"، لە نیشانتاشی، کە بەشە شارێکی دەوڵەمەند و بەڕۆژئاوایی بووی ئەستەنبوڵە، پێ گەیشتووە. وەک خۆیشی لە کتێبی ئۆتۆبیۆگرافی ئەستەنبوڵدا باسی کردووە، لە منداڵییەوە تا تەمەنی ٢٢ ساڵی خووی داوەتە نیگارکێشان و پێی وابووە لە داهاتوودا دەبێت بەنیگارکێش. قۆناغی ئامادەیی لە قوتابخانەی Robert Col-legeای ئەمەریکایی لە ئەستەنبوڵ خوێندووە. دوای سێ ساڵ خوێندنی نیگارکێشی و بیناسازی لە زانکۆی تەکنۆلۆژی ئەستەنبوڵ، تێ دەگات ناتوانێ ببێ بەبیناساز و نیگارکێش، بۆیە دەست لە خوێندن هەڵدەگرێ. لە زانکۆی ئەستەنبوڵ دەست بەخوێندنی ڕۆژنامەوانیی دەکات. پاموک لە تەمەنی بیست و سێ ساڵییەوە بڕیار دەدات ببێ بەڕۆماننووس، دەست لە هەموو شتێکی تر هەڵدەگرێ، خۆی دەخزێنێتە سووچی ماڵەوە و دەست بەنووسین دەکات.

ڕۆمانی یەکەمی، "جەودەت بەگ و کوڕەکانی"، لە ساڵی ١٩٨٢دا بڵاو کرایەوە. ئەم ڕۆمانە خەڵاتی ئۆرهان کەمال و خەڵاتی ڕۆمانی ڕۆژنامەی میللییەتی وەرگرت. ساڵی دواتر، پاموک ڕۆمانی "ماڵی کپ"ی خستە بازاڕەوە. ئەم ڕۆمانە، پاش وەرگێڕانی بۆ زمانی فەڕەنسی، لە ساڵی ١٩٩١دا خەڵاتی Prix de la Découverte Eu-ropéene ی پێ بەخشرا. ڕۆمانی "قەڵای سپی"، کە چیرۆکی ناکۆکی و دۆستایەتیی نێوان کۆیلەیەکی ڤینیسیایی و زانایەکی عوسمانی دەگێڕێتەوە و نووسەر لە ساڵی ١٩٨٥دا بەچاپی گەیاندووە، پاش ئەوەی لە ساڵی ١٩٩٠دا بۆ زمانی ئینگلیزی و چەند زمانێکی تری

ڕۆژئاوایی وەرگێڕدرا، یەکەم ڕۆمان بوو کە ناوبانگی پاموکی گەیاندە ئاستی نێودەوڵەتی. لە ساڵی ١٩٨٥دا خۆی و هاوسەرەکەی چوونە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و ماوەی سێ ساڵ لە زانکۆی کۆڵۆمبیا لە نیویۆرک وەک "زانای میوان" کاری کرد. لەوێ بەشێکی زۆری ڕۆمانی "کتێبی ڕەش"ی نووسییەوە. نووسەر لەو ڕۆمانەدا، لە ڕێی پارێزەرێکەوە کە بەدوای هاوسەرە ونبووەکەیدا دەگەڕێ، باسی کوچەکانی ئەستەنبوڵ، ڕابردووی شار، پێکهاتە و ڕایەڵەکانیمان بۆ دەگێڕێتەوە. "کتێبی ڕەش" لە ساڵی ١٩٩٠دا لە تورکیا بڵاو کرایەوە و دوای وەرگێڕانی بۆ زمانی فەڕەنسی، خەڵاتی Prix France Culture ی وەرگرت. "کتێبی ڕەش"، ئەزموونێکی ئەوتۆیە، کە باس و خواسی زۆری هەڵگرتووە و ناوبانگی پاموکی زیاتر بەتورکیا و بەجیهاندا بڵاو کردەوە.

ڕۆمانی "ژیانی نوێ" کە لە ساڵی ١٩٩٤دا بڵاو کرایەوە و بەسەرهاتی فێرخوازێکی زانکۆ دەگێڕێتەوە کە کەوتووەتە ژێر کاریگەریی کتێبێکی جادووئامێزەوە، یەکێک بوو لەو ڕۆمانانەی پاموک کە ژمارەیەکی پێوانەیی لە فرۆشتندا تۆمار کرد. نووسەر لە ساڵی ١٩٩٨دا ڕۆمانی "ناوی من سوورە"ی بڵاو کردەوە. ئەم ڕۆمانە کە چیرۆکی نیگارکێشەکانی عوسمانی و ئێرانی و جیهانی ڕۆژئاوامان بۆ دەگێڕێتەوە، لە ساڵی ٢٠٠٢دا لە فەڕەنسا خەڵاتی Prix du Meilleur Livre étranger، لە ئیتاڵیا خەڵاتیGrinzane Cavour و لە ساڵی ٢٠٠٣دا لە ئیرلەندا خەڵاتی International Impac-Dublinی وەرگرت.

پاموک لە ناوەڕاستی ساڵانی نەوەدی سەدەی ڕابردوودا دەستی دایە وتارنووسین لە بوارەکانی مافی مرۆڤ و ئازادیی بیرورا دەربڕین و کەوتە ڕەخنەگرتن لە دەوڵەتی تورکیا، بەڵام خۆی زۆر بەسیاسەتەوە سەرقاڵ نەکرد. گوڵبژێرێکی لە وتارە ئەدەبی و کولتوورییەکانی بۆ ڕۆژنامە و گۆوارە ناوخۆیی و دەرەکییەکان کۆ کردەوە و لە ساڵی ١٩٩٩دا لە دوو توێی کتێبێک بەناوی "ڕەنگەکانی تر" بەچاپی گەیاندن.

لە ساڵی ٢٠٠٢دا ڕۆمانی "بەفر"ی بڵاو کردەوە کە خۆی "بەیەکەمین

و دواین ڕۆمـــانی ســـیـاسی"ی دادەنێ. نووســەر بەم ڕۆمـانە کـە ڕووداوەکانی لە شاری قارس دەقەومێن و ئیسلامی سیاسی، سوپا، لایست و توندوتیژی و ناکۆکییەکانی نێوان نەتەوەپەرستانی تورک و کورد دەخاتە بەرچاوان، شێوازێکی نوێی نووسینی ڕۆمانی سیاسیی تاقی کردەوە. ڕۆژنامەی نیویۆرک تایمز لە ساڵی ٢٠٠٤دا ڕۆمانی "بەفر"ی لە ئاستی جیهاندا خستە ڕیزی باشترین ١٠ کتێبی ساڵەوە. "ئەستەنبوڵ" کتێبێکی تری ئۆرهان پاموکە کە ساڵی ٢٠٠٣ چاپ کراوە. نووسەر لەو کتێبەدا، بیرەوەرییەکانی خۆی تا تەمەنی ٢٢ ساڵی دەگێڕێتەوە. ئەو کتێبە شیعرئامێزەی نووسەر کە بەوێنەی ئەلبوومی تایبەتیی نووسەر و وێنەی نیگارکێشانی بیانی و ناوخۆیی ڕازاوەتەوە، پۆلێنکردنی کارێکی دژوارە.

بەزمانی کوردی و بەکوردستانەوە، بەرهەمەکانی ئۆرهان پاموک بەزیاتر لە ٥٠ زمان لە ١٠٠ و هێندە وڵاتی جیهاندا دەخوێندرێنەوە. پاموک لە ساڵی ٢٠٠٥دا خەڵاتی ئاشتیی کۆبەندی وەشانخانەکانی ئەڵمانیای وەرگرت کە بەدیارترین خەڵاتی بواری کولتووریی ئەڵمانیا دادەنرێ و لە ساڵی ١٩٥٠وە دابەش دەکرێ. خەڵاتی Le Prix Médicis étranger کە ساڵانە لە فەرەنسا بەباشترین ڕۆمانی بیانی دەبەخشرێ، لە ساڵی ٢٠٠٥دا بە ڕۆمانی "بەفر" درا. نووسەر لە هەمان ساڵدا خەڵاتی Richarda Huchی وەرگرت کە لە شاری دارمشتادتی ئەڵمانیا هەرسێ ساڵ جارێک بە"کەسایەتی خاوەن بیری ئازاد و هەڵوێستی بوێرانە" دەرێ. گۆڤاری Time لە ساڵی ٢٠٠٦دا ئۆرهان پاموکی وەک یەکێک لە ١٠٠ کەسایەتیی کاریگەری ساڵ هەڵبژارد. ڕۆمانی "بەفر" لە هەمان ساڵدا خەڵاتی Le Prix Méditerranée étrangerی پێ درا. پاموک ئەندامی شانازیی American Academy of Arts and Lettes ی ئەمەریکییە و تا ئێستا لە زانکۆکانی تیلبورگ و بەرلین لە ئەڵمانیا و ئەستەنبوڵ لە تورکیا، دکتۆرای شانازیی پێ دراوە. نووسەر لە ساڵی ٢٠٠٦دا خەڵاتی نۆبڵی ئەدەبیاتی وەرگرت و بوو بەدووەم لاوترین کەس لە مێژووی وەرگرتنی بەخشینی ئەو خەڵاتەدا.

# پێشەکی

ئەم دەستنووسەم لە ساڵی ١٩٨٢ لە ناو پاشماوەی "ئەرشیڤ"ی سەر بەقایمقامییەتی گەبزەدا، کە کردوومە بەخوو و هەموو هاوینێک هەفتەیەک سەروبنی دەکەم، دۆزییەوە. دەستنووسەکە لە بنی سندووقێکی تۆزاویی پڕ لە فەرمان، بەڵگەی تاپۆ، تۆماری دادگا و دەفتەری فەرمیدا بوو. لەبەرئەوەی بەرگێکی بەنەخش و نیگاری زەریفی تێ گیرابوو و بەدەستنووسێک، کە بۆ خوێندنەوە دەشیا، نووسرابوو و لە ناو بەڵگەنامە زەرد هەڵگەڕاوەکانی دەوڵەتدا بریسک و باسکی بوو و دەدرەوشایەوە، لەجێدا سەرنجی منی ڕاکێشا. پێم وابێ دەستێکی نامۆ، وەک ئەوەی مەبەستی بووبێ لە ڕادەی واقوڕماویم بباتە سەرێ، سەردێڕێکی لە لاپەڕەی یەکەمی کتێبەکەدا نووسیبوو: "زڕکوڕی لێفەدروو". هیچ سەردێڕێکی تریشی بەسەرەوە نەبوو. دەستێکی منداڵکارانە لە پەراوێز و بۆشاییی لاپەڕەکاندا وێنەی مرۆگەلی سەربچووکی وای کێشابوو کە هەموویان جلوبەرگی پڕ لە قۆپچەیان پۆشیبوو. یەکسەر و بەزەوقێکی زۆرەوە کتێبەکەم خوێندەوە. زۆر دڵم تێی چوو، بەڵام لەبەرئەوەی لەوە تەمبەڵتر بووم بتوانم بەنووسین دانەیەکی لەبەر بگرمەوە، بەقۆستنەوەی متمانەی فەرمانبەرەکەی ئەوێ، کە لە سۆنگەی ڕێز لێگرتنمەوە چاودێریی نەدەکردم، لە چاوتروکاندنێکدا کتێبەکەم لەو زبڵخانەیەی کە تەنانەت قایمقامی لاویش بە"ئەرشیڤ" ناوی نەدەبرد، دزی و خستمە بنی جانتاکەمەوە.

ڕۆژانی سەرەتا، جگە لە خوێندنەوەی لەسەریەکی کتێبەکە، نەمدەزانی چیی تر بکەم. بەهۆی ئەوەی هێشتا لە مێژوو بەگومان بووم، ویستم لەبری بەهای زانستی و

کولتووری و ئانترۆپۆلۆجی یان "مێژوویی"ی کتێبەکە، زیاتر بایەخ بە بەسەرهاتەکەی ناوی بدەم. ئەمەش منی بەرەو لای چیرۆکنووسەکە خۆی ڕادەکێشا. لەبەرئەوەی خۆم و هاوڕێکانم ناچار بووین زانکۆ بەجێ بهێڵین، گەڕابوومەوە سەر کاری ئەنسکلۆپیدیایی کە پیشەی باپیرم بوو: لەو سەروبەندەدا بوو بەخەیاڵمدا هات پەرەگرافێک دەربارەی نووسەری کتێبەکە لە ئەنسکۆپیدیای (ناوداران)دا، کە خۆم سەرپەرشتیی بەشی مێژووەکەیم دەکرد، دابنڕێ.

بەوجۆرە، ئەو کاتانەی کە دوای کاری ئەنسکلۆپیدیا و خواردنەوە بۆم دەمایەوە، بەم کارەم بەخشی. پاش گەڕانەوەم بۆ سەرچاوە بنەڕەتییەکانی سەردەمی نووسینی کتێبەکە، دەستبەجێ بۆم دەرکەوت هەندێک لە ڕووداوەکانی ناو بەسەرهاتەکە ڕەنگدانەوەی ڕاستییەکان نین، بۆ نموونە: لە ماوەی پێنج ساڵ فەرمانڕەواییی باشوەزیر کۆپرولودا لە ئەستەنبوڵ ئاگرێکی گەورە کەوتووەتەوە، بەڵام هیچ بەڵگەیەک نەبوو بۆ نەخۆشییەکی شایەنی باس، بەتایبەتیش بڵاوبوونەوەی پەتایەکی لەو جۆرەی لە کتێبەکەدا باسی لێوە کراوە. ناوی بڕێک لە وەزیرەکانی سەردەم بەهەڵە نووسرابوون، هەندێکیشیان جێگۆڕکێ بەناوەکانیان کرابوو و تەنانەت بەشێکیشیان گۆڕابوون! ناوی گەورەی ئەستێرەناسانیش لەگەڵ ئەو ناوانەی لە تۆمارەکانی کۆشکدا هەبوون، یەکیان نەدەگرتەوە، بەڵام بەهۆی ئەوەی پێم وابوو ئەم خاڵە پایەیەکی گرینگی لە کتێبەکەدا هەیە، لەسەری ڕاوەستام. لە لایەکی دی، "زانیارییەکانمان" لە بارەی مێژووەوە، بەشێوەیەکی گشتی ڕووداوەکانی ناو کتێبەکەی پشتڕاست دەکردەوە. بگرە لە هەندێ لە وردەکارییە بچووکەکانیشدا ئەو "ڕاستی"یەم بینی: کوژرانی حوسێن ئەفەندیی گەورەی ئەستێرەناسان و ڕاوەکەرویشکی سوڵتان محەمەدی چوارەم لە کۆشکی میراخۆر لەگەڵ هەمان شێوازی گێڕانەوەی نەعیمەدا یەکدەگرێتەوە. ئەوەشم بەخەیاڵدا هات، نووسەر، کە پێ دەچێ زۆری حەز لە خوێندنەوە و خەیاڵ ئافراندن بووبێ، ئەو جۆرە سەرچاوانە و چەند کتێبێکی تریشی بۆ بەسەرهاتەکەی بەدەست هێنابێ و لەوانەیە بڕێک شتی لێ وەرگرتبێ. هەرچەندە نووسەر دەڵێ ئەولیا چەلەبیی ناسیوە، بەڵام پێ دەچێ تەنیا کتێبەکانی خوێندبێتەوە. وای بۆچووم لەوانەیە، وەک لە نموونەکانی تریشدا

دەبیندرێ، پێچەوانەی ئەمەش ڕاست بێ. هەوڵم دا لەگەڕان بەدوای شوێنەواری نووسەری چیرۆکەکەمدا بێ ئومێد نەبم، بەڵام ئەنجامی بەدواداگەڕان و لێکۆڵینەوەکانم لە کتێبخانەکانی ئەستەنبوڵ، زۆربەی ئومێدەکانمی دایە دەم ئاوەوە. نە لە کتێبخانەی کۆشکی تۆپ قاپی و نە لە کتێبخانەکانی تر هیچ کام لەو لێکۆڵینەوە و کتێبانەم بۆ نەدۆزرایەوە کە لە ماوەی نێوان ساڵانی ١٦٥٢ و ١٦٨٠دا بۆ سوڵتان محەمەدی چوارەم نووسراون. تەنیا یەک سەرەداوم کەوتە دەست: "خۆشنووسی چەپەوانە" کە لە بەسەرهاتەکەدا ناوی هاتووە، لەو کتێبخانانەدا پاشماوەی تری هەبوو. ماوەیەک دوای ئەم کارە کەوتم، بەڵام ئیدی بێزار بووبووم. لە زانکۆکانی ئیتاڵیاوە، کە بەنامە دامگرتبوونەوە، وەڵامی ئومێد لێبڕاوم بۆ دەهاتەوە: بەپشتبەستن بەناوی نووسەر کە لە کتێبەکە خۆیەوە دەردەچێ، بەڵام لەسەری نەنووسراوە، دەستم کرد بەگەڕان بەگۆڕستانەکانی گەبزە و جەنەتحیسار و ئوێسکویداردا، بەڵام سەرکەوتوو نەبووم: بەوجۆرە دەستم لە گەڕان بەدوای شوێنپێدا هەڵگرت و بەپشتبەستن بەناوەڕۆکی بەسەرهاتەکە، پەرەگرافەکەم بۆ ئەنسکلۆپیدیاکە نووسی. وەک بەترسەوە پێشبینیم کردبوو، ئەو پەرەگرافەیان چاپ نەکرد، بەڵام نەک لەبەر نەبوونی بەڵگەی زانستی، بەڵکو لەبەرئەوەی کەسی باسکراو لە کتێبەکەدا زۆر ناسراو نەبوو.

لەوانەیە لەم سۆنگەیەوە بووبێ کە زیاتر شەیدای بەسەرهاتەکە بووم. تەنانەت ماوەیەک بیرم کردەوە دەست لە کار بکێشمەوە، بەڵام کارەکەم و هاوڕێکانم خۆش دەویست. بەوجۆرە، ماوەیەک تووشی هەر کەسێک بووم، بەسەرهاتەکەم بۆ گێڕایەوە، بەڵام وەک کەسێک نا کە دۆزیبێتیەوە، بگرە جۆری کەسێک کە خۆی نووسیبێتی. بۆ ئەوەی بتوانم سەرنجی زیاتر ڕابکێشم بۆ سەری، ئاماژەم بۆ بەهای سیمبولیی کتێبەکە دەکرد و دەمگوت باس لە ڕاستییەکانی ئەم سەردەمەمان دەکات و لەمیانەی ئەم بەسەرهاتەوە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆمان تێ دەگەین و شتی تری لەو بابەتە. هەرە زیاتر لاوانی سەوداسەری بابتگەلی وەک سیاسەت و توندوتیژی و دیموکراسی بایەخیان بەم قسانەم دا، بەڵام ئەوانیش وەک هاوڕێیانی سەر مێزی خواردنەوەم، پاش ماوەیەکی کورت بەسەرهاتەکەمیان لە بیر کرد. پرۆفیسۆرێکی

هاورێم کە لەسەر پێ داگرتنی من چاوێکی بە لاپەڕەکانیدا گێڕا، دەستنووسەکەی بۆم گەڕاندەوە و گوتی: "لە ماڵە لە تەختە دروستکراوەکانی کۆڵانەکانی پشتەوەی ئەستەنبوڵدا بەدەیان هەزار دانە لەمجۆرە دەستنووسانە هەن کە لێوانلێون لە بەسەرهاتی لەو جۆرە کە ئەگەر دانیشتووانی ئەو ماڵانە لەسەر دۆلابی بەرز هەڵیان نەگرتایە لە ترسی ئەوەی کە پێیان وایە قورئانە، ئەوا پەڕە پەڕە بۆ گەرمگردنی سۆپاکانیان دەیاندڕی."

بەوجۆرە، بەهاندانی کچێکی چاویلکە لەچاو کە جگەرەی لە دەست نەدەکەوتە خوارەوە، بڕیارم دا کتێبەکە، کە هێشتا پەیتا پەیتا دەمخوێندەوە، چاپ و بڵاو بکەمەوە. خوێنەرانم بۆیان ڕوون دەبێتەوە، لە گواستنەوەی کتێبەکە بۆ سەر زمانی تورکیی هاوچەرخ، پەیڕەویم لە هیچ شێوازێکی تایبەت نەکردووە. دەستنووسەکەم لەسەر مێزێک دانابوو و دوای ئەوەی دوو سێ ڕستەم لێ دەخوێندەوە، دەچوومە بەردەم مێزێکی تر لە ژوورێکی دی کە کاغەزەکانمی لەسەر بوو و ئەوەی لە خەیاڵمدا دەما، هەوڵم دەدا بە وشە و دەستەواژەی ئەم ڕۆژگارە بینووسمەوە. خۆم ناوی کتێبەکەم دانەنا، بەڵکو ئەو دەزگای وەشاندنە داینا کە بەبڵاوکردنەوەی ڕازی بوو. ئەوانەی پێشکەشکردنەکەی سەرەتای ئەم کتێبە دەخوێننەوە، لەوانەیە بپرسن داخۆ ئەم شێوازە واتایەکی تایبەتی هەیە؟ بینینی شتەکان وەک ئەوەی هەموویان پێوەندییان پێکەوە هەبێ، پێم وابێ یەکێکە لە نەخۆشییەکانی ئەم سەردەمە. منیش لەبەرئەوەی تووشی هەمان نەخۆشی بووم، ئەم بەسەرهاتە بڵاو دەکەمەوە.

# 1

لە ڤینیسیاوە بەرەو ناپۆلی دەچووین، کاتێک کەشتییەکانی تورک ڕێیان پێمان بڕی. هەموو کەشتییەکانی ئێمە بەسەریەکەوە سێ دانە بوون، بەڵام هینەکانی ئەوان، کە لە ناو تەمومژەکەوە سەریان دەردەهێنا، هێندە زۆر بوون، ئەوسەریان دیار نەبوو. لەپڕ ترس و شڵەژان باڵی بەسەر کەشتییەکەماندا کێشا؛ سەوڵ لێدەرەکانمان کە زۆربەیان تورک و مەغریبی بوون، هاواری خۆشییان لێ بەرز بووەوە. دەمارەکانی مێشکمان گرژ بوونەوە. کەشتییەکەی ئێمەش، وەک دوو دووانەکەی دی، بەرەو وشکایی، ڕووی لە ڕۆژئاوا کرد، بەڵام نەمانتوانی بەخێرایی ئەواندا بگەین. هەرچۆنێک بێ، کاپتنی کەشتییەکەمان لە ترسی ئازاردان لە کاتی بەدیل گرتندا، دەستووری نەدەدا کۆیلە سەوڵ لێدەرەکان قایمتر قامچیڕێژ بکرێن. ساڵانی دواتر زۆر بیرم لێ کردەوە و بۆم دەرکەوت کە ژیانم لە سۆنگەی ترسی ئەو کاپتنەوە بەتەواوی گۆڕا.

ئێستاش پێم وایە تەنانەت ئەگەر کاپتنەکەمان نەشکەوتبایە ژێر کاریگەریی ئەو ترسە کورتخایەنەوە، ئەوا ڕەوتی ژیانی من لەو ساتەدا هەر دەگۆڕا. زۆربەی خەڵک دەزانن هیچ شتێک پێشتر لە ژیاندا یەکلایی نەکراوەتەوە و هەموو بەسەرهاتەکان لە ڕاستیدا زنجیرەی کۆمەڵە ڕێکەوتێکن. سەرباری ئەوەش، تەنانەت ئەوانەی پەییان بەم ڕاستییەش بردووە، کاتێک لە قۆناغێکی ژیاندا ئاوڕ بۆ دواوە دەدەنەوە، هەر یەکێک لەو ڕووداوانەی کە وەک ڕێکەوت بەسەریان هاتووە، بەچارەنووسێکی حەتمی دادەنێن. منیش بەقۆناغێکی لەو جۆرەدا تێ پەڕیم: ئێستا شێوەی کەشتییە

تورکییەکانی دەرچوو لە تەمومژەکەوە، وەک تارمایی دێنمە بەر زەینی خۆم و بەدەم نووسینەوەی کتێبەکەمەوە لەسەر مێزێکی کۆن، وای بۆ دەچم کاتی ئەوە هاتووە بەسەرهاتی خۆم لە نووکەوە تا کۆتایی بگێڕمەوە.

کاتێک کاپتنەکەمان بینی وا دوو کەشتییەکەی تر بەنێوان کەشتییە تورکییەکاندا هەڵهاتن و خۆیان لە تەمومژەکەدا ون کرد، ئومێدێکی بەبەردا هاتەوە. لەژێر پاڵەپەستۆی ئێمەشدا زاتی دایە بەر خۆی و توانیی دیلەکان بجووڵێنی، بەڵام زۆر دواکەوتبووین. جگە لەوەش، دیلەکان کە ئەوینی ئازادی بەخرۆشی هێنابوون، بەزۆری قامچیش گوێڕایەڵی فەرمان نەدەبوون. زیاد لە دە کەشتیی تورک بەشێوەی ڕەنگاوڕەنگی خۆیانەوە دیواری تەمە وەڕەسکەرەکەیان شەق کرد و بەجارێک بەرەو ڕوومان هاتن. کاپتنەکەمان، ئەمجار پێم وابێ بەمەبەستی بەزاندنی دوژمن نا، بگرە بۆ زاڵبوون بەسەر ترس و شەرمی خۆیدا، بڕیاری دا شەڕ بکات؛ دەستووری دا قامچی وەشێنەکان بێبەزەییانە بکەونە وێزەی دیلەکان و تۆپەکانیش ئاگر بدرێن؛ بەڵام ئەم ئارەزووی شەڕە کە درەنگ گڕی گرت، بەزوویش کوژایەوە و خامۆش بوو. لە لاوە کەوتینە بەر هێرشێکی چڕ، ئەگەر دەستبەجێ خۆمان بەدەستەوە نەدایە، کەشتییەکەمان نقوم دەبوو، بۆیە بڕیارمان دا ئاڵای خۆبەدەستەوەدان بەرز بکەینەوە.

لە کاتێکدا لە دەریای مەند چاوەڕێی کەشتییە تورکییەکانمان دەکرد، دابەزیمە خوارەوە بۆ کابینەکەی خۆم، هەروەک ئەوەی چاوەڕێی هاتنی چەند دۆستێک بکەم، نەک کۆمەڵێک دوژمن کە سەرتاپای ژیانم دەگۆڕن، دەستێکم بەشتومەکانمدا هێنا و ڕێکم خستنەوە، سندوقە بچووکەکەم کردەوە و داماوانە دەستم بەناو کتێبەکانمدا گێڕا. لە کاتێکدا لاپەڕەکانی کتێبێکم هەڵدەدایەوە کە لە فلۆرنسا پووڵێکی زۆرم پێ دابوو، فرمێسک ڕژایە چاوەکانم. بانگکردن و دەنگی هەنگاوە شڵەژاوەکان و گاڵەگاڵی دەرەوەی کابینەکە دەگەیشتە بەر گوێم. کەمێک دواتر بە خەیاڵمدا هات لە کتێبەکەی بەردەستم دوور بکەومەوە، بەڵام وام نەکرد، بگرە دەمویست بیر لە نووسراوی سەر لاپەڕەکانی بکەمەوە. وەک بڵێی هەموو ڕابردووم، کە نەمدەویست لە دەستی بدەم، لە نێوان بیر و ڕستە و هاوکێشەی کتێبەکەدا بێ. بە منجەمنج و وەک کەسێک تکا و نزا بکات، کەوتمە خوێندنەوەی ئەو دێرانەی کەوتنە بەرچاوم.

دەمویست هەموو کتێبەکە لە هزری خۆمدا هەڵبکۆڵم، بۆ ئەوەی کاتێک ئەوان هاتن، من لە داهاتوودا بیر لەوان و ڕەفتارەکانیان نەکەمەوە، بگرە بتوانم ڕەنگەکانی ڕابردووم جۆری وشە خۆشەویستەکانی کتێبێک کە بەئەڤینەوە لە بەرم کردووە، بێتەوە یادم.

ئەو سەردەمە من مرۆڤێکی تر بووم کە دایک و دەزگیرانی و دۆستەکانی بەناوێکی دی بانگیان دەکرد. هێشتا ئەو کەسە، کە هەر خۆم بووم، یاخۆ ئێستا پێم وایە خۆم بووم، جاروبار لە خەوندا دەبینم و کاتێکیش هۆشیار دەبمەوە، دەبینم جەستەم نیشتووەتە سەر ئاو. ئەو مرۆڤە کە بیر لە ڕەنگە لاوازەکان، ڕەنگی خەیاڵیی ولاتە هەرگیز نەبینراوەکان، ئاژەڵە ئەفسانەییەکان و ڕەنگی خەیاڵیی چەکە لە ئەقڵ بەدەرەکان دەکاتەوە، ئەو کاتە تەمەنی بیست و سێ ساڵ بوو. لە فلۆرەنسا و ڤینیسیا "زانست و هونەر"ی خوێندبوو، باوەڕی وابوو لە گەردووناسی، بیرکاری، فیزیا و نیگارکێشیدا شارەزایە. بێگومان زۆر بەخۆی دەنازی و زۆربەی شتە ئەنجامدراوەکانی پێش خۆی هەرس کردبوو و دەمی لە هەموویانەوە دەژەند. هیچ گومانی نەبوو لەوەی کە باشتریشی لە دەست دێ. بێ وێنە بوو، دەیزانی لە هەمووان ژیرتر و داهێنەرترە. بەکورتی، لاوێکی ئاسایی بوو. هەر جارێک پێویست دەکات ڕابردوویەک بۆ خۆم دابتاشم، ناتوانم بروا بەخۆم بێنم من هەمان ئەو لاوەم کە لەگەڵ خۆشەویستەکەیدا دەربارەی ئەڤینی خۆی و نەخشەکانی و جیهان و زانست دەدوا و زۆر بەشتێکی ئاساییی دەزانی ئەڤیندارەکەی پێی سەرسام بێ. بەڵام بەوە دڵی خۆم دەدەمەوە ڕۆژێک لە ڕۆژان چەند کەسێک کە بەپشووی دێژەوە ئەم نووسینانەم تا کۆتایی دەخوێننەوە، تێ دەگەن ئەو لاوە من نەبووم. لەوانەشە خوێنەرانی پشوودرێژ ڕۆژێک لە ڕۆژان، وەک ئێستای من، بیر لەوە بکەنەوە چیرۆکی ئەو گەنجەی کە بەدەم خوێندنەوەی کتێبە خۆشەویستەکانیەوە لە ژیان دوورکەوتەوە، ڕۆژێک لەو شوێنەوە کە لێی ڕاوەستابوو، دەست پێ دەکاتەوە.

کاتێک مەلەوانەکان پێیان نایە سەر کەشتییەکەمان، کتێبەکەم نایەوە سندووقەکە و چوومەوە دەرەوە. لەسەر کەشتییەکە ڕۆژی حەشر بوو. هەموانیان لە دەرەوە کۆکردبووەوە و ڕووت و قووتیان دەکردنەوە. لەپڕ بیرم چوو بۆ ئەوەی پەشێوییەکە

بقۆزمەوە و خۆم هەڵدەمە ئاوی دەریاکەوە، بەڵام بیرم کردەوە لەوانەیە لە دواوە بەر تیرم بەدەن، یان بمگرن و دەستبەجێ بمکوژن، جگە لەوەش، نەمدەزانی چەند لە وشکاییەوە دوورین. سەرەتا خۆیان لە من نەگەیاند. کۆیلە موسڵمانەکانی ڕزگار بوو لە کۆت و پێوەند هاواری خۆشییان لێ بەرز دەبووەوە. هەندێکیشیان یەکسەر دەستیان کردبوو بەتۆڵەسەندنەوە لە قامچی وەشێنەکان. تۆزێک دواتر منیان لە کابینەکەمدا دۆزییەوە، هاتنە ژوورەوە، شتومەکانمیان بەتاڵان برد. سندووقەکانیان بۆ گەڕان بەدوای زێڕدا ژێروژوور کرد، پاش بردنی بڕێک لە کتێبەکانم و هەموو شتومەکەکانم، یەکێکی تریان پەیدا بوو. لە کاتێکدا بەداماوی لاپەڕەی یەک دوو کتێبێکم هەڵدەدایەوە کە بۆم مابوونەوە، پەلی منی گرت و بردمی بۆ لای یەکێک لە کاپتنەکان.

ئەو کاپتنە کە دواتر زانیم جێنێوایییەکی لە ئاین هەڵگەڕاوەیە و بووە بەموسڵمان، ڕەفتاری باشی لەتەکمدا نواند. پرسیی داخۆ شارەزای چ بوارێکم. بۆ ئەوەی نەمکەن بەسەوڵ لێدەر، یەکسەر باسی زانستی گەردووناسیی خۆم و توانای ئاراستە دۆزینەوەم لە شەودا کرد، بەڵام فەرامۆشیان کردم. بۆیە بەپشتبەستن بەو کتێبی ئەناتۆمییەی کە بۆمیان هێشتبووەوە، لافی پزیشکیم لێ دا. کەمێک دواتر کەسێکی قۆڵبڕاویان نیشانم دا، من پێم گوتن نەشتەرگەر نیم. ئەوان تووڕە بوون، خەریک بوو بمدەنە بەشی سەوڵ لێدان، کاپتن کە لەو کاتەدا کتێبەکانمی بینی، پرسیی: داخۆ سەرم لە میز و لێدانی دڵ دەردەچێ؟ بەگوتنی: بەڵێ سەری لێ دەردەکەم، هەم خۆم لە سەوڵ لێدەری پاراست و هەم چەند کتێبێکیشم بۆ ڕزگار کرا.

بەڵام ئەم جیاوازبوونەم لەوانی دی، زۆر گران لەسەرم کەوت. کرستیانەکانی تر کە درابوونە بەشی سەوڵ لێدان، یەکسەر نەفرەتیان لێم کرد. ئەگەر لە دەستیان بهاتایە لەو کۆگایەی کەشتییەکەدا کە شەومان تێدا بەسەر دەبرد، دەیانکوشتم، بەڵام بەزوویی پێوەندی دانانم لەگەڵ تورکەکاندا، ترسی خستبووە بەر کرستیانەکان. کاپتنە ترسنۆکەکەمان کە سەرەوخوار هەڵواسرابوو، ماوەیەکی کەم بەسەر مردنیدا تێ پەڕیبوو. قامچی وەشێنەکان لووت و گوێیان بڕیبوو و بۆ ئەوەی ببێ بەپەند، لە

کەڵەکێکیان بەستبوو و خستبوویانە ئاوی دەریاکەوە. پاش ئەوەی بەبەکارهێنانی هۆشم، نەک زانستی ئەناتۆمی، برینی چەند تورکێکم تیمار کرد و برینەکان لە خۆیانەوە سارێژ بوونەوە، ئیدی هەموویان هاتە سەر ئەو باوەڕەی کە من پزیشکم. تەنانەت چەند دوژمنێکی ئێرەیی پێبەریشم کە بە تورکەکەیان گوتبوو ئەوە پزیشک نییە، شەو لە کۆگاکەدا برینەکانی خۆیان نیشانی من دا.

بەکەژاوەیەکی بە باق و بریقەوە بردراینە ئەستەنبوڵ. سوڵتان کە هێشتا منداڵ بوو، دەگوترا سەیرمان دەکات. بەسەر هەموو ستوونەکانەوە ئاڵایان هەڵواسیبوو، بەلای خواریشەوە، ئاڵا و وێنەی دایە مریەم و خاچەکانی ئێمەیان سەرەوخوار هەڵواسیبوو و مۆڵەتیان بەڕەشە خەڵکەکەش دابوو لە خوارەوە تیربارانیان بکەن. لەو کاتەدا دەنگی تۆپ زەوی و ئاسمانی دەهەژاند. کەژاوەکە کە دواتریێ من لە وشکاییەوە بەغەمگینی و بێزاری و سەرمەستییەوە سەیری بەشی زۆریم کرد، ماوەیەکی درێژی خایاند، کەسانێکی زۆر لەبەر گەرمای هەتاو لە هۆش خۆیان چوون. لەگەڵ سوورایی خۆرنشیندا لە قاسم پاشا لەنگەرمان گرت. بەمەبەستی بردنمان بۆ بەردەم سوڵتان، زنجیر خرایە دەست و پێمان، سەربازەکانیشمان بۆ ئەوەی ببنە مایەی گاڵتە و پێکەنین، زرێپۆشەکانیان بەپێچەوانەوە پێ لەبەر کرا، ئەڵقەی ئاسنینیان کردە ملی کاپتن و ئەفسەرەکان و بە پێ ڕابواردن و شادمانییەوە فوویان بەو کەرەنا و ترامپێتانەدا دەکرد کە لە کەشتییەکەماندا دەستیان بەسەردا گرتبوو و بەدەم گێرانی بەزم و ڕەزمەوە براین بۆ کۆشک. خەڵکی ئەمبەر و ئەوبەری ڕێگاکان بەسەرمەستی و پەرۆشەوە بۆمانیان دەڕوانی. سوڵتان، بێ ئەوەی ئێمە ببینین، بەشە دیلی خۆی هەڵبژارد و جیای کردەوە. دواتر براینە گالەتا و لەوێ فڕێ دراینە زیندانی والی سادق پاشاوە.

گرتووخانەکە شوێنێکی پەڕپووت بوو، سەدان دیل خزێندرابوونە ژووری بچووک و شێدار و داڕووخاوەوە. لەوێ دەستە دەستە مرۆڤم بۆ پەیڕەوکردنی پیشە نوێیەکەم دەدۆزییەوە و زۆربەشیانم چاک کردەوە. ڕەچەتەم بۆ ئەو پاسەوانانە نووسی کە ئازاری پشت و ڕانیان هەبوو. بەمجۆرە، جارێکی تریش منیان لەوانی دی جیاکردەوە و برامە ژوورێک کە تیشکی هەتاو بەباشی دەیگرتەوە. بارودۆخی خۆم

لەگەڵ ئەوانی دیدا بەراورد دەکرد و دەکۆشام سوپاسی خوا بکەم، تا بەیانیانێک منیشان لەگەڵ ئەوانی تر لە خەو هەستاند و گوتیان دەبێ بۆ کار بڕۆم. گوتم پزیشکم و لە نۆشداری و زانست تێ دەگەم، کەچی گاڵتەیان بەقسەکانم هات. دەگوترا دیواری باخچەی والی بەرز دەکرێتەوە و پێویستیان بەکرێکار هەیە. بەیانیان بەر لە خۆر هەڵهاتن، زنجیر دەخرایە دەست و پێمان و دەبراینە دەرەوەی شار. بەدرێژاییی ڕۆژ بەردمان گرد دەکردەوە، لای ئێوارە دیسان زنجیر دەخرایەوە دەست و پێمان و بەپێکەوە گرێدراوی بۆ زیندان دەبردراینەوە. لە ڕێی گەڕانەوەماندا، دەمبینی ئەستەنبوڵ شارێکی دڵگیرە، بەڵام بیرم بۆ ئەوە دەچوو کە دەبێ مرۆڤ لێرە ئەفەندی بێت نەک کۆیلە.

سەرباری ئەوەش، من کۆیلەیەکی ئاسایی نەبووم. ئیدی نەک بەتەنیا هەر بە هانای کۆیلە داڕزاوەکانی زیندانەوە دەچووم، بگرە بەهۆی کارەکەمەوە وەک پزیشک کەسانی تریشم تیمار دەکرد. ناچار دەبووم بەشی زۆری ئەو پووڵەی لە پیشەی پزیشکی دەستم دەکەوت، بدەم بەو پاسەوان و چاودێری کۆیلانەی کە بەدزییەوە مۆڵەتیان دەدام بچمە دەرەوە. ئەو دراوەی لەوانیشم دەدزییەوە، دەمدا بەدەرسی زمانی تورکی. مامۆستاکەم، پیاوێکی باش و بەتەمەن بوو کە بەکارە بچووکەکانی والی ڕادەگەیشت. شادمان دەبوو کە دەیبینی بەخێرایی فێری تورکی دەبم و بەمنی دەگوت لە ماوەیەکی کورتیشدا دەبیت بەموسڵمان. هەموو جارێک بەشپرزەیی کرێی دەرزەکانی لێم وەردەگرت. لەبەرامبەر خۆراکی باشیشدا هەر پارەم دەدایێ، چونکە بڕیارم دابوو ئیدی باش خزمەتی خۆم بکەم.

لە ئێوارەیەکی تەماویدا چاودێر خۆی کرد بەژوورەکەمدا و گوتی والی ئارەزووی بینینت دەکات. سەرم سوڕما، خرۆشام و دەسبەجێ خۆم پۆشتە و تەیار کرد. بیرم چوو بۆ ئەوەی یەکێک لە خزمە دەستڕۆیشتووەکانی نیشتمان، باوکم یاخۆ خەزووری پاشەڕۆژم، سەرانەی ڕزگارکردنی منیان ناردبێ. لەو دەمەیدا کە بەکۆڵانە تەسک و پێچاوپێچ و تاریکەکانی نقومبووی ناو تەمەکەدا ڕێگامان دەبڕی، وامدەزانی ئێستا دەگەینە بەردەم ماڵی خۆمان، یاخۆ وەک ئەوەی لە خەو بێدار ببمەوە، ئەوانم لە پێش خۆمدا دەبینی. جاروباریش خەیاڵم دەچوو بۆ ئەوەی کەسێکیان دۆزیبێتەوە و

ناردبێتیان بۆ ئازادکردنم. پێم وابوو هەر لەو تەمەدا سواری کەشتییەکم دەکەن و دەمنێرنەوە بۆ وڵاتەکەم، بەڵام کاتێک گەیشتینە کۆشکی والی، حاڵی بووم هەروا بەئاسانی ڕزگارم نابێ. خەڵکەکە لە دەرباری والیدا لەسەر پەنجەی پێ ڕێیان دەکرد.

سەرەتا برامە داڵانێک، پاش کەمێک چاوەڕوانی، برامە ژوورێک. مرۆڤێکی بچووک و خوێنشیرین لەسەر تەختێکی بچووک ڕاکشابوو و بەتانییەکی بەسەردا درابوو. کەسێکی کەتە و چوار شانە بەژوور سەریەوە ڕاوەستابوو. کەسە ڕاکشاوەکە والی بوو. منی بانگ کرد بۆ لای خۆی. قسەمان کرد: کەمێک پرسیاری کرد. لە وەڵامدا گوتم: ڕاستییەکەی، من گەردووونناسی، بیرکاری و کەمێک ئەندازیاریم خوێندووە، بەڵام سەرم لە پزیشکیش دەردەچێ و چەندین کەسم چاک کردووەتەوە. ئەو دەیپرسی و منیش هێشتا لە وەڵامدانەوەدا بووم کە گوتی بەو پێیەی هێندە بەخێرایی فێری تورکی بوویت، لەوە دەچێ کەسێکی ژیر بیت. درێژەی دایێ: نەخۆشییەکی هەیە، هیچ کام لە پزیشکەکانی تر بۆیان چارەسەر نەکراوە، ناوی منی بیستووە و دەیەوێ منیش تاقی بکاتەوە.

والی بەشێوەیەک کەوتە باسکردنی دەردەکەی، بەجۆرێک ناچار بووم باوەڕ بهێنم کە دوژمنەکانی ئەو لای خوا زمانیان لێ دابێ و ئەم دەردە لەسەر ڕووی زەوی بەتەنیا تووشی ئەم بووبێ. کەچی نەخۆشیی هەناسەتەنگیی هەبوو کە بەلای هەمووانەوە ناسراوە. زۆر بەباشی پرسیارم لێ کرد و لێی وردبوومەوە. گوێم بۆ کۆکەکەی ڕاگرت، پاشان چوومە خوارەوە بۆ چێشتخانە و لەو شتانەی کەوتنە بەردەستم، دەنکۆڵەی پوونگی سەوزم دروست کرد و شروبێکی کۆکەشم ئامادە کرد. لەبەرئەوەی والی لە ژەهراویکردن دەترسا، قومێکم لە شروبەکە خواردەوە و دانەیەکیشم لە دەنکۆڵەکان قوت دا. پێمی گوت بەوریایی و بێ ئەوەی کەس بمبینێ لە کۆشک بچمە دەرێ و بۆ زیندان بگەڕێمەوە. چاودێر دواتر ڕوونی کردەوە: والی نەیویستووە پزیشکەکانی تر ئێرەییم پێ ببەن. ڕۆژی دواتریش چوومەوە، گوێم بۆ کۆکەکەی ڕاگرت و هەمان دەرمانم پێ دایەوە. هێندەی منداڵێک شادمان بوو بەو دەنکۆڵە سەوزانەی کە لە مستیم نا. دوای ئەوەی بۆ ژوورەکەم دەگەڕامەوە، بۆ

چاکبوونەوەی دەپارامەوە و نزام دەکرد. ڕۆژی دواتر بای شەماڵ هەڵی کرد، هەوایەکی خۆش و نەرم، لەبەر خۆمەوە دەمگوت مرۆڤ ئەگەر نەشخوازێ، بەم هەوایەدا هەر چاک دەبێتەوە، بەڵام کەس نەینارد بەدوامدا.

دوای مانگێک، لە نیوەی شەودا بانگ کرام. والی لەسەر پێ بوو و چوست و چالاک دەینواند. بەخۆشحاڵییەوە گوێم بۆ ڕاگرت کە چۆن بەسانایی و بێ ئەوەی هەناسە بدات، بەدەم جنێودانەوە کەسێکی ئازار داوە. کامەران بوو بە بینینم، گوتی باری نەخۆشییەکەی سووک بووە و بە منیشی گوت کە پزیشکێکی باشم. لێمی پرسی چیم لێی دەوێ؟ من دەمزانی یەکسەر ئازاد و بەڕێم ناکات؛ بۆیە گازندەم لە دەست ژوورەکەم و زنجیرەکانم کرد، گوتم دەتوانم خۆم بەنۆشداری، گەردووناسی و زانستەوە سەرقاڵ بکەم و هاوکاریتان بکەم، بۆم گێڕایەوە کەوا بەخۆڕایی لە کاری گران ماندووم دەکەن. نازانم گوێی لە چەندی قسەکانم گرت و گوێی لە چەندی نەگرت. پاسەوانەکانیش بەشی زۆری ئەو چەردە پارەیەیان لە دەستم دەرهێنا کە والی لە کیسەیەکدا پێمی بەخشی.

دوای هەفتەیەک، چاودێر لە شەودا هاتە ژوورەکەم و پاش ئەوەی سوێندم بۆ خوارد کە هەڵنایەم، زنجیری دەست و پێمی کردەوە. هێشتا هەر دەبرام بۆ کار، بەڵام ئیدی سەرگەورەی دیلەکان هەوڵیان دەدا مەیلم بۆ لای خۆیان ڕابکشێن. کاتێک چاودێر دوای سێ ڕۆژ جلوبەرگی نوێی بۆم هێنا، تێ گەیشتم والی چاوەڕێم دەکات.

شەوانە لە کۆشکەکانەوە دەیاننارد بەدوامدا. ڕۆماتیزمی چەتە پیرەکانی دەریا و سکئێشەی سەربازە لاوەکانم تیمار دەکرد و ئەوانەشی نەخۆشیی خرۆکیان هەبوو، ڕەنگیان پەڕیبوو، یاخۆ سەرئێشەیان هەبوو، خوێنم لێیان دەگرت. جارێکیان شروبێکم دەرخواردی کوڕی یەکێک لە خزمەتکارەکان دا کە قسەی دەبزرکاند، دوای هەفتەیەک زمانی کرایەوە و شیعرێکی بۆم خوێندەوە.

زستان بەوجۆرە بەسەرچوو. لە سەرەتای بەهاردا زانیم والی، کە چەند مانگێک بوو هەواڵی منی نەپرسیبوو، بە ڕەوە کەشتییەکانیەوە بەرو قوڵاییی دەریای سپی بەڕێ کەوتووە. یەک دوو کەس، کە بەدرێژاییی ڕۆژانی گەرمی هاوین ئاگایان لە

خـاکـەسـاری و توورەییی من بوو، پێـمـیـان گـوت تۆ وەک پزیشک داهاتێکی باشت هەیە، بۆیە پێویست ناکات گازندە لە حاڵی خۆت بکەیت. کۆنە کۆیلەیەکیش کە ساڵانێک لەمەوبەر چووبووە سەیر ئاینی ئیسلام و ژنی هێنابوو، ئامۆژگاریی کردم هەڵنەیەم. دەیگوت هەر کۆیلەیەک بەکەڵکی کاری ئەوان بێ، وەک ئەوەی لەگەڵ مندا دەیکەن، هەرگیز ڕێی پێ نادەن بۆ وڵاتی خۆی بگەڕێتەوە. بەقسەی وی، ئەگەر منیش وەک ئەو بچمە سەر ئاینی ئیسلام، ئازاد دەبم و هیچی تر. بیرم لەوە کردەوە ڕەنگە ئەم قسانەی بۆ ئەوە بێ بیەوێ زمانم تاقی بکاتەوە، بۆیە پێم گوت بەهیچ جۆرێک نیازی ڕاکردنم نییە. ڕاستییەکەی، نیاز نا، بگرە زاتم نەبوو. هەڵهاتووان زۆر دوور نەدەکەوتنەوە کە سەرلەنوێ دەستگیر دەکرانەوە. ئەو بەدبەختانە، دوای دارکاریکردن، فڕێ دەدرانە ژوورەکانیانەوە. من شەوان دەچوومە کنیان و هەتوانم لە برینەکانیان دەدا.

لەگەڵ نزیکبوونەوەی پایزدا والی لە گەشتی دەریا گەڕایەوە و بە ئاگری تۆپ پێشوازیی لێ کرا. ویستی وەک ساڵی ڕابردوو کەیف و سەفا بۆ شار بسازێنێ، بەڵام ڕوون و ئاشکرا دیار بوو ئەو وەرزی جەنگەی بە باشی بەسەر نەبردووە. توانیبوویان ژمارەیەکی کەمیش دیل بۆ زیندان بهێنن. دواتر زانیمان: ڤینیسایییەکان شەش گەمیی والیان سووتاندبوو. بەخۆم گوت دەبێ ڕێیەک بدۆزمەوە و لەگەڵ دیلەکاندا بکەومە قسە بۆ ئەوەی بەڵکو هەواڵێکی نیشتمان بزانم. زۆربەیان ئیسپانی بوون: شتگەلێکی بێدەنگ، نەزان و ترسنۆک بوون، داوای یارمەتی و پاڕانەوە بۆ خواردن نەبێ، تاقەتیان نەبوو باسی هیچ شتێکی تر بکەن. تەنیا دانەکیان سەرنجی منی ڕاکێشا: ئەمیان قۆڵی پەڕیبوو، بەڵام بەئومێد بوو. دەیگوت هەمان ڕووداو بەسەر یەکێک لە باپیرەکانیشیدا هاتووە، پاشان ڕزگاری بووە و بەقۆڵە نەپەڕیوەکەی ڕۆمانێکی سوارچاکیی نووسیوە. خۆیشی باوەڕی وابوو بۆ ئەوەی هەمان شت بکات، ڕزگاری دەبێ. دواترێ و لە ساڵانێکدا کە لەپێناوی ژیاندا چیرۆکم دەخوڵقاند، ئەو پیاوەم بیرکەوتەوە کە لەپێناوی چیرۆک خوڵقاندندا بیری لە ژیان دەکردەوە. هێندەی نەبرد پەتایەکی کوشندە بەزینداندا تەشەنەی کرد، ئەو پەتا چاوەڕوان نەکراوە کە بە نقومکردنی پاسەوانەکان لە بەرتیلدا خۆم لێی پاراست،

دوای ئەوەی نیوەی کۆیلەکانی کوشت، ڕۆیشت و بڕایەوە.

دەستیان کرد بەناردنی ڕزگاربووەکان بۆ سەر کاری نوێ. من نەدەچووم. ئێواران دەیانگوت تا ئەوپەڕی کەنداوی زێڕینی ئەستەنبوڵ دەڕۆن، لەوێ دەخرێنە ژێر فەرمانی وەستایانی دارتاش، بەرگدروو و بۆیەچییەکان و کاری بەردەستییان پێ دەکەن بۆ دروستکردنی کەشتیی و قەڵا و قوللە لە کارتۆن. دواتر زانیمان والی، کچی باشوەزیر بۆ کوڕەکەی دێنێ و بەنیازە زەماوەندێکی بەباق و بریق ساز بکات.

بەیانییەک لە کۆشکی والییەوە بانگ کرام. بەدەم بیرکردنەوە لەوەی کە دیسان هەناسەتەنگییەکەی سەری لێ هەڵداوەتەوە، کەوتمە ڕێ. والی سەری قاڵ بوو، پێم گوترا دەبێ چاوەڕێ بکەم. لە ژوورێک دانیشتم. پاش کەمێک دەرگاکەی تری ژوورەکە کرایەوە، یەکێکی پێنج شەش ساڵ لە خۆم بەتەمەنتر هاتە ژوورەوە. بە بینینی ڕووخساری سەرم سوڕما، لەپڕ ترسم لێ نیشت!

## 2

ئەوەی هاتە ژوورەوە، تا ڕادەی باوەڕ پێ نەکردن لە خۆم دەچوو. کتومت وەک ئەوەی خۆم لە وێدا بم! ئەوە یەکەم سەرنجم بوو. وەک بڵێی کەسێک گەمەم لە تەکدا بکات و لە دەرگای بەرامبەر ئەو دەرگایەوەی لێی هاتبوومە ژوورێ، جارێکی تر بمکاتە ژوورێ و بڵێ: بڕوانە، لە ڕاستیدا دەبوو تۆ ئاوەها بوویتایە، پێویست بوو بەو جۆرە لە دەرگاکەوە بێیتە ژوورەوە، دەبوو دەست و باسکت بەو جۆرە بجووڵێنی، پێویست بوو بەمشێوەیە سەیری ئەوی دیی دانیشتووی ناو ژوورەکەت بکردایە! کاتێک نیگای چاومان چووە سەریەک، سڵاومان لە یەکدی کرد. بەڵام وێ نەدەچوو ئەو زۆر سەری سوڕمابێ. لەو کاتەدا هاتمە سەر باوەڕێک کە هێندەش لە من ناچێ. ئەو ڕیشی هەبوو، منیش وام بە خەیاڵدا هات لەمێژ بێ شێوەی ڕووخساری خۆم لە بیر چووبێ. کاتێک ئەو لە بەرامبەرم دانیشت، بیرم کەوتەوە ساڵێکە سەیری ئاوێنەم نەکردووە.

ئەو دەرگایەی منی لێوە هاتبووم بەمدیودا، دوای کەمێک کرایەوە و ئەویان بانگ کردە ژوورێ. لە میانەی چاوەڕێکردنمدا وای بۆچووم ئەوەی دەبینیم، گەمەیەکی کارا نییە، بگرە زادەی هۆشی شێواوی خۆمە. ئەو ڕۆژانە لەسەریەک داڵغەم لێ دەدا، خەونی دڵخۆشکەری وەک ئەوەی ئازاد دەکرام و بۆ ماڵ دەگەڕامەوە و هەمووان لە پێشوازیمدا بوون، یاخۆ هێشتا لە کابینەکەی خۆم لە کەشتییەکەدا نووستبوم، دەبینی. بیرم کردەوە ئەم ڕووداوەش یەکێک بێ لەو داستانانە و بەدی هاتبێ، یاخۆ نیشانەیەک بێ بۆ گەڕانەوەی هەموو شتێک بۆ دۆخی جاران. لەو ساتەدا دەرگاکە کرایە و بانگ کرامە ژوورەوە.

والی کـەمێک لەولای هـاوشـێـوەکـەمـەوە بەپێـوە ڕاوەسـتـابوو. ڕێی پێم دا دامـێنی کەواکەی مـا چ بکەم و لە هـەواڵـی پرسـی. ئارەزووم دەکرد بێزاریم لـە ژوورەکەی خۆم و ویسـتـی گـەڕانەوەم بۆ نیـشـتـمـانیی بـۆ باس بکەم، کـەچـی ئەو هـەر گـوێشـی لێم نەگـرت. بیـری کـەوتبـووەوە کـە پێم گـوتووە سـەرم لـە زانست، گـەردووناسـی و ئەندازیاری دەردەچێ، ئێـسـتـا لێـمی پرسـی داخـۆ شـارەزاییم لە بارووت و ئەو فیشەکانە هەیە کە بۆ ئاسمان هەڵدەدرێن؟ یەکسـەر گوتم سەری لێ دەردەکەم، بەڵام کاتێک نیگام کـەوتە سـەر ڕووخسـاری کەسـەکەی تر، گـومـانی ئەوەم کـەوتە دڵەوە ئەمانە تەڵەیەکم بۆ بنێنەوە.

والی دەیگوت کـە زەمـاوەندەکـەیان بێ وێنە دەبێ. بەنیـازیش بوو دەسـتـوور بدا نمایشـی فـیـشـەک هـەڵدان سـاز بکرێ، بەڵام نمـایشـێکی ئەوتۆ لە هیـچ ڕوویەکـەوە لەوانی ڕابردوو نەچێ. هاوشـێـوەکـەم کـە والی تـەنیـا بـە (خـۆجـە) نـاوی دەبرد، لە ڕابردوودا لەگەڵ ئاگربازێکی ماڵتایی، کە ماوەیەک پێشتر مردبوو، لە ئامادەکردنی نمایشـی جـەژنی لەدایکبـوونی سولّتاندا کـاری کـردبوو، کـەمێک سـەری لەو کـارە دەرچوو. والی بیـری کردبووەوە لەوانـەیە منیش بتـوانم هاوکاریی بکەم و پێی وابوو تەواوکەری یەکترین! ئەگەر نمایشێکی باشیش ئامادە بکەین، ئەوا بە خەڵاتکردنمان کامـەرانمان دەکات. لە دڵی خۆمدا گوتم کاتی هاتووە و لەوەدا بوو تکا لە والی بکەم مۆڵەتم بدات بۆ نیشتمـان بگەڕێمـەوە، ئەو پێش من کەوت و لێمی پرسی داخۆ لەو کاتەوەی هێنراومەتە ئێرە، لەگەڵ ژناندا نووستووم یاخـۆ نا؟ بەدوای زانینی وەڵامی من، گوتی ئەگەر ئـەو کارە نەکەی، ئیدی ئازادی بەکەڵکی چی دێ. لەو باسە هەمـان ئەو وشـانـەی بەکـار دەهێنا کـە بەسـەر زاری پاسـەوانەکـانەوە بوون. منیش دەبوو گـێژوویژ سـەیری دەم و لەوچـی بکەم، لەپڕ قـاقـایـەکی بەرزی لێـدا . دوایی ڕووی لەو هاوشێوەکەم کرد کە بە (خۆجە) بانگی کردبوو و پێی گوت : "ئیدی لێپرسراویی ئەم کابرایە لە ئەستۆی تۆدایە." هاتینە دەرەوە.

دەمـەوبەیانی لە ڕێگەی گـەڕانەوەمـان بۆ مـاڵـی هاوشـێـوەکـەم، بیـرم کـردەوە هیـچ شتێکم نییە فێری ئەوی بکەم. بەڵام زانستی ئەویش لەوی من زیاتر نەبوو. سەرباری ئەوەش، زانیـارییـەکانـی هەردووکمـان یەکیـان دەگرت: هـەمـوو گرفـتمـان چۆنیـەتیی

بەدەستهێنانی تێکەڵەیەکی کافووری بوو. ئەوەی دەبوو بۆ ئەو مەبەستە بیکەین، ئامادەکردنی تێکەڵەیەک بوو کە بەتەرازوو و پێوانە دەمانکێشا و شەوانە لە بن دیوارەکانی شورای شاردا گڕمان تێ بەردەدا و لەوەی دەمانبینی، ئەنجاممان وەرگیردەخست. لە کاتێکدا دەستوورمان بە پیاوەکانمان دەدا بە بەرچاوی ئەو منداڵانەوە، کە بە واقوڕمانەوە سەیری ئێمەیان دەکرد، ئاگر لە فیشکە ئامادەکراوەکانمان بەردەن، ئێمە، وەک ئەوەی ڕۆژانێکی زۆر دواتری ئەو ڕۆژگارە لەبەر تیشکی هەتاودا بۆ دروستکردنی چەکێکی لە ئەقڵ بەدەر کارمان دەکرد، دەچووینە ژێر دارە تاریکەکانەوە و بە جۆش و خرۆشەوە چاوەڕێی ئەنجاممان دەکرد. دواتر، من جاروبار لەبەر تیشکی مانگ و هەندێک جاریش لە تاریکاییی ئەنگوستەچاودا دەکۆشام ئەوەی دەیبینم لە دەفتەرێکی بچووکدا تۆماری بکەم. شەوانیش، بەرلەوەی لە یەکدی جیا ببینەوە، دەچووینەوە بۆ ماڵەکەی خۆجە کە بەسەر کەنداوی زێڕیندا دەیڕوانی و بە دوورودرێژی لەبارەی ئەنجامەکانەوە دەدواین.

ماڵەکەی بچووک، ژار و ناحەز بوو. ڕێی ماڵەکە کەوتبووە سەر کۆڵانێکی پێچاوپێچ. ئاوێکی قرێژ، کە هەرگیز نەمتوانی بزانم لە کوێوە سەرچاوە دەگرێ، کۆڵانەکەی کردبوو بەقوڕ و لیتە. هیچ کەلوپەلێک لە ماڵەکەدا نەبوو و لە هەموو چوونە ژوورەوەیەکمدا دڵم دەگیرا و بێزار دەبووم. پێم وابێ سەرچاوەی ئەم هەستەم دەگەڕایەوە سەر ویستی ئەو پیاوە کە داوای لێم دەکرد بە (خۆجە) بانگی بکەم، چونکە حەزی لەو ناوەی خۆی نەبوو کە لە باپیریەوە بۆی بەجێ مابوو. چاودێریی منی دەکرد، وا دەهاتە بەرچاو وەک ئەوەی بیەوێ شتێکم لێوە فێر بێ، بەڵام لەو کاتەدا نەیدەزانی ئەو شتە چییە. بەهۆی ئەوەی نەمدەتوانی خۆم لەسەر دانیشتن لەپاڵ ئەو سەرینانەدا ڕابهێنم کە بەبن دیوارەکەوە ڕیزی کردبوون، لە کاتی هەڵسەنگاندنی ئەنجامی تاقیکردنەوەکاندا من بەپێوە ڕادەوەستام، جاروباریش بەتوڕەیی ئەمسەر و ئەوسەری ژوورەکەم دەپێوا. وا بزانم خۆجە حەزی لەم ڕەفتارەم دەکرد. ئەو دادەنیشت. بەوجۆرە، تەنانەت ئەگەر لەبەر ڕۆشنایی لاوازی چرایەکیشدا بووایە، تێروپڕ سەیری منی دەکرد. نیگاکانی و هەستنەکردنی

بەلێکچوونی نێوانمان، منی نیگەران دەکرد. یەک دوو جار وای بۆچووم پەیی بە لێکچوونی نێوانمان بردبێ، بەڵام خۆی وا نیشان دەدات وەک ئەوەی هەستی پێ نەکردبێ. بەجۆری ئەوەی بیەوێ گەمەم لەتەکدا بکات، دەیخستمە بەردەم تاقیکردنەوەیەکی بچووک و هەندێ زانیاری، کە بۆ من ڕوون نەبوو، وەگیردەخست. ڕۆژانی سەرەتا بەردەوام بەوجۆرە بۆی دەڕوانیم: وەک ئەوەی شتێک فێر بێ و لەگەڵ فێربوونیشدا زیاتر ماخۆلانی پێ کەوتبێ. بەڵام وا دیاربوو بەگومان بوو لە هەنگاو هاویشتن بەرەو قووڵکردنەوەی ئەو زانستە سەیرە. ئا ئەم دابڕانە بوو ماڵەکەی لە خۆیدا نقوم دەکرد و منیشی دڵتەنگ دەکرد! ئەگەرچی شەرمنییەکەی ئەو بوێریی بە من دەبەخشی، بەڵام سەبووریی نەدەدامەوە. جارێکیان لە کاتی قسەکردندا دەربارەی تاقیکردنەوەکانمان، دووبارە لێمی پرسییەوە بۆچی هێشتا نەبووم بەموسڵمان. کاتێک حاڵی بووم دەیەوێ بۆ ناو گفتوگۆیەکی نائاشکرادا بەکێشم بکات، بێدەنگ بووم و دانم بە خۆمدا گرت. هەستی بە نیگەرانبوونم کرد. تێ گەیشتم کە بە چاوی سووک تەماشام دەکات و ڕکی لێم دەبێتەوە، ئەمەش تووڕەی دەکردم. تەنیا شتێک کە هەردووکمان لەو ڕۆژانەدا لەسەری کۆک بووین: نەفرەتکردنی هەردووکمان بوو لە یەکتر. دانم بە خۆمدا دەگرت و لە دڵی خۆمدا دەمگوت با ئەم نمایشی ئاگربازییە بێ قەزا و بەڵا ساز بکرێ بۆ ئەوەی بەڵکو مۆڵەتم پێ بدرێ بگەڕێمەوە وڵاتی خۆم.

شەوێکیان، خۆجە بەجۆشی سەرکەوتنی هەڵدانی فیشەکێکەوە بۆ بەرزاییەکی پێوانەیی، گوتی: ڕۆژێک دێ فیشەکێک دروست بکەم کە تەنانەت بگاتە مانگیش، بەڵام تەنیا گرفت دۆزینەوەی تێکەڵەی پێویستی باروت و لە قاڵبدانی کۆگایەک بوو بۆ گواستنەوەی ئەو تێکەڵەیە. پێم گوت مانگ زۆر دوورە، کەچی قسەکەی پێم بڕی. ئەویش دەیزانی مانگ لە ئێمەوە زۆر دوورە، بەڵام دەیگوت مەگەر نزیکترین ئەستێرە نییە لە زەوییەوە؟ کاتێک بۆچوونەکەیم سەلماند، پێم وابوو ئارام دەبێتەوە، کەچی زیاتر ئۆقرەی لێ بڕا، بەڵام هیچ شتێکی تری نەگوت.

دوای دوو ڕۆژ، لە نیوەشەوێکدا پرسی: چۆن توانیومە هێندە دڵنیا بم لەوەی کە مانگ نزیکترین ئەستێرەیە لە زەوییەوە؟ پێی وابوو هەردووکمان تووشی هەڵەی

بینین بووبین. لەو کاتەدا بۆ یەکەمجار باسی ئەو دەرزانەی گەردووونناسیم بۆ کرد کە پێشتر فێریان بووبووم و بەکورتی باسی ڕێسا بنەڕەتییەکانی پەتلیمۆسم دەربارەی کۆسمۆگرافی بۆ کرد. چاوم پێوەبوو بە پەرۆشەوە گوێی بۆم ڕاگرتبوو، بەڵام بۆ شاردنەوەی پەرۆشییەکەی، خۆی لە قسەکردن دەدزییەوە. کەمێک دواتر و دوای بێدەنگبوونی من، گوتی کە ئەویش زانیاریی لە بارەی پەتلیموسەوە هەیە، بەڵام ئەمە هیچ لەو گومانانەی کەم ناکاتەوە کە ئەستێرەیەکی نزیکتر لە مانگ لە دەوری زەویدا هەیە. تا دەمەوبەیانی سەبارەت بەو ئەستێرەیە و نیشانەکانی هەبوونی، وەک ئەوەی لە ئێستاوە دۆزیبێتیەوە، دوا.

ڕۆژی دواتر، کتێبێکی دایە دەستم کە بە دەستنووسێکی خراپ نووسرابووەوە. سەرباری تورکییە ناتەواوەکەم، زانیم باسی چ دەکات: خودی ئالماگاست نا، بگرە دووەم پوختەی دەرهێندراوی کورتکراوەیەکی تری بوو. ئەوەی بەلای منەوە مایەی سەرنج بوو، ناوی هەسارەکان بوو بە عەرەبی، بەڵام لەوە نەدەچوو لەو ساتەدا ئەوەشم بەلاوە گرینگ بووبێ. خۆجە کە بینی کتێبەکە سەرنجمی ڕانەکێشا و لە گۆشەیەکدا دامنا، تورە بوو. ئەو دەستنووسەی بەحەوت زێڕ کڕیبوو. بەڕای ئەو، ڕاستتر وابوو دەستبەرداری لووتبەرزیی خۆم بوومایە و لاپەڕەکانیم هەڵدایەتەوە و چاوێکم پێیاندا بگێڕایە. کاتێک وەک قوتابییەکی زیرەک سەرلەنوێ و بە ئارامی لاپەڕەکانی کتێبەکەم ئەمدیو و ئەودیو کرد، نیگام کەوتە سەر هێڵکارییەکی سەرەتایی. هەسارەکان بەهێڵی سادە و بەپێی دوورییان لە زەوییەوە کێشرابوون و لە خولگەکاندا جێگیر کرابوون. گەرچی شوێنی خولگەکان ڕاست بوون، بەڵام نیگارکێش هیچ بیرۆکەیەکی دەربارەی مەوداکانی نێوانیان نەبووە. دواتر، لە نێوان مانگ و زەویدا هەسارەیەکی بچووکم بەرچاو کەوت؛ بە کەمێک سەرنج لێدانەوە و بە تازەیی مەرەکەبەکەدا دیار بوو کە دواتر بۆ دەستنووسەکە زیاد کراوە. دوای ئەمدیو و ئەودیوکردنی دەستنووسەکە تا کۆتایی، دامەوە بە خۆجە. پێمی گوت کەوا سوورە لەسەر دۆزینەوەی ئەو ئەستێرەیە. هیچ لەوەش نەدەچوو گاڵتە و شتی لەو جۆرە بکات. من هیچم نەگوت. بێدەنگییەک هاتە ئاراوە کە هێندەی من بۆ ئەویش سامناک بوو. لەبەرئەوەی هیچ فیشەکێکی ترمان نەگەیاندە ئاستێکی هێندە بەرز کە قسە

بێنێتـەوە سـەر گـەردوونناسـی، ئیـدی جـارێکی تر ئەو بابەتەمـان نەکـردەوە. ئەو سەرکەوتنە بچووکەمان وەک ڕێکەوتێک مایەوە کە نهێنییەکەیمان بۆ ئاشکرا نەبوو.

بەڵام ئەنجامی باشـمان لە بواری ڕووناکی و تینی ئاگر و درەوشـانەوەدا بەدەست هێنا و ئیـدی نهێنیی سـەرکەوتنەکەشـمان دەزانی. خـۆجـە بە یەکبـەیەکی دوکانی عـەتارفـرۆشـیـیـەکانی ئەسـتـەنبـوڵدا دەسووڕایەوە. لە یـەکێکیـاندا، بێ ئەوەی ناوی خاوەن دوکانەکە بزانێ، تۆزێکی دۆزیبووەوە. ئەم تۆزە زەردباوە کە درەوشانەوەیەکی بێ وێنەی هـەبوو، گوتمان هـەبێ و نەبێ تێکەڵەیەکە لـە گۆگـرد و سـولفـات. دواتر و بەمـەبەسـتی ڕەنگ بەخشـین بـە درەوشـانەوەکە، هـەرچیـمـان بە خـەیاڵدا هـات لەگـەڵ تۆزەکە تێکـەڵمـان کـرد، بەڵام جگە لە ڕەنگی قـاوەیی و سـەوزێکی کـاڵی لە یەکچـوو، هیچ ئەنجامێکی ترمان دەسـتگیر نەبوو. بـە قسـەی خـۆجە، ئەوەی ئێمە کردبوومان، تا ئەو ساتە باشترین شتێک بوو کە لە ئەستەنبوڵدا کرابێ.

نمایشـی شـەوی دووەمی زەمـاوەندەکـەش هەروا بوو، هـەمـووان هەمـان شـتـیـان دەگوتەوە، تەنانـەت دوژمنەکانیشـمان کە لـە پشتەملە تەپکە و داویـان بۆمان دەنایەوە و دەیانویست پیـشـەکـەمـان لێ بدزن. کـاتێک گـوتیـان سـوڵتـان بۆ سـەیرکـردنمان لەوبەری کـەنداوی زێڕینـەوە دێتـە لامـان، من زۆر پەشـۆکـام. زراوم لەوە تۆقـیـبـوو هەڵەیەک ڕووبدات و تا چەندین سـاڵی تر نەتوانم بۆ وڵاتـەکـەم بگەڕێمـەوە. لەگـەڵ ڕاگـەیاندنی فـەرمـانی دەست بـە کـاربووندا، من تکا و نزای زۆرم کـرد. بۆ بەخێرهێنانی میوانەکان و خۆ ئامادەکردن بۆ نمایش، سەرەتا فیشەکی بێ ڕەنگمان گڕ دا. یەکسـەر بەدوای ئەوەدا بەشێوەیەک، کە من و خـۆجە ناومان لێ نابوو (ئاش)، جـێـمـان گـرت. ئاسـمـان لەپڕ ڕەنگی سـوور و زەرد و سـەوزی گـرت، ناڵەیـەکی ترسـناکـیـشی هەبـوو و زۆر جـوانـتـریش بـوو لەوەی کـە پێـشـبـینیـمـان کـردبوو. فیشـەکـەکان لەگەڵ هـەڵدانیـان، بە دەوری خۆیاندا دەخـولانەوە و دەخولانەوە، پاشـان لەپڕ دەوەسـتان و دەوروبەری خـۆیان وەک ڕۆژ ڕووناک دەکردەوە. بۆ ساتێک هەسـتم کـرد لە ڤینیسـیام. تەمـەنم هەشت سـاڵان بوو، جاری یەکـەمم بوو بچـمـە سـەیری نمایشـێکی لەوجـۆرە و وەک ئێسـتـا ناشـاد بووم، چونکە جلە سـوور و تازەکـەمیـان لەبەر خـۆم نـەکـردبوو، بگرە کـردبوویـانە بەر برا گـەورەکـەم کـە ڕۆژێک پێـشـتـر لە

شـەڕێکدا جلوبەرگـەکـانی دڕابوو. فیـشـەکەکـان هەمـان درەوشـانەوەی سـووری لە جۆری جلوبەرگە پڕ لە کوژەکەکانی منیان هەبوو، ئەو جلوبەرگەی کە ئەو شەوە بۆم نەبوو بیـپـۆشم و سـوێندیشم خـواردبوو کـە ببـڕای ببـڕ لەبەری نەکـەم، ڕەنگی قۆپچەکانیش لە هەمان ڕەنگی جلەکان بوو، کە کەمێک بە بەری کاکم تەنگ بوو.

پاشـان دەسـتـمـان بە جـوولەیـەکی تر کـرد بە (کـانی) ناومـان دەبرد. لە دەلاقـەی تاقـێکەوە بە بـەرزاییی بـالاًی پێنج پیـاو دەست کـرا بـە ڕژاندنـی گـڕی ئـاگـر. بە دڵنیاییەوە، خـەڵکانی کەناری ئەوبەر گڕ و بلێسـەی ئاگرەکەیان زۆر باشتر بینیوە. دەبێ لەگەڵ دەرپەڕینی فیشەکدا لە دەمی تاقەکەوە هێندەی ئێمە بە خـرۆش کەوتبن، بەنیـازیش نەبووین لە جۆش و خـرۆشـیـان کـەم بکەینەوە. کەڵـەکەکانی ناو کـەنداوی زێڕین دەسـتیـان بە جووڵە کرد. سـەرەتا، قـووللە و قـەلاّ لە کارتـۆن دروستکراوەکـان، کـە لە بورجـەکـانیـانەوە فیـشـەک دەردەپەڕی، گڕیان گرت و بـەسـەر یەکدا ڕووخـان. ئەمانـە نمایشکردنی سەرکـەوتنەکانی سـالانی ڕابردوو بوون! کاتێک نۆرە هاتـە سەر تێپەڕینی کـەشتییەکانی سـاڵی بە دیل گرتنی من، کەشتییە چارۆکەییەکـەی ئێمە لە لایەن ئەوانی ترەوە درایە بەر دەشـتـرێژی فیشـەک. بەمـجۆرە من جـارێکی تر هـەمـان ڕۆژی بە دیل گـرتنم ژیامـەوە. بینەرانی کەنارەکـانی ئەمـبەر و ئـەوبەر لەگەڵ سـوتانی کەشـتییەکان و نقومبـوونیاندا هاواریان دەکرد: "الله، الله!" دواتر هێدی هێدی نۆرە هاتـە سـەر ئـەژدیهـاکـانمان. لە کـونی لووت و لـە دەم و لە گـوێیـانەوە گـڕی ئاگـر دەردەچوو. دامانن بە شەڕدا. بەپێی نەخشـەیەک کە پێشتـر دامانـنابوو، سەرەتا هیچ کامیـان نەیدەتوانی بەسـەر ئەوانی تردا زاڵ بێ. بەو فیشـەکانەی لە کەنارەوە هەڵمان دا، هێندەی دی هـەوامـان گـەرم کـرد. دواتـر کـە ئاسـمـان کـەمـێک تاریک بوو، پیـاوەکانمـان لە کەڵەکەکانی خـۆیانەوە چەرخـەکانیـان خسـتـە کـار و هـێدی هێدی دەسـتـیـان کرد بـە بەرزکردنەوەی ئەژدیهـاکـان بۆ ئاسـمـان. خـەڵکەکە، ئیـدی لەبەر سەرسـوڕمان و لە ترسان هات و هـاواریان بوو. کـاتێک ئەژدیهاکـان بە ناڵە و دەنگی بەرزەوە کەوتنە گیانی یەکدی، بەجـارێک هەموو فیـشـەکی ناو کەڵەکەکان گڕ دران. ئەو مــەشــخــەڵانەی لـە ناو جــەســتــەی بـوونەوەرە دەســتکردەکــانی خــۆمــاندا شــاردبوومــانەوە، دەبوو لـە ســاتێکدا گـڕیـان بگرتـایە، بـەجـۆرێک وەک خـۆمــان

نەخشـەمـان بۆ داڕشـتبـوو، هەمـوو ئەو ناوەیان بکردایە بە دۆزەخ. کاتێک گـوێم لە منداڵێک بوو کە لە نزیکمانەوە زۆڕەزۆڕ دەگریا، لە سـەرکەوتنی خۆمان حاڵی بووم. باوکەکە، کوڕەکەی خۆی لە بیر کردبوو و بە دەمی داچەقیـوەوە سـەیری ئاسـمـانی سامـناکی دەکرد. خـەیاڵم چوو بۆ ئەوەی ئیدی بۆ زێدی خـۆم دەگەڕێمـەوە. لە ناو ئەو دۆزەخـەی باسم کـرد، پەیکەرێک کە مـن ناوم لێ نابوو (ئـیبلـیس)، بێ ئەوەی کـەس چاوی پێـوە بێ، چووە ژێر کـەڵەکـێکی ڕەش و بچـووکەوە. ئەوەنـدەمـان فـیشـەک لێ بارکـردبوو، بەجـۆرێک ترسـی ئـەوەمـان هـەبوو هـەمـوو کـەڵەکـەکـە بە پیـاوەکـانی سـەریشـیـەوە بە ئـاسـمـاندا ببـات، بەڵام کارەکان بەباشـی چوونە پێش. دوای ئەوەی بڵێسـەی ئاگری ئەژدیها بەشـەڕهاتووەکان کوژایەوە و دیار نەما، ئیبلیسـەکە لـەگەڵ فـیشـەکانیـدا، کە لەپڕ گڕی گرت، بۆ ئاسـمـان دەرپەڕی. پاشـان بەهـەمـوو جـەسـتـەی خۆیەوە لە ئاسمان بە تەرەقەکانی ناویەوە تەقییەوە و بەهـەر چوار لادا تۆپەڵی ئاگری پەخش کرد. بـۆ چرکەیەک پەشـۆکام و هـەسـتم کرد هـەمـوو ئـەسـتـەنبـوڵمـان نوقمی تۆقین و ترس کردووە. وەک بڵـێی خـۆیشـم ترسـاندبێ، جـۆری ئـەوەی بوێرانە دەسـتم کردبێ بەو شتانەی دەمـویست لە ژیاندا بیانکەم، وێنەی ئەوەی لەو ساتەدا هیچ باکم نەبێ کـە لە چ شـارێکدام، ئـارەزووم دەکرد ئیبلیسـەکـە بەدرێژاییی شـەو، لەوێ، بە هەڵواسراوی بە ئاسمانەوە گڕ و ئاگری بەسـەر ئامادەبوواندا بڕژاندایە. کەچی دوای کـەمـێک لەرینـەوە بەلای ڕاست و چەپدا و بێ ئەوەی زیـان بە کـەس بگـەیەنێ، هـاوڕێ لەگـەڵ هـاواری خـۆشـی و جـۆشـی بینـەرانی هـەردوو کـەناردا کـەوتـە ئاوی کـەنداوی زێڕینەوە. لە کاتی نغرۆبوونیشی لە ئاوەکەدا، هێشتا گڕی لێ هەڵدەستا.

ڕۆژی دواتر، والی، کتومت وەک ئەوەی لە ئەفسانەکاندا دەگێڕدرێتـەوە، بە خۆجەدا کیسـەیەک زێڕی ناردبوو. گـوتبـووی زۆر ڕازی بووە لە نمایشـەکە، بەڵام گلـەییی لە سـەرکـەوتنی ئیبلیس هـەیە. مـاوەی دە ڕۆژی تریش درێژەمان بە نمایشەکەمان دا. بە ڕۆژ قاڵبەکانمان دادەڕشتەوە، نەخشـەمان بۆ گەمەی نوێ دادەڕشت و بەو دیلانەی لە زیندانەکانەوە هێندرابوون، فیشـەکمان دادەگرتەوە. دیلێک، کە دە توورەکە باڕووتی گڕ دا، دەموچاوی سووتا و کوێر بوو.

لەدوای تەواوبـوونی بەزمی زەمـاوەند، ئیـدی خـۆجـەم نەدەبینـی. ئاسـوودە بووم بە

ڕزگاربوونم لە چاوە پڕ لە ئێرەییەکانی ئەو پیاوە بەپەرۆشەی کە لە گزنگی بەیانەوە تا خۆرنشین چاودێریی منی دەکرد، بەڵام درۆیە ئەگەر بڵێم هۆشم بەلای ئەو ڕۆژە پڕ لە جوولە و بزاوتانەوە نەبوو کە لەگەڵ ئەودا بەسەرم بردبوون. ئەگەر گەڕابامەوە وڵاتی خۆم، باسی ئەم پیاوەم کە سەرباری ئەو هەموو لێکچوونەی نێوانمان تەنانەت وشەیەکیشی لەو بارەیەوە نەدەدرکاند، بۆ هەمووان دەگێڕایەوە. لە ژوورەکەی خۆم دادەنیشتم و بۆ بەسەربردنی کات نەخۆشەکانم دەپشکنی. کاتێک بیستم والی لە دووەمی ناردووە، بە هەستێکی پڕ لە جۆش و شادی و بە پەلەپرووزێ ڕۆیشتم. سەرەتا بەپەلە زۆر بە شان و باڵی منیدا هەڵدا. پاشان گوتی کە هەمووان لە نمایشی ئاگربازییەکە ڕازی بوون، گوایە من زۆر بەهرەمەندم و شتی تری لەو جۆرەی گوت. دواتریش لەپڕ گوتی: "ئەگەر ببی بە موسڵمان، ئەوا لە جێدا ئازادت دەکەم." سەرم سوڕما، گێژ و وێژ بووم، گوتم دەمەوێ بۆ وڵاتی خۆم بگەڕێمەوە، بەدەم گێژبوونەوە زمانم تەتەڵەی کرد و بە ناوهێنانی دایکم و مارەبڕەکەم جۆرێک لە بچووکیم نواند. والی وەک ئەوەی هیچ گوێی لە من نەبووبێ، دیسان هەمان شتی دووبارە کردەوە. کەمێک بێدەنگ بووم. نازانم بۆچی لەو کاتەدا ئەو هاوڕێ تەمەڵ و شووم و نەفرەت لێکراوانەی سەردەمی منداڵیم بیرکەوتەوە کە دەستیان لە باوکانی خۆیان بەرز دەکردەوە. دوای ئەوەی گوتم ئامادە نیم ئاینی خۆم بگۆڕم، والی لێم چوو بە قیندا. گەڕامەوە ژوورەکەی خۆم لە زیندان.

دوای سێ ڕۆژ، والی جارێکی تر ناردیەوە بەدوامدا. ئەمجارە کەیفی ساز بوو. لەبەرئەوەی بۆم یەکلایی نەکرابووەوە داخۆ ئاین گۆڕینم هەلی ڕاکردنم بۆ دەخوڵقێنێ یاخۆ نا، نەمتوانیبوو لەو بارەیەوە بڕیاری کۆتایی بدەم. والی لە بۆچوونی منی پرسی، دەیگوت لێرە بە دەستەکانی خۆی کچێکی جوانکیلەم لێ مارە دەکات! تاوێک ئازاییی بە گیانمدا گەڕا و گوتم من ئاینی خۆم ناگۆڕم. والی کەمێک سەری سوڕما، پاشان پێمی گوت کە گەوج و دەبەنگم. پێی وابوو کەسانێکی ئەوتۆ لە دەوروبەرەکەمدا نییە کە دوای ئاین گۆڕین ڕووم نەیەت سەیری رووخساریان بکەم! دواتر کەمێک باسی ئیسلامی کرد. من بێدەنگیم هەڵبژارد، ئەویش دەستووری دا بۆ ژوورەکەم بەڕێ بکرێمەوە.

له سـێیـەمـین ڕۆیشـتنمـدا نەیانبـردمـە بەردەم والی. چاودێرێک لە بڕیاری منی پرسی. لەوانەبوو بڕیاری خـۆم بگۆڕم، بەڵام نەک لـە وەڵامی پرسـیاری چاودێرێکدا! گوتم لەم کاتەدا ئامادە نیم بۆ گۆڕینی ئاین. چاودێر قۆڵمی گرت و بردمیە خوارەوە و ڕادەستی کەسێکی تری کردم. ئەمیان پیاوێکی باڵابەرز و درێژکۆڵەی لەو بابەتە بوو کە پەیتا پەیتا لە خەونەکانمدا دەمبینی. وەک ئەوەی یارمەتیی نەخۆشێک بدات، چووە بن باڵمـەوە و بە بەزەیی پێداهـاتنەوە بردمی بـۆ گۆشـەیەکی باخـچـەکـە. لەو کاتەدا یەکێکی تری کەتە و زەبەلاح کە هی ئەوە نەبوو بێتە ناو خەونەکانمەوە، لێم نزیک کـەوتەوە. بـەهـەردووکـیـان لە پاڵ دیوارێکدا ڕایان گـرتم و دەسـتـەکـانمیـان بەسـتەوە، یەکـێکیـان تەورێکی بەدەسـتـەوە بوو کـە زۆر گـەورە نـەبوو. گوتیـان والی دەسـتووری داوە ئەگەر نەبی بە مـوسڵـمـان، یەکسـەر لە گـەردنت بدەین. وەک بەرد لە شوێنی خۆمدا وشک بووم.

لە دڵی خـۆم گـوتم یەکـجـار وا بەپەلەش نابێ. بە بەزەییـیـەوە لە منیـان دەڕوانی. هیـچم نەگـوت. ئارەزووم بوو هـەر هیچ نەبێ جـارێکی تریش لێم بپـرسنەوە. دوای کـەمێک پرسـیاریان کـردەوە. من لـە ڕوانگەی خـۆمـەوە ئاینەکـەم وەک شـتێک، کـە شـایەنی ئەوە بێت گیـانمی لەپێناودا بەخت بکەم، هاتە پێش چاو. بەم ڕەفتـارەم، لە لایەک بەهـایەکم بۆ خــۆم دادەنا و لـە لایەکی تر، جــۆری ئەو جــووتـە، کــە بـە پرسـیـارکردنی بەردەوامیـان وەرگـەڕانی منیـان لە ئاین دژوارتر دەکرد، بـەزەییم بە خۆمدا دەهاتەوە. کاتێک زۆرم لە خۆم کرد بیر لە شتێکی تر بکەمەوە، ئەو دیمەنانەم هێنایـەوە بەر چاوی خـۆم کە لە پـەنجـەرەیەکی باخـچـەی پشـتـەوەی مـاڵەکـەمـانەوە دەبیندران. خۆخ و گێلاس لەسەر سینییەکی گەوهەرڕێژی سەر مێزێک داندرابوون. لە پشت مێزەکەوە کورسـیـیـەکی لە حـەسیر چندراو هـەبوو. چەند سـەرینێکی پەڕی باڵندەش، کـە لە هەمـان ڕەنگی سـەوزی چوارچێـوەی پەنجـەرەکـە بـوون، لەسـەر کورسییەکە داندرابوون. لە دواتریش، ئەستێرکێکی ژێر بڕێک دارزەیتوون و گێلاسم بینی کە چۆلەکەیەک بە قەراغیەوە نیشتبووەوە. جۆلانەیەکیش، کە بەلقێکی بەرزی دارگـوێزێکی دوای ئەوانەوە هەڵواسـرابوو، هێـدی هێـدی بە بـایەکی نادیار لەرەی دەکرد. جـارێکی تریش پرسـیـاریان کـردەوە و منیش لـە وەڵامـدا گوتم ئاینی خـۆم

ناگۆڕم. کۆتەرەدارێک لەوێ بوو، چۆکیان پێم دادا و سەرمیان خستە سەری. لە پێشدا چاوم نوقاند، بەڵام دوایی کردمەوە. یەکێکیان تەورەکەی بە دەستەوە گرت. ئەوی تریان گوتی لەوانەیە پەشیمان بووبێتەوە. ڕاستی کردمەوە. داوام لێ کرا کەمێکی تریش بیری لێ بکەمەوە.

لە کاتێکدا من بیرم دەکردەوە، ئەوان لە پەنای کۆتەرە دارەکەدا دەستیان بە هەڵکۆڵینی زەوی کرد. بیرم بۆ ئەوە چوو هەر لەوێدا بمنێژن. سەرباری ترس لە مردن، ترسی زیندە بەچاڵکردنیش لە هەناومدا چەکەرەی کرد. لە دڵی خۆمدا دەمگوت هەتا ئەوان لە هەڵکەندنی گۆڕەکە دەبنەوە، من بڕیاری خۆم دەدەم. کەچی ئەوان دوای هەڵکەندنی چاڵێکی بچووک، بەرەو لای من هاتنەوە. لەو ساتەدا بیرم کردەوە ئەوپەڕی گەمژەییە لێرە بمرم. بەنیاز بووم ببم بە موسڵمان، بەڵام کات بە دەستەوە نەمابوو. گوتم: "ئەگەر بگەڕێمەوە بۆ ژووره خۆشەویستەکەی زیندان کە ئیدی پێی ڕاهاتووم، بە درێژاییی شەو دادەنیشم و بیردەکەمەوە. لەوانەیە تا بەرەبەیان بتوانم بڕیاری گۆڕینی ئاینەکەم بدەم؛ بەڵام نەک بەم پەلەپەلە."

یەکسەر منیان هەڵگرت و بردمیان و ناچار کرام دیسان بکەومە سەر چۆک. بەرلەوەی سەرم بخەنەوە سەر کۆتەرە دارەکە، بە بینینی کەسێک لە نێوان دارەکانەوە، کە وەک ئەوەی بفڕێ، تێ دەپەڕی، سەرم سوڕما. کتومت وەک ئەوە وابوو خۆم بم و ڕیشم هاتبێ و درێژ بووبێ و لەوێدا بێ ئەوەی پێیەکانم بە زەوی بگەن، بە بێدەنگی بڕۆم بەڕێوە. بەخۆمم گوت با بانگێکی ئەو دیمەنەی خۆم بکەم کە بەناو دارەکاندا دێ و دەچێ. دەنگم دەرنەچوو، سەرم بە کۆتەرە دارەکەوە نووسابوو. لەو ساتەدا بەوە دڵی خۆم دایەوە کە ئەوەی دوای کەمێکی تر بەسەرم دێ، لەگەڵ خەوندا جیاوازییی نابێ. چاوەڕێم کرد، پەراسووم و پشتم ڕچین، نەدەمویست بیر بکەمەوە، بەڵام بیرم لەوە دەکردەوە وا خەریکە لە سەرمان ڕەق هەڵدێم. دواترێ منیان بەرز کردەوە و لە بن لێوەوە گوتیان: لەوانەیە والی زۆر توڕە بێ! لەوێدا، لەگەڵ کردنەوەی بەندی دەستەکانمدا کەوتنە جنێودان پێم: منیان بە دوژمنی خوا و پێغەمبەر دانا. برامەوە سەرەوە، بۆ کۆشک.

والی، دوای ئەوەی دامێنی کەواکەی خۆی پێم ماچ کرد، کەوتە دڵدانەوەم. پێمی

گوت لەبەرئەوەی ئامادە بووم لەپێناوی نەگۆڕینی ئاینەکەمدا ژیانی خۆم ببەخشم، منی خۆش ویستووە، بەڵام هێندەی پێ نەچوو دەستی کردەوە بە قسەی بەرز و نزم: بەڕای ئەو، من بەختوخۆڕایی کەللەڕەقیم نواندووە، ئیسلام ئاینێکی پیرۆزترە و شتی تری لەو بابەتە. ئەوەندەی گوت تا تووڕە بوو، سوور بوو لەسەر سزادانم. دواتر باسی ئەوەی کرد کە بەڵێنی بە کەسێکی تر داوە. وای بۆچووم ئەو بەڵێنە لە هەندێک لەو خراپەکارییانە، کە لەوانە بوو بەسەرم بێ، ڕزگارم دەکات. ئەو کەسەی ئەم بەڵێنی پێ داوە و لە میانەی قسەکانی والییەوە بۆم دەرکەوت کەسێکی سەیر و سەمەرەیە، لە ئاکامدا تێ گەیشتم خۆجەیە. لەو ساتەدا والی ڕای گەیاند کە منی بە دیاری بە خۆجە بەخشیوە. سەرەتا، بێ ئەوەی زۆر تێ بگەم، سەیرم دەکرد. والی ڕای گەیاند: "تۆ لەمە بەدواوە کۆیلەی خۆجەی. بەڵگەنامەم داوەتێ و ئازادکردن و نەکردنیشت لە دەستی ئەودایە. لەمەوپاش ئەو ئازادە چیت لێ دەکات." والی لە ژوورەکە چووە دەرێ و ڕۆیشت.

خۆجەش لە کۆشک بوو، لە خوارەوە چاوەڕێی منی دەکرد. ئەو ساتە حاڵی بووم ئەو کەسەی کە لە ناو دارەکانی باخچەکەدا بینیبووم، ئەو بووە. بە پێ ڕۆیشتینەوە بۆ ماڵەکەی. بە منی گوت هەر لە سەرەتاوە زانیویەتی کەوا من لە ئاینی خۆم وەرناگەڕێم. تەنانەت یەکێک لە ژوورەکانی ماڵەکەی بۆ من ڕێک خستبوو. پرسیاری برسی بوون و نەبوونی لێم کرد. هێشتا لە ژێر کاریگەریی ترسی مردندا بووم. لە ڕەوشێکدا نەبووم بتوانم شتێک بخۆم. لەگەڵ ئەوەشدا چەند پاروویەکم لەو نان و ماستە خوارد کە نابوویە بەردەمم. لە کاتێکدا من پاروەکانم دەجوو، خۆجە بە شادمانییەوە سەیری منی دەکرد. جۆری گوندییەک کە ئالیکی نابێتە بەردەم ئەسپێکی تازە کڕاو لە بازاڕ و بە خۆشحاڵییەوە بیر لەو کارانە بکاتەوە کە پێی ڕادەپەڕێنێ، بۆمی دەڕوانی. تا ئەو ڕۆژەی خۆجە لە وردەکاریی ئەو سەعات و بیردۆزەی کۆسمۆگرافییەدا، کە دەبوو پێشکەشی والیی بکات، نقوم بوو و منی لە بیر کرد، من بەردەوام ئەو نیگایانەی ئەوم بیر دەکەوتەوە.

دواترێ بە منی گوت کە دەبێ هەموو شتێکی فێر بکەم. هەر بۆ ئەوەش منی لە والی خواستووە و تەنیا دوای ئەوەش دەتوانێ ئازادم بکات. چەندین مانگم پێویست

بوو تا تێ گەیشتم ئەو "هەموو شتە" چییە. "هەموو شتێک" ئەو شتانە بوو کە لە دەرسخانە و خوێندنگاکان فێر کرابووم، هەموو ئەو گەردووناسی، پزیشکی، ئەندازیاری و زانستەی کە لەوێ، لە ولاتەکەی خۆم فێریان بووبووم! پاشان دەیویست بۆچوونم دەربارەی ناوەڕۆکی هەموو کتێبەکانی ژووری زیندانم، کە ڕۆژی دواتر دەستووری دا بۆمیان هێنا و هەروەها هەرچی دەربارەی ڕووبار، ئاسمان، هەور و ئۆقیانووسەکان و هۆکاری بوومەلەرزە و گرمەی هەور بیستوومە و بینوومە، بزانێ. لە دەوروبەری نیوەشەودا گوتی: "لە هەموو شتێک زیاتر خولیای ئەستێرە و هەسارەکانم لە سەردایە." لە پەنجەرە والاکەوە تیشکی مانگ دەهاتە ژوورەوە. گوتی: "هەرچۆنێک بووە دەبێ بەڵگەیەک سەبارەت بە هەبوون یان نەبوونی ئەو ئەستێرە بچووکەی نێوان مانگ و زەوی بدۆزینەوە." من لە کاتێکدا کە دەبوو بە دوو چاوی پڕ لە ترسی ڕۆژێکی تۆقێنراو بە مردنەوە لە لێکچوونی وەڕەسکەری نێوان هەردووکمانم بڕوانیبایە، خۆجە ئیدی وشەی "فێربوون"ی بەکار نەدەهێنا: بگرە دەیگوت پێکەوە لێکۆڵینەوە دەکەین، بەجووتە داهێنان دەکەین و پێکەوە بەڕێوەی دەبەین.

بەمجۆرە، وەک دوو برای باش، دوو قوتابیی گوێڕایەڵ کە گەورەکانیان لە درزی دەرگاوە چاودێرییان دەکەن و لە کاتی ئامادەنەبوونی ئەوانیشدا لە ماڵەوە بە باوەڕەوە ئەرکەکانی خۆیان ڕادەپەڕێنن، دەستمان کرد بە کار. سەرەتا من خۆم وەک برا گەورەیەکی نیازپاک هاتە بەرچاو کە ڕازی بوو لەپێناوی پیاراگەیشتنی برا تەمەڵەکەیدا چاو بەهەموو زانیارییەکانی خۆیدا بگێڕێتەوە. خۆجەش وەک برایەکی زیرەک بۆ سەلماندنی ئەوەی کە زانیارییەکانی کاکی هیچ نین، هەڵسوکەوتی دەکرد. بەبۆچوونی ئەو، جیاوازیی زانایی نێوانمان تەنیا هێندەی ژمارەی ئەو کتێبانە بوو کە لە ژووری زیندانەوە بۆم هێندرابوون و ئەو چاوێکی پیایاندا گێڕابوو، یاخۆ ئەوەندەی ئەو بەرگە کتێبانە بوون کە بیرم کەوتبوونەوە. بە لێهاتوویی و زیرەکیی لە ڕادەبەری خۆی پەی بە زمانی ئیتالی برد -دواتر زۆر بە باشی فێربوو- و لە ماوەی شەش مانگدا هەموو کتێبەکانی منی خوێندەوە و وای لێم کرد هەرچیم بە بیر دەهاتەوە بۆم دەگێڕایەوە. کار گەیشتە ئەوەی ئیدی من هیچ بالادەستییەکم بەسەر

ئەوەوە نەمابوو. بەڵام بەجۆرێک ڕەفتاری دەکرد وەک ئەوەی زانستێکی هەبێ کە بێ بەهاییی کتێبەکان تێ دەپەڕێنێ و سروشتی و قووڵترە لەو شتانەی فێریان بووە. شەش مانگ دوای دەستبەکاربوونمان، ئیدی جووتێک نەبووین پێکەوە فێر بین و پێکەوە پێش بکەوین، بەڵکو ئەو بیری دەکردەوە، منیش تەنیا هەندێک وردەکاریی پێویستم بیر دەخستەوە، یان لە چاو گێڕانەوە بە زانیارییەکانیدا هاوکاریم دەکرد.

"بیرۆکە"کانی خۆی کە من زۆربەیانم لە بیر نەماوە، بەزۆری لە درەنگانی شەودا، دوای خواردنێکی سەرپێییانە و کاتێک هەموو چرایەکانی گەڕەک دەکوژێندرانەوە و کپی و بێدەنگی باڵی بەسەر هەموو لایەکدا دەکێشا، بیر دەکەوتەوە. بەیانیان لە دەرسخانەی مزگەوتێکی دوو گەڕەکیی ئەولای خۆمانەوە دەرسی بە منداڵان دەگوتەوە. دوو ڕۆژیش لە هەفتەدا دەچووە مووەقیتخانەی مزگەوتی گەڕەکێکی دوور کە من هەرگیز بۆی نەچووبووم. پاشماوەی کاتەکانی تریشمان بە خۆئامادەکردن بۆ "بیرۆکە"کانی شەوی داهاتوو یان تاوتوێکردن و گفتوگۆکردن دەربارەیان تێ دەپەڕاند. لەو کاتانەدا بە ئومێدەوە باوەڕم دەکرد کە لە کاتێکی نزیکدا بۆ وڵاتەکەم دەگەڕێمەوە. لەبەرئەوەی دەترسام نەبادا بێ بەهۆی دواکەوتنی گەڕانەوەم، بەهیچ جۆرێک دژایەتیی "بیرۆکە"کانی خۆجەم نەدەکرد کە زۆریش بەپەرۆشەوە گوێم بۆ وردەکارییەکانی ڕانەدەگرت.

بەو شێوەیە ساڵی یەکەممان لە گەردوونناسیدا، کە بۆ گەڕان بەدوای بەڵگەی هەبوون یان نەبوونی ئەو ئەستێرە خەیاڵییەی خۆمان تێ هاویشتبوو، بەسەر برد. لە کاتێکدا بەو تەلیسکۆپانەی کە بە دروستکردنی دابوون و گەردبینەکانی بە پوولێکی زۆر لە فلاندەرستان کڕابوون و بە ڕوانگە و ئامرازی گەردوونی کارمان دەکرد، خۆجە بابەتی ئەستێرە خەیاڵییەکەی لە بیر کرد. ئاشکرای کرد چووەتە ناو پرسێکی زۆر قووڵترەوە و دەیەوێ سیستەمی پەتلیموس بکات بە بابەتی گفتوگۆ. بەڵام گفتوگۆمان نەدەکرد، ئەو دەدوا و من گوێم بۆ ڕادەگرت: بێهودە باسی خولگە ڕوونەکانی ئاسمانی دەکرد کە ئەستێرەکانیان پێوە هەڵواسراوە و دەیگوت لەوانەیە شتێکی تر لەوێ هەبێ کە ئەو ئەستێرانەی ڕاگرتووە. لەوانەیە هێزێکی نەبینراو بێ، بۆ نموونە هێزی کێشکردن. پاشان درێژەی دایێ و گوتی لەوانەیە زەویش وەک خۆر

بە دەوری شـتـێکی تردا بسـووڕێتـەوە، لەوانەیشـە هەمـوو ئەسـتـێـرەکـان بە دەوری ناوەندێکی تردا، کە ئێمە بە هەبوونی نازانین، بخولێنەوە. دواترێ لافی ئەوەی لێ دا کە دەتوانێ لە پەتلیموس قووڵتر بیر بکاتەوە. بۆ بەدەستهێنانی کۆسمۆگرافییەکی زۆر فـراوانتـر دەسـتی کـرد بـە لێکۆڵینەوە لە هێـشـووێک ئەسـتـێـرەی نوێ و چەند بیرۆدۆزەیەکیشی بۆ سیستەمێکی نوێ خستە بەردەست. دەشێ مانگ بە دەوری زەوی و زەویش بە دەوری خـۆردا بسـووڕێتـەوە و ڤـینۆسـیش چەق بێ، بەڵام هێندەی نەبرد، لەمانەش بێزار بوو. دوای ماوەیەک گوتی: "لەم کاتەدا گرفت خستنە ڕووی ئەم بیـرۆکانە نییـە، بگرە ناسـاندنی ئەسـتـێرەکان و چۆنیـەتیی سـووڕانـەوەیانە بە ئەمانەی ئێرە و ئەمەش لە والییەوە دەست پێ دەکات." لەم قسـە و باسـانەدا بووین زانیـمـان والـی سـادق پاشـا بۆ ئەرزەڕووم دوورخـراوەتەوە. دەگـوترا لە پیـلانێکی سەرنەکەوتوودا بەشداریی کردووە.

لەو سـاڵانەدا کـە چاوەڕێی گـەڕانەوەی والیـمـان دەکـرد لە تاراوگـە، بەمـەبەسـتی نووسـینی لێکۆڵینەوەیەک لەبارەی هۆکـارەکـانی ڕێژگـە و ئاوەڕۆی ئاوی تەنگەی بوسـفـۆر، چەندین مانگ لە هەوایەکدا کە کاری لە مەژیمان دەکرد، بە لێوارەکانی ئەمبـەر و ئەوبەری بوسـفـۆردا گـەڕاین، سـەیری ڕێژگـەی دەریامـان دەکـرد و بەو قاپانەی بە دەستمانەوە بوو، لە دۆڵەکاندا پلەی گەرما و خێراییی ئەو جۆگەلانەمان دەپێوا کە دەڕژانە تەنگەی بوسفۆرەوە.

لەسـەر داوای والی بۆ ڕاپەڕاندنی کـارێک چووینە گـەبزە و سێ مـانگ لەوێ ماینەوە. بێسەروبەرەییی کاتی نوێژ لە نێوان مزگەوتەکانی ئەوێدا، بیرۆکەیەکی تری بە خۆجە بەخشی: بڕیاری دا سـەعاتێکی بێ کەموکوڕی بۆ نیشاندانی کاتەکانی نوێژ دروست بکات. لەو کاتەدا بوو فێرم کرد ئەو شتەی مێزی پێ دەگوترێ، چییە. پێوانەکانم دایە دارتاشێک و مێزەکەم بە دروستکردن دا. کاتێک بۆ ماڵ هێنامەوە، خـۆجـە لە پێـشـدا بەدڵی نەبوو، بە بەردی مـردووشـۆری چوواند و دەیگوت مـایەی نەگبەتییە، بەڵام دواتر لەتەک کورسییەکان و لەگەڵ مێزەکەش ڕاهات. دەیگوت بەو جۆرە دەتوانێ باشتر بیر بکاتەوە و بنووسێ. لە ڕێی گەڕانەوەماندا بۆ ئەستەنبوڵ بەنیازی لە قاڵبدانی ددانەی پێچاوپێچی هاوتەریب لەگەڵ ڕێڕەوەی خولانەوەی خۆر

بۆ سەعاتی نوێژەکە، مێزەکەمان بە سەر پشتی کەرێکەوە لە دوامانەوە دەهات.

لەو چەند مانگەی سەرەتادا کە بەرامبەر بەیەک لەمبەر و ئەوبەری مێزەکە دادەنیشتین و کارمان دەکرد، خۆجە دەکۆشا لەوە بگات چۆن کاتەکانی نوێژ و رۆژوو لە ولاتانی سارد کە بەهۆی شێوەی هێلکەییی گۆی زەوییەوە جیاوازییەکی زۆری کات لە نێوان رۆژ و شەودا هەیە، دەستنیشان بکرێ. پرسیارێکی تری، هەبوون یان نەبوونی خاڵێکی تری جگە لە مەکە بوو، بەجۆرێک مرۆڤ لە هەرلایەکەوە رووی تێ بکات، روو لە قیبلە وەرنەگێڕێ. کاتێک دەیبینی بایەخ بەو گرفتانە نادەم کە لە ناخەوە رقم لێیان دەبووەوە، بە چاوی سووکەوە بۆمی دەڕوانی، بەڵام هەستم دەکرد پەی بە "باڵادەستی و جیاوازی"ی من بردووە. وای بۆچووم ئەویش هەستی بەم پەی پێ بردنەی من کردبێ، بۆیە یەکجار وا رقی لێم دەبووەوە. بەدرێژی باسی زانستی دەکرد و بە قەد ئەوەش دەربارەی زیرەکی دەدوا. دەیگوت: "والی لە گەڕانەوەیدا بۆ ئەستەنبوڵ، دەکەوێتە ژێر باندۆری نەخشەکانم و سەعاتە نوێیەکەم و بیرۆدۆزەی نوێی کۆسمۆگرافیم کە کاری زیاتری لەسەر دەکەم و بۆ باشتر روونکردنەوە لە شێوەی میناتۆردا دەیخەمە روو." لێرەدا بە رژاندنی تۆوی ژیاندنەوەیەکی نوێ، هەمووانی تووشی خولیای ناو دەروونی خۆی دەکرد: هەردووکمان چاوەڕێمان دەکرد.

## 3

خۆجە لەو ڕۆژانەدا بیری لەوە دەکردەوە چۆن ددانەیەکی گەورەی ئەوتۆ دروست بکات ئەگەر هەفتەی جارێکیش نەبێ، بەلایەنی کەمەوە مانگی جارێک سەعاتەکەی پێ قورمیش بکرێ. ئەوەی لە خەیاڵدا بوو لەدوای بەدەست خستنی تاخمە ددانەیەکی لەو جۆرە، سەعاتێکی نوێژ، کە ساڵی جارێک قورمیش بکرێ، دروست بکات. لە کاتێکدا سەرقاڵی بیرکردنەوە بوو لەوەی تاکە گرفت دۆزینەوەی هێزی پێویستە بۆ بەگەرخستنی ددانەکانی ئەو سەعاتە گەورەیە، کە بە ئەندازەی دوورکەوتنەوەیان لەیەکدی، کێشیان زیادی دەکرد، لەڕێی دۆستەکانیەوە لە مووەقیتخانە هەواڵی ئەوەی زانی کە والی لە ئەرزەڕووم گەڕاوەتەوە.

ڕۆژی دواتر چوو بۆ پیرۆزباییکردن لە والی. ئەویش، لە ناو ئاپۆڕەی میوانەکاندا هەواڵی ئەمی پرسیبوو، پەرۆشیی خۆی بۆ زانینی داهێنانە نوێیەکانی دەربڕیبوو و تەنانەت پرسیاری منیشی لێ کردبوو. ئەو شەوە چەندین جار سەعاتەکەمان لەبەریەک هەڵوەشاندەوە و دیسانەوە بەستمانەوە، چەند شتێکمان بۆ ئێرە و ئەوێی میناتۆرەکەی گەردوون زیاد کرد و بە فلّچەکانی دەستمان ئەستێرەکەنمان بۆیاخ کرد. خۆجە، لەبەر چەند پارچەیەکی دەقێکی بۆم خوێندەوە کە بەمەبەستی کاریگەری دانان لەسەر گوێگران بە زمانێکی شاعیرانە و سەرنجڕاکێش نووسیبووی. ئەم دەقەی کە دەربارەی لۆجیکی خولانەوەی ئەستێرەکان بوو، بۆ ئەوەی لە کاتی خوێندنەوەیدا جۆش و خرۆشی کەم نەبێتەوە، دەمەوبەیانی جارێکیش بە پێچەوانەوە خوێندیەوە. پاشان ئامێرەکانی لە گالیسکەیەک کە بۆ ئەو مەبەستە

بانگی کردبوو، بار کرد و بەرەو کۆشکی والی بەڕێ کەوت. سەعات و میناتۆرەکەش، کە چەندین مانگ بوو هەموو ماڵەکەیان پڕ کردبوو، بە سەرسوڕمانەوە بینیم هێندە بچووک بوون بەجۆرێک لە گالیسکەیەکدا جێگەیان بووەوە. خۆجە ئێوارەیەکی زۆر درەنگ گەڕایەوە بۆ ماڵەوە.

پاش داگرتنی ئامێرەکان لە باخچەکە و دوای ئەوەی والی وەک کابرایەکی پیری بێ تام، کە لەگەڵ شتی سەرنجڕاکێشدا گاڵتە نازانێ، چاوێکیان پێدا دەگێڕێ، خۆجە ئەو دەقانەی بۆ دەخوێنێتەوە کە پێشتر لەبەری کردبوون. والی لەو کاتەدا منی بیرکەوتبووەوە، ئەو پرسیارەی لێ کردبوو کە سوڵتانیش چەندین ساڵ دواتر دووپاتی دەکردەوە: "ئایا ئەو تۆی فێری ئەم شتانە کردووە؟" یەکەم کاردانەوەی بەوجۆرە بووە. خۆجەش کاردانەوەیەکی نیشان دابوو کە هێندەی دی والیی تووشی سەرسوڕمان کردبوو. پرسیبووی: "کێ؟" دواتر، دەسبەجێ تێ گەیشتبوو کە کەسی باس لێوەکراو، منم. بەدوای ئەوەدا بە والیی گوتووە کەوا من گەمژەیەکی خوێندەوارم. خۆجە لە کاتی گێڕانەوەی ئەم بابەتانەدا بۆ من، بایەخی پێم نەدەدا، بگرە هێشتا خەیاڵی لای ڕووداوەکانی کۆشکی والی بوو. دواتر بەپێ داگرتنەوە گوتبووی هەموو شتەکان لە داهێنانی خۆین، بەڵام والی باوەڕی پێ نەکردبوو. وای نواندبوو بەدوای تاوانبارێکدا بگەڕێ و دڵی نەهاتبێ بڵێ تاوانبارەکە خۆجەی خۆشەویستی خۆی، خۆیەتی.

بەو جۆرە لەبری ئەستێرەکان، باسی منیان کردبوو. تێ دەگەیشتم خۆجە زۆر مەیلی لێ نەبووە لەبارەی ئەو بابەتەوە بدوێ. بۆیە بێدەنگییەک هاتووەتە ئاراوە، سەرنجی والیش کەوتووەتە سەر میوانەکانی تر. خۆجە لە کاتی نانی ئێوارەدا هەوڵێکی تری دابوو لە بارەی ئەستێرەکان و داهێنانەکانی خۆیەوە بدوێ، والی لەو کاتەدا گوتبووی هەرچی هەوڵ دەدات شێوەی منی بیر بکەوێتەوە، ڕووخساری خۆجەی دێتە بەرچاو. لەوێ خەڵکی تریش بە دەوری خوانەکەوە بوون. چەلەحانێیەک لەبارەی خوڵقاندنی مرۆڤی دووانەوە دەستی پێ کردووە و نموونەی زۆر پێوەنراو لەو بارەیەوە بەبیر هێنراوەتەوە. باسی ئەو جمکانە کراوە کە دایکان لە جیاکردنەوەیاندا سەریان لێ دەشێوێ، ئەو لێکچووانەی کە یەکتر دەبینن، دەترسن، بەڵام دواتر وەک

ئەوەی جادوویان لێ کرابێ، هەرگیز لە یەکدی جیا نابنەوە. قسەیان بردووەتەوە سەر ئەو چەتە و ڕێگرانەی جێی کەسانی بێ تاوانیان گرتووەتەوە. دوای نان خواردن و بڵاوەکردنی ئاپۆڕەی میوانەکان، والی داوای لە خۆجە کردبوو بمێنێتەوە.

کاتێک خۆجە سەرلەنوێ دەستی بە گێڕانەوە کردبوو، والی لە پێشدا زۆر چێژی لە قسەکانی وەرنەگرتبوو، تەنانەت نارازیش بووە لەوەی بە بیستنی چەند زانیارییەکی قـورس بۆ تێگەیشتن، دووبارە زەوقی تێک چووەتەوە. بەڵام دوای ئەوەی بۆ جـاری سێیەم گوێ لە دەقە لەبەرکراوەکەی خۆجە دەگرێ و زەوی و ئەستێرەکانی سەر میناتۆرەکەمان چەند جارێک بە بەرچاوییەوە دەخولێنەوە، خۆی وا نیشان دەدات وەک ئەوەی کەمێک حاڵی بووبێ. بەلایەنی کەمەوە جۆرێک لە پەرۆشیی لا دروست دەبێت و بەوردی گوێ بۆ گێڕانەوەکانی خۆجە ڕادەگرێ. لەو ساتەدا خۆجە دووبارە بە خرۆشەوە دەڵێ ئەستێرەکان بەوجۆرە نا کە هەموو کەس پێیان وایە، بگرە بەمجۆرە دەخولێنەوە. والی لە ئاکامدا گوتوویەتی: "باشە، تێ گەیشتم، ئاوهاش دەبێ، بۆچی نەبێ!" لەو کاتەدا خۆجە بێدەنگ دەبێ.

وای بۆچووم لەو ساتەدا بێدەنگییەکی درێژ هاتبێتە ئاراوە. خۆجە لە پەنجەرەکەوە نیگای لە تاریکاییی کەنداوی زێڕین بڕی و لەبەر خۆیەوە دەستی بە قسان کرد: "والی بۆچی ڕاوەستا، لەبەرچی زیاتر نەچووە پێشەوە؟" ئەگەر ئەمە پرسیارێک بێ، منیش وەک ئەو وەڵامەکەیم نەدەزانی. وای بۆچووم خۆجە بیرۆکەیەکی دەربارەی ئەو شوێنە هەبێ کە دەبێ والی لێی بچێتە پێشەوە، کەچی هیچی نەگوت. پێ دەچوو ئەوەی کە هەموو کەس لەو نەدەچوون، نائارامی کردبێ. والی، دواترێ بایەخی بە سەعاتەکە دابوو، ناوەکەی پێ کردبوونەوە و پرسیاری کەڵکی ددانە و میکانیزم و قورساییەکەی لە خۆجە کردبوو. وەک ئەوەی پەنجە بە کونی تاریک و ترسناکی ماردا بکات، بەترسەوە پەنجەی کردبوو بە ئامێرە کرتەکرتکەرەکەدا و دەری هێنابووەوە. خۆجە لەو هەلەدا بورجەکانی سەعاتەکەی کردبووەوە، باسی لە هێزی ئەو نوێژانە کردبوو کە هەمووان لە هەمان ساتدا دەیکەن. والی لەو چرکەیەدا تەقیبووەوە و گوتبووی: "خۆتی لێ ڕزگار بکە! ئەگەر دەتەوێ بە ژەهر، ئەگەر دەخوازی ئازادی بکە. دەحەسێیتەوە." دەبێ من لەو کاتەدا بۆ ساتێک بە ترس و

ئومێدەوە لە خۆجەم ڕوانیبێ. ئەو گوتی: "تا ئەوانە لە کارەکە نەگەن، ئازادت ناکەم."

نەمپرسی ئەو کارە چییە کە دەبێ لێی تێ بگەن. لەوانەشە ترسەکەم لەوێوە سەرچاوەی گرتبێ کە هەستم دەکرد خۆجەش خۆی نەیزانێ. پاشان باسی شتی تریان کردبوو. والی چارەی خۆی دابوو بەیەکدا و بەڕقەوە سەیری ئامێرەکانی بەردەستی کردبوو. خۆجە بە ئومێدی ئەوەی والی جارێکی تر ئاوڕی لێ بداتەوە، چاوەڕێی کردبوو. سەرباری ئەوەی زانیبووشی چیدی ئەو ئێوارەیە کەسێکی خوازراو نییە، کەچی تا درەنگانی شەو لە کۆشکی والی دانیشتبوو. پاشان فەرمانی دابوو ئامێرەکان لە گالیسکەکە بار بکرێن. من کەسێکی ناو ماڵێکی سەر ڕێگای تاریک و بێدەنگی گەڕانەوەی خۆجەم هێنایە بەرچاوی خۆم کە لە پێخەوەکەیدا خەوی زڕاوە: لە نێوان دەنگی تایەکانی گالیسکەکەوە گوێی لە کرتەکرتی سەعاتە گەورەکە بووە و سەری سوڕماوە.

خۆجە، تا گزنگی بەیان بەپێوە مایەوە. ویستم مۆمێکی تر لەبری مۆمە کوژاوەکە دابگیرسێنم، بەڵام ڕێی پێم نەدا. لەبەرئەوەی دەمزانی دەیەوێ شتێک بڵێم، گوتم: "والی هەر تێ دەگات." ئەمەم لە تاریکییەکەدا گوت و پێم وابوو ئەویش دەیزانی خۆشم بڕوام بەم قسەیەم نییە، بەڵام پاش کەمێک وەڵامی دایەوە: "هەموو کارەکە، لە دۆزینەوەی نهێنیی ئەو کاتەدایە کە والی تیایدا بێدەنگ بوو."

بۆ هەڵدانەوەی پەردە لەسەر ئەو نهێنییە، لە یەکەم هەلدا چوو بۆ لای والی. ئەمجارەیان والی بە کەیفێکی سازەوە پێشوازیی لێ کردبوو. بە خۆجەی گوتبوو کە لە ڕەوتی ڕووداوەکان و لە نیازی ئەو حاڵی بووە. دوای دڵدانەوەی خۆجە، ئامۆژگاریی کردبوو هەوڵەکانی بخاتە گەڕ بۆ دروستکردنی چەکێک. گوتبووی: "چەکێکی ئەوتۆ کە دنیا لە دوژمنەکانمان بکات بە زیندان!"، بەڵام نەیگوتبوو دەبێ چەکەکە چۆن بێ. والی ئامادەیی خۆی دەربڕیبوو پشتیوانی لە خۆجە بکات، بە مەرجێک مەیلی زانستییانەی خۆی بەو ڕووکارەدا ببات. بێگومان بەهیچ جۆرێک باسی لە داهاتی مانگانەی ئێمە نەکردبوو، ئەوەندە نەبێ کیسەیەکی پڕ لە پارەی زیوینی دابوو بە خۆجە. کیسەکەمان لە ماڵەوە کردەوە و پارەکەمان ژمارد، ١٧ دانە بوو، ژمارەیەکی وا سەیر! والی دوای ئەوەی کیسەکەی دابوو بە خۆجە، گوتبووی

سولّتان لە خشتە دەبات بۆ ئەوەی گوێ بۆ خۆجە ڕابگرێ. گوتبووی سولّتانی لاو خولیای "ئەو جۆرە شتانە"ی لە سەردایە. نە من و نە خۆجەش کە بە ئاسانی ئومێدی لا پەیدا دەبوو، دڵمان بەو بەڵێنە خۆش نەکرد، بەڵام دوای هەفتەیەک هەواڵێکیان هێنا: والی، دوای ڕۆژووشکاندن، ئێمە، بەڵێ منیش، دەباتە لای سولّتان.

وەک خۆ ئامادەکردنێک، خۆجە ئەو دەقەی بۆ والی خوێندبووەوە، بەشێوەیەک کە منداڵێکی نۆ ساڵە لێی تێ بگات، گۆڕی و لەبەری کرد. بەڵام خەیاڵی لای سولّتان نەبوو، بگرە لەبەر هەر هۆیەک بێ، لای والی و هۆی بێدەنگبوونەکەی بوو. دەیگوت دەبێ ڕۆژێک لە ڕۆژان نهێنیی ئەو بێدەنگبوونە ئاشکرا بکات. دەیپرسی: "ئەو چەکەی والی دەیەوێ، دەبێ شتێکی چۆن بێ؟" من شتێکی ئەوتۆم نەمابوو بۆ گوتن، ئەو بەتاقی تەنیا کاری دەکرد. دەچووە ژوورەکەی و تا نیوەی شەوان دەرگای لەسەر خۆی دادەخست. منیش، ئیدی تەنانەت بێ ئەوەی بیر لەوە بکەمەوە کەی بۆ وڵاتەکەم دەگەڕێمەوە، وەک منداڵێکی گەمژە، بێ کاروبار لەبەردەم پەنجەرەی ژوورەکەمدا دادەنیشتم و داڵغەم لێ دەدا: لە خەیاڵی خۆمدا، ئەوەی لەبەردەم مێزەکەدا دادەنیشت و کاری دەکرد، خۆجە نەبوو، من بووم و هەموو کاتێک دەمتوانی بۆ هەر شوێنێک، کە خۆم ئارەزووم بکردایە، بڕۆم!

لەگەڵ ڕۆژئاوابووندا ئامێرەکانمان لە گالیسکەیەک بار کرد و بەرەو کۆشک بەڕێ کەوتین. ئیدی کوچەکانی ئەستەنبوڵم خۆش دەویست. لە خەیاڵی خۆمدا ئارەزووم دەکرد مرۆڤێکی نەبینراو بوومایە و بمتوانیبایە بەناو بەرزە چنار و شابەڕوو و دار ئەرخەوانەکاندا هاتوچۆ بکەم. بەهاوکاریی کەسانی تر لەوێ، ئامێرەکانمان لە شوێنی نماشیکردنیان لە ناوەوە دامەزراند.

سولّتان منداڵێکی خوێنشیرین و ڕوومەت سوور بوو و باڵای لە گوێرەی تەمەنی، کورتتری دەنواند. بەجۆرێک دەستی لە ئامێرەکان دەدا وەک ئەوەی کەلوپەلی گەمەی خۆی بن. ئێستا باش بۆم ناخرێتەوە سەریەک ئایا لەو کاتەدا بوو ویستم ببم بە هاودەم و هاوڕێی، یاخۆ لە دەمی دیداری دووەممماندا بوو کە پاش پازدە ساڵ لەو کاتە پێک هات؟ بەڵام دەسبەجێ حاڵی بووم کە مرۆڤ نابێ ناڕەواییی لە بەرامبەردا بکات. خۆجە لەو ساتەدا نووزەی لە خۆی بڕیبوو. دەست و پێوەندەکانی سولّتانیش

بە پەرۆشەوە چاوەڕێیان دەکرد. لە ئاکامدا توانیی دەست پێ بکات. کۆمەڵێک شتی نوێی بۆ بەسەرهاتەکەی زیاد کردبوو: بەجۆرێک باسی ئەستێرەکانی دەکرد وەک ئەوەی بوونەوەری زیندوو بن و ئاوەزیان هەبێ. ئەستێرەکانی بە کۆمەڵێک بوونەوەری بکێش و پڕ لە ڕاز چوواند کە لە ئەندازە و زانستی ماتماتیک تێ دەگەن و بەپێی ئەو تێگەیشتنەیان دەخولێنەوە. کاتێک دەیبینی منداڵەکە جاروبار سەر بەرز دەکاتەوە و بە سەرسوڕمانەوە سەیرێکی ئاسمان دەکات، ئەم هێندەی دی تاوی دەسەند. ئا لێرەدا ئەو میناتۆرە ڕوونەی گەردوونی نیشان دا کە ئەستێرەکانی پێوە هەڵواسرابوون و دەسووڕانەوە. دەیگوت: "ڤینۆس لەوێدایە و بەوجۆرە دەسوڕێتەوە. ئەو شتە زەبەلاحەی ئێرەش مانگە کە بەشێوەیەکی تر شوێنی خۆی دەگۆڕێ." هەر جارێکیش کە خۆجە لەگەڵ خولانەوەی ئەستێرەکاندا زەنگە هەڵواسراوەکەی قەد میناتۆرەکەی بە دەنگە خۆشەکەیەوە دەلەراندەوە، سوڵتانی بچکۆڵە لە ترساندا هەنگاوێک دەچووە دواوە. پاشان هێزی خۆی گرد دەکردەوە و وەک ئەوەی بیەوێ بچێتە قوتوویەکی ئەفسووناوییەوە، لە ئامێرە زەنگ لێدەرەکە نزیک دەکەوتەوە و هەوڵی دەدا تێ بگات.

ئێستا، کاتێک بیرەوەرییەکانم دێنمەوە سەریەک و هەوڵ دەدەم ڕابردوویەک بۆ خۆم بسازێنم، پێم وایە ئەو دیمەنە تابلۆیەکی بەختەوەریی گونجاوە لەگەڵ ئەو چیرۆک و ئەفسانانەی لە منداڵیمدا گوێم لێ بووە و لەگەڵ ئەو نیگارکێشانەی کە ئەفسانەکانیان دەنەخشاند. میناتۆرەکە لە ئامێرێکی گەمەی منداڵان دەچوو و تەنیا لەو خڕۆکە شووشەییانەی کەم بوو کە بە بادانیان بە پێچەوانەوە، بەفریان بەسەر ئەو ماڵە سەربان سوورانەدا دەباراند کە لەسەر شێوازی کێک بنیاد نرابوون. پاشان منداڵەکە دەستی بە پرسیار کرد و خۆجەش هەوڵی دەدا فریای وەڵامدانەوە بکەوێ:

ئەو ئەستێرانە چۆن بەو جۆرە بە ئاسمانەوە ڕاوەستاون؟ بە خولگە ڕوونەکانەوە هەڵواسراون! ئەو خولگانە لە چی دروست بوون؟ لە مادەیەکی ڕوون کە ڕوونییان پێ دەبەخشێ! ئایا بەریەک ناکەون؟ نەخێر، وەک ئەوانەی سەر میناتۆرەکە قات قاتن! ئەو هەمووە ئەستێرەیە هەیە، ئەدی بۆچی ژمارەی ئاستەکان هێندەی ژمارەی

ئەســـتـــێـــرەکـــان نیـــیـــە؟ چونکە ئەوانە زۆر دوورن! چەند دوورن؟ زۆر، زۆر! ئایا ئەستێرەکانی تریش لە کاتی خولانەوەیاندا زەنگی لەراوەیان هەیە؟ نەخێر، خۆمان زەنگەکەمان داناوە بۆ تێگەیشتن لە خولێکی تەواوی ئەستێرەکان! ئایا گرمەی هەور پێوەندیی بەمەوە هەیە؟ نییەتی! ئەدی پێوەندیی بەچییەوە هەیە؟ بە بارانەوە! ئایا سبەینێ دەبارێ؟ ئەگەر بەشێوەی ئاسماندا بێ، سبەی ناباریێ! گەلۆ ئاسمان بۆ شێرە نەخۆشەکەی سوڵتان چی دەگوت؟ چاک دەبێتەوە، بەڵام پێویستە ئارامی هەبێ و شتی تری لەو جۆرە.

خۆجە لەگەڵ ڕوونکردنەوەی بۆچوونی خۆیدا دەربارەی شێرە نەخۆشەکە، وەک ئەوەی لە کاتی دوان لەبارەی ئەستێرەکان دەیکرد، دیسانەوە سەری بۆ ئاسمان بەرز کردەوە. دوای گەڕانەوەمان بۆ ماڵەوە، بەرقەوە باسی ئەم وردەکارییانەی گێڕایەوە. دەیگوت گرینگ ئەوە نییە منداڵەکە زانست و سۆفیگەری لێک جیا بکاتەوە، بگرە گرینگ ئەوەیە شتێک تێ بگات. دیسان هەمان وشەی بەکار دەهێنا و بەجۆرێکیش دەری دەبڕی وەک ئەوەی من پەیم بەو شتە بردبێ کە دەبێ بزاندرێ. منیش ئیدی بیرم دەکردەوە ببم بە موسڵمان یان نا. ئەو کیسەیەی لە کاتی دەرچوونماندا لە کۆشک پێمان درابوو، پێنج زێڕی تەواوی تێدابوو. خۆجە گوتی سوڵتان پەی بەوە بردووە لۆجیکێک لە پشت چیرۆکی ئەستێرەکانەوە هەبێ. ئاخ سوڵتان! دواتر، زۆر دواتر بەتەواوی ناسیم! لە پەنجەرەکەوە مانگم دەبینی. سەرم سوڕما لەوەی ئەمە هەمان ئەو مانگەیە کە لە پەنجەرەی ماڵەکەی ئێمەوە دەبیندرا. خۆزگەم خواست ببمەوە بە منداڵ! خۆجە خۆی بۆ نەگیرا و گەڕایەوە سەر هەمان بابەت: گرفتی شێرەکە گرینگ نییە، منداڵەکە ئاژەڵی خۆش دەوێ و هیچی تر.

ڕۆژی دواتر چووە ژوورەکەی خۆی و دەستی کرد بە کار. دوای چەند ڕۆژێک دیسان سەعاتەکە و میناتۆری ئەستێرەکانی لە گالیسکەیەک بار کرد. ئەمجارەیان لەژێر ئەو نیگا پڕ لە پرسیارانەدا کە لە پەنجەرە قەفەسدارەکانەوە ئاراستەی دەکرا، چوو بۆ دەرسخانەی منداڵان. ئێوارە لە گەڕانەوەیدا بێزار بوو، بەڵام نەک بەڕادەیەک کە بێدەنگی بکات. گوتی: "وامزانی منداڵەکانیش وەک سوڵتان تێ دەگەن، بەڵام بە هەڵەدا چووبووم." منداڵەکان تەنیا ترسابوون. خۆجە پاش تەواوکردنی قسەکانی،

پرسیاری بابەتەکەی لێ کردبوون. منداڵێک گوتبووی ئەودیوی ئاسمان دۆزەخە، ئەمەی گوتبوو و دەستی بە گریان کردبوو.

خۆجە، هەفتەی دواتری بە قووڵکردنەوەی باوەڕیەوە، بەجۆرێک لە ئاستی تێگەیشتنی سوڵتاندا بێ، بەسەر برد. یەک بەیەکی خولەکەکانی چوونە ژوورەمان بۆ حەوشی ناوەوە دێنێتەوە بیری من. دەکۆشا من بۆچوونەکانی بۆ بسەلمێنم: منداڵەکە زیرەک بوو، بەڵێ. هەر لە ئێستاوە دەیزانی پێویستە بیر بکاتەوە، بەڵێ. هەر لە ئێستاوە خاوەنی کەسایەتیی پێویست بوو بۆ خۆ ڕزگارکردن لە پاڵەپەستۆی دەوروبەر، بەڵێ! بەو جۆرە، ماوەیەکی زۆر پێش ئەوەی سوڵتان دەست بە خەون بینین بۆ ئێمە بکات، ئێمە دەستمان بە خەون بینین بۆ ئەو کرد. خۆجە لەو ماوەیەدا لە سەعاتەکەشدا کاری دەکرد. پێم وابێ لە بارەی چەکەکەشەوە بیری دەکردەوە، چونکە کاتێک بۆ لای والی بانگ کرابوو، وای گوتبوو. بەڵام هەستم کردبوو ئومێدی پێی نەماوە. لەبارەی والییەوە گوتی: "وەک ئەوانی تری لێ هاتووە، ئیدی ناخوازێ ئەوەی کە نایزانێ، بیزانێ!" هەفتەیەک دواتر سوڵتان دیسان ناردی بەدوایدا، ڕۆیشت.

سوڵتان بە ڕوویەکی خۆشەوە پێشوازیی لە خۆجە کردبوو. گوتبووی: "شێرەکەم چاک بووەتەوە، قسەی تۆ دەرچوو." دواتر لەگەڵ دەست و پێوەندەکاندا چووبوونە حەوشەکەوە. سوڵتان ماسیی ناو حەوزێکی نیشانی خۆجە دابوو و ڕای ئەوی لە بارەیانەوە پرسیبوو. لە کاتێکدا ئەم قسانەی بۆ من دەگێڕایەوە، گوتی: "تەنیا گوتم سوورن. هیچ شتێکی ترم بە خەیاڵدا نەهات بۆ گوتن بشێ." لەو ساتەدا لە جووڵەی ماسییەکانیشدا پەی بە هەبوونی نەزمێک بردبوو، وەک ئەوەی لە نێوان خۆیاندا بدوێن بۆ ئەوەی نەزمەکەیان بێ کێماسی بێ. خۆجە بە سوڵتانی گوتبوو ماسییەکانی بەلاوە ژیرە. گرگنێکی تەنیشت یەکێک لەو ئاغایانەی حەرەمخانە کە بەردەوام ئامۆژگارییەکانی دایکی سوڵتانی دەهێنایەوە بیری سوڵتانی منداڵ، پێکەنینی بەو قسەیە هاتبوو. سوڵتانیش جنێوی پێ دابوو. دواتریش کاتێک سواری گالیسکەکان بووبوون، وەک سزایەک، مۆڵەتی نەدابوو ئەو کورتەبالا مووسوورە لەگەڵیاندا سوار بێ.

بە گالیسکە چووبوون بۆ شێرخانە لە مەیدانی ئەسپ. لەوێ سوڵتان دانە بەدانەی چەندین شێر و پشیلەی فارسی و پڵنگی نیشانی خۆجە دابوو کە هەموویان بە زنجیر بە ستوونەکانی کۆنە کڵێسایەکەوە بەسترابوونەوە. لەبەردەم ئەو شێرەدا ڕاوەستابوون کە خۆجە پێشبینیی چاکبوونەوەی کردبوو. منداڵەکە قسەی لەگەڵدا کردبوو و شێرەکەی بە خۆجە ناساندبوو. دواتر چووبوونە لای شێرێکی نووستوو لە گۆشەیەکدا. ئاژەڵەکە دووگیان بووە و وەک ئەوانی تر بۆنی پیسی لێ نەهاتووە. سوڵتان بە دوو چاوی درەوشاوەوە پرسیبووی: "ئەم شێرە چەند بەچکەی دەبێ و چەندیان نێر و چەندیان مێ دەبن؟"

خۆجە زۆر بێزار بووبوو و دواتر لای من دانی پیادا نا کە "هەڵەی کردووە." بە سوڵتانیشی گوتبوو سەرم لە گەردووونناسی دەردەچێ، بەڵام ئەستێرەناس نیم. سوڵتانیش گوتبووی: "بەڵام تۆ باشتری لێ دەزانی وەک لە حوسێن ئەفەندیی گەورەی ئەستێرەناسان!" خۆجە لە ترسی ئەوەی نەبادا یەکێک لەوانەی دەوروبەر قسەکە ببیستێ و بە حوسێن ئەفەندی بگەیەنێتەوە، خۆی لە وەڵامدانەوە پاراستبوو. سوڵتانی خەیاڵشکاو بەردەوام دەبێ و دەڵێ: "خۆجە یان هیچ نازانێ، یاخۆ لەبری ئەستێرەکان سەیری شوێنی بەتاڵ دەکات؟"

بەدوای ئەوەدا، خۆجە، ئەو قسانەی کە داینابوو دواتر بیانکات، ناچار بووە دەستبەجێ دەستیان پێ بکات: گوتبووی زۆر شت لە ئەستێرەکانەوە فێر بووە و گەلێک ئەنجامیشی لەو فێربوونانەوە دەستگیر بووە. بە کەڵک وەرگرتن لە بێدەنگبوونی سوڵتان کە بە چاوی داچەقیوەوە گوێی بۆ ڕاگرتووە، گوتبووی پێویستە ڕوانگەخانەیەک بۆ چاودێریکردنی ئەستێرەکان بێتە دامەزراندن. شتێک لە شێوەی ئەو ڕوانگەخانەیەی کە مورادی سێیەمی باپیری خوا لێخۆشبووی ئەحمەدی یەکەمی باپیری سوڵتان کە نەوەد ساڵ لەمەوبەر فەرمانی دابوو بۆ خوالێخۆشبوو تەقیەدین ئەفەندی دروست بکرێ و دواتر لەبەر فەرامۆشکردن خاپوور بووبوو. نەخێر، شتێکی زۆر لەوە پێشکەوتووتر؛ خانەیەک بۆ زانستەکان کە نەک تەنیا چاودێریی ئەستێرەی تێدا بکرێ، بگرە هەموو ئەو زانایانە لەخۆ بگرێ کە لە هەموو جیهان، ڕووبار و دەریاکانی، هەور و چیا گوڵ و بێگومان لە ئاژەڵانیش دەکۆڵنەوە، بۆ ئەوەی پێکەوە

دەربارەی لێکۆڵینەوەکانی خۆیان بدوێن لەپێناوی پێشکەوتنی ئەوان و گەشەسەندنی ئاوەزی ئێمەدا.

ئەم نەخشەیەی خۆجە کە منیش یەکەمجارم بوو گوێم لێ دەبوو، سوڵتان وەک ئەوەی گوێی بۆ داستانێکی شیرین شل کردبێ، گوێی بۆ ڕاگرتبوو. لە کاتی گەڕانەوەیاندا بە سواری گالیسکە بەرەو کۆشک، دیسان پرسیبووی: "پێت وایە شێرەکە چۆن دەزێ؟" خۆجە لەبەرئەوەی پێشتر بیری لێ کردبووەوە، ئەمجار گوتبووی: "بێچووە تازە لەدایکبووەکان هاوکێشی یەکتر دەبن!" لە ماڵەوە بە منی گوت ئەو قسەیە هیچ مەترسییەکی نییە. دەیگوت: "ئەو منداڵە گەمژەیە دەخەمە لەپی دەستمەوە، زۆر لە حوسێن ئەفەندیی گەورەی ئەستێرەناسان بە تواناترم!" بەکارهێنانی ئەو وشەیە لە کاتی قسەکردندا دەربارەی سوڵتان، منی سەرسام کرد. دواتر لەبەر هەر هۆیەک بێ، لەو قسانەی زویر بووم. لەو کاتانەدا دڵم پڕ بوو لە غەم و خۆم بەکاری ناوماڵەوە سەرقاڵ دەکرد.

دواترێ، دەستی کرد بە بەکارهێنانی وشەیەک وەک کلیلێکی ئەفسووناوی کە هەموو قفڵێک بکاتەوە: "لەبەر گەمژەیی خۆیان، سەرێک هەڵنابڕن تاکو سەیری ئەو ئەستێرانە بکەن کە بەسەر سەریانەوە دەخولێنەوە. لەبەر گەمژەیی خۆیان بەرلەوەی فێری شتێک بن، لە پێشدا دەپرسن داخۆ بەکەڵکی چی دێ. لەبەر گەمژەیی خۆیان پەرۆشی پوختەی مەسەلەکانن نەک وردەکارییەکان. لەبەر گەمژەیی خۆیان لە یەکدی دەچن و هتد..." سەرباری ئەوەی منیش چەند ساڵێک لەمەوبەر لە وڵاتەکەی خۆم زۆرم حەز بەو شێوازی قسەکردنە دەکرد، بوارم نەبوو هیچ بە خۆجە بڵێم. بۆخۆیشی لەو کاتانەدا منی بەلاوە گرینگ نەبوو، چونکە گری لە گەمژەکانی ئالاندبوو. گەمژەیی منیش جۆرێکی تر بوو. لە ڕووی چەنەبازی و لەوچەیی خۆمەوە لەو ڕۆژانەدا، خەونێکی خۆم بۆ گێڕایەوە: لە خەونمدا خۆی خستبووە جێی من و چووبووەوە بۆ وڵاتەکەم، لەگەڵ دەزگیرانەکەمدا زەماوەندی کردبوو و لە زەماوەندەکەدا کەس هەستی نەکردبوو ئەو من نیم. منیش دەستێک جلی تورکیم لەبەر کردبوو و لە گۆشەیەکەوە سەیری ئاهەنگەکەم دەکرد. لە ناوەڕاستی زەماوەندەکەدا لەگەڵ دایکم و دەزگیرانە شادمانەکەمدا ڕووبەڕوو بوومەوە. سەرباری

فرمێسکەکانم، کە لە خەو بێداریان کردمەوە، هیچ کامیان منیان نەناسییەوە، پشتیان تێ کردم و لێم دوورکەوتنەوە.

لەو سەروبەندەدا دوو جاران چوو بۆ کۆشکی والی. وا دیار بوو والی پێی خۆش نەبوو خۆجە دوور لە چاوی ئەو خۆی لە سوڵتان نزیک بکاتەوە. کەوتبووە لێپێچینەوەی: زۆر دواتر و پاش ئەوەی والی لە ئەستەنبوڵەوە بۆ تاراوگە دوورخرایەوە، ئەوسا خۆجە پێمی گوت والی پرسیاری منی کردووە و دەستووری داوە لێکۆڵینەوەم لەبارەوە بکرێ. ئەگەر ئەمەی زووتر بگوتایە، دەبوو من ڕۆژانی خۆم بە ترسی ژەهراویکردنەوە بگوزەراندبایە. سەرباری ئەوەش، هەستم دەکرد والی زیاتر بایەخ بە من دەدات وەک بە خۆجە. لێکچوونمان لەگەڵ خۆجە، لە خۆم زیاتر، والیی نیگەران دەکرد و ئەمەش ختووکەی شکۆی منی دەدا. وێ دەچوو ئەم لێکچوونەمان لەو کاتانەدا نهێنییەک بێ کە خۆجە هەرگیز نەخوازێ بیزانێ و ئازایەتییەکی سەیریش بە من ببەخشێ. هەندێک جار بیرم لەوە دەکردەوە تا خۆجە لە ژیاندا بێ، بەهۆی ئەم لێکچوونەوە من لە مەترسی دوور دەبم. ڕەنگە لەو سۆنگەیەشەوە بووبێ کاتێک خۆجە والیشی بە یەکێک لە گەمژەکان دانا، من بەرەنگاری بوومەوە. ئیدی ئەو لەو ساتانەدا هەڵدەچوو. پەی بردنم بەوەی ناتوانێ دەستم لێ هەڵبگرێ و هەمان کاتیش شەرم دەکات، پاڵی پێوە نام بەرەو بێ ئابڕووییەک کە تەنانەت بە خۆشم نامۆ بوو. بە پرسیارە یەک لەسەر یەکەکانم دەربارەی والی و قسەکانی ئەو لە بارەی هەردووکمانەوە، خۆجەم لە هەڵچوونێکدا نقوم دەکرد پێم وابێ خۆیشی نەیدەزانی هۆیەکەی چییە. لەو کاتەدا سەرسەختانە دەیگوت و دووبارەی دەکردەوە: "بەڕە لەژێر پێی والیش دەردێنن. یەنیچەرەکان بەم زووانە شتێک دەکەن، درکیشم بەچەند شتێک کردووە لە کۆشک نەخشەی بۆ دادەڕێژێ. بۆیە ئەگەر کار بۆ دروستکردنی چەکێک بکەم، وەک والی داوای دەکات، نامەوێ بۆ وەزیرێکی کاتیی بیکەم، بگرە پێویستە بۆ ئەوەی بیخەمە بەردەستی سوڵتان، دروستی بکەم."

ماوەیەک پێم وابوو هەموو کاتی خۆی بە نەخشەی ئەو چەکە نادیارەوە بەسەر دەبات. بەخۆم دەگوت هەوڵدەدات، بەڵام پێشوەچوونی بۆ ناکرێ، چونکە ئەگەر

پێشوەچوونی بۆ بکرایە، ئەوا دڵنیابووم، تەنانەت ئەگەر بۆ سووکایەتی پێکردنیشم بووایە، ڕای منی هەر وەردەگرت و بۆچوونەکانی خۆی بۆم ڕوون دەکردەوە. ئێوارەیەک، لە گەڕانەوەماندا لەو ماڵەی ئاکسەرای کە دوو سێ هەفتە جارێک ڕوومان تێ دەکرد و دوای گوێگرتن لە موزیک، لەگەڵ ژنەکاندا دەنووستین، خۆجە پێمی گوت بەنیازە تا بەیانی کار بکات. پاشان لە بارەی ژنەکانەوە پرسیاری کرد، قسەکردن لەبارەی ژنان شتێک بوو پێشتر هەرگیز نەمانکردبوو. دواتر لەپڕێ گوتی: "بیر دەکەمەوە." هەر کە گەیشتینە ماڵەوە، بێ ئەوەی بڵێ بیر لە چی دەکاتەوە، چووە ژوورەکەی و دەرگای لەسەر خۆی کلۆم دا. منیش ئیدی لەنێو کتێبەکانی خۆم، کە تەنانەت وزەی هەڵدانەوەی لاپەڕەکانیشیانم تێدا نەمابوو، مامەوە و بیرم کردەوە لە: هەر پرۆژەیەک کە من باوەڕم وابوو ناتوانێ پێشوەچوونی تێدا بکات، یان بیر و بۆچوونەکانی، یاخۆ سەیرکردنی بێهوودەی کاغەزەکانی سەر ئەو مێزەی هێشتا بەتەواوی ڕانەهاتبوو لە بەردەمیدا دابنیشێ، یان دانیشتنی ختوخۆڕاییی چەندین سەعاتەی بە شەرم و هەڵچوونەوە لەبەردەم مێزەکەدا...

درەنگانێکی دوای نیوەی شەو لە ژوورەکەی هاتە دەرێ. لەبەرئەوەی گرفتێکی بۆ هاتبووە پێش، وەک قوتابییەکی خاکی کە پێویستی بە هاوکاری بێ، بە شەرمەوە منی بانگ کرد بۆ بەردەم مێزی ژوورەکەی خۆی. بێ هیچ دوودڵی نواندێک گوتی: "هاوکاریم بکە، با پێکەوە بیریان لێ بکەینەوە، بەتەنیا پێشوەچوونم بۆ ناکرێ." لەبەر ئەوەی پێم وابوو ئەوەی دەیڵێ، پێوەندیی بە ژنانەوە هەیە، ساتێک بێدەنگ بووم. کاتێک بینی تەنیا سەیر دەکەم و هیچی تر، بە دەربەستەوە گوتی: "بیر لە گەمژەکان دەکەمەوە. بۆچی هێندە گەمژەن؟" دواتر، وەک ئەوەی وەڵامی من بزانێ، درێژەی دایێ و گوتی: "باشە، گەمژە نین، بەڵام مێشکیان لە شتێکی کەمە." من نەمپرسی "ئەوانە" کێن. گوتی: "ئەرێ شوێنێک لە مێشکیاندا نییە جێگای ئەو زانستانەی تێدا ببێتەوە؟" وەک ئەوەی بیەوێ بەدوای وشەیەکدا بگەڕێ، بۆ دەوروبەری خۆی ڕوانی: "پێویستە گۆشەیەک لە مێشکیاندا هەبێ بۆ جێگرکردنی شتومەکی تێکەڵ و پێکەڵی وەک قوتوو و چاوەکانی ئەم دۆڵابە، بەڵام پێ دەچێ شتی وایان نەبێ. تێ دەگەیت؟" دەمویست باوەڕ بەخۆم بهێنم کە شتێک تێ گەیشتووم،

بەڵام زۆر سـەرکـەوتـوو نـەبووم. هـەردووکـمـان مـاوەیەکی درێژ بێـدەنگ بووین. لە کۆتاییـدا گوتی: "جا کێ دەزانـێ مرۆڤ بۆچی بەم شـێـوەیە یاخـۆ بەجـۆرێکی ترە؟" دواترێ گـوتـی: "ئاخ، خـۆزگـە بـەڕاسـتی پزیشک دەبـوویت و منت فـێـر دەکـرد جەسـتـەمـان چییـە و چی لە بەدەن و کەللەمـاندا هەیە." وا دەهـاتە بەرچاو کەمێک شـەرم بکات. لەبەرئەوەی نـەیدەویست بمـتـرسـێنێ، بەشـێـوەیەکی سـروشـتـی ڕای گـەیاند: "لەوانـە نیـم خـۆم بەدەسـتـەوە بـدەم و تا کـۆتـایی بـەردەوام دەبم. هەم لەبـەرئەوەی پەرۆشـی زانینـی ئاکـامم و هەم بەهـۆی ئەوەی شـتـێکی تر شک نـابەم بیکەم." من تێ نەدەگەیشتم، بەڵام بسکەی سمێڵم دەهات کاتێک بیرم دەکردەوە کە هەموو ئەو شتانە لە منەوە فێر بووە.

لە کـاتەکـانی دواتردا وەک ئەوەی هـەردووکـمـان بزانین واتـای ئەم قسـەیە چییـە، لەسـەریەک دووبارەمـان دەکردەوە. لەم بڕیارگـرتنەی خـۆیدا وەک قوتابییەکی خـەیاڵ فراوان، کـە پرسـیاری زۆر دەکات، خـۆی دەنواند. هەر جـارێک کە دەیگوت تا کۆتایی بەدوای ئەم کـارەوە دەبم، من وا هـەسـتم دەکرد بینـەری ناڵینی هەڵچـوو و غـەمگینی ئەڤینداری‌کی دەستـەوستـانم کە لە هۆکاریی ئەو نەهامـەتییـانەی بەسـەری هاتووە، دەپرسـێ. لەو مـاوەیەدا ئـەو قـسـەیەی زۆر دەگـوتەوە. کـاتێک بەخـۆ سـازدانی یەنیچـەرەکانی بۆ یاخیبوون دەزانـی، دەیگوتەوە. دوای ئەوەی بۆ منی دەگێڕایەوە کە منداڵانی دەرسخانە زیاتر پـەرۆشـی فریشتەن نەک ئەستێرە، دەیگوتەوە. پاش کڕینی دەسـتنووسـێک بە چەردەیەک پـارە و بەرلەوەی لـە خـوێندنەوەیدا بگاتـە نیـوەی، بە توڕەبـوونەوە تـووڕی دەدایە لاوە، دەیگوتەوە. دوای گـەڕانەوەی لای دۆسـتـەکـانی مووەقیـتخـانە، کە ئیـدی وەک خـوویەک سـەری لێ دەدا، دەیگوتـەوە. پاش خـواردنی سـەرمـا لـە گـەرمـاو بەهـۆی باش گـەرم نـەکـردنی و دوای ئـەوەی لەپاڵ کـتـێـبـە خۆشـەویستـەکانیدا لەسەر لێفە بە گوڵ نەخشـێندراوەکە پاڵ دەکەوت و پاش ئەوەی لە حـەوشـەی مـزگـەوت گـوێی لە قـسـەی توڕەهاتـی دەسـتنوێژ هەڵگران دەگـرت، دەیگوتەوە. دوای ئەوەی بیستی ڤینیسیاییەکان ڕەوە کەشتیی ئەمانیان بەزاندووە و پاش ئەوەی بەدان بەخۆداگرتنەوە گوێی بۆ خەڵکی گەڕەک ڕادەگرت کە پێیان دەگوت وا خـەریکە تەمـەنی بەسـەر دەچێ و بۆ ئەوە هاتوون تاکـو هانی بـدەن ژن بهـێنێ، دیسان دەیگوتەوە: تا کۆتایی بەدوای ئەم کارەوە دەبم.

ئێستا بیر دەکەمەوە: کام خوێنەر لەوانەی ئەم نووسراوەم تا کۆتایی دەخوێنێتەوە و بە دان بەخۆداگرتنەوە بەدوای ڕووداوەکان یان هەر شتێکدا دەچێ کە بە خەیاڵ گێڕاومەتەوە، دەتوانێ بڵێ خۆجە پابەندی ئەم بەڵێنەی خۆی نەبوو؟

# 4

ڕۆژێکی کۆتاییی بەهار بیستمان تەرمی حوسێن ئەفەندیی گەورەی ئەستێرەناسان لە نزیک ناوچەی ئیستینیەی قەراغ تەنگەی بوسفۆر دۆزراوەتەوە. کەواتە والی لەدوا ساتدا فەتوای کوشتنی دەرکردبوو. ئەویش ئەوە نەبوو سەر کز بکات و لە حەشارگەکەی خۆیدا ئارام بگرێ، بگرە بەڕاست و چەپدا نامەی دەنارد و دەینووسی نیشانەی مردنی والی سادق پاشا لەم زووانەدا دەرکەوتووە. بەمجۆرە، حوسێن ئەفەندی شوێنی خۆی ئاشکرا کردبوو. هەوڵی دابوو ڕوو لە ئەنادۆڵ بکات، بەڵام پیاوکوژان خۆیان گەیاندبووە بەلەمەکەی و خنکاندبوویان. خۆجە کاتێک زانی دەست بەسەر ماڵ و سامانی گەورەی ئەستێرەناساندا گیراوە، کەوتە خۆ بۆ بەدەستهێنانی کاغەز و کتێب و دەفتەرەکانی. بۆ ئەمەش، هەرچی پارەیەک کۆی کردبووەوە، دای بە بەرتیلخۆران. ئێوارانێکی درەنگ سندووقێکی گەورەی بۆ ماڵەوە هێنایەوە و بە هەفتەیەک هەزاران لاپەڕەی ناو سندووقەکەی خوێندەوە. لە ئاکامدا بە هەڵچوونەوە گوتی شتی زۆر باشتر لەوانەی لە دەست دێ.

کاتێک دەستی کرد بە کار، منیش هاوکاریم کرد. بۆ دوو کتێب بەناوی "حیاة الحیوان وعجائب المخلوقات" کە بڕیاری دابوو پێشکەش بە سوڵتانیان بکات، من باسی ئەو ئەسپە جوان و گوێدرێژە ئاسایی و کەروێشک و مارمێلکانەم بۆ گێڕایەوە کە لە باخچەی فراوان و مێرگی ماڵەکەی ئەمپۆلیماندا بینیبووم. بەدوای ئەوەدا کە خۆجە بە ئاماژەیەک لە سنوورداربوونی بیرەوەرییەکانم منی ئاگادار کردەوە، بۆقە فەرەنگییە سمێڵدارەکانی ناو حەوزە نیلوفەرییەکەمان، تووتییە شینەکانمان کە

بەشێوازی سیسیلیایی قسەیان دەکرد و ئەو سمۆرانەم بیر کەوتەوە کە بەر لە جووتبوونیان بەرامبەر بەیەک دادەنیشتن و تووکی یەکتریان دەلێسایەوە. هەموو ئەمانەم بۆی گێڕایەوە. ژیانی مێرووله کە زۆر مایەی بایەخ پێدانی سوڵتان بوو، بەڵام بەهۆی پاک و خاوێنیی لە ڕادەبەدەری حەوشی یەکەمی کۆشکەوە وەک پێویست زانیاریی لەبارەوە نەبوو، بوو بە یەکێک لە بەشەکانی کتێبەکە و ماوەیەکی درێژ کارمان لەسەر کرد.

کاتێک خۆجە دەستی کرد بە نووسینەوەی ژیانی ڕێکوپێک و لۆجیکداری مێرووله، پێشبینیی دەکرد ئێمە لە هەمان کاتدا سوڵتان پەروەردەش دەکەین. بۆ ئەو مەبەستە، باسکردنی مێروولەی ڕەشی ناسراوی بەلای ئێمەوە بەکەم زانی و باسی چۆنیەتیی نەزمی مێرووله سوورەکانی ئەمەریکای گێڕایەوە. ئەمەش بیرۆکەی ئەوەی پێ بەخشی کتێبێکی هەم غەمگین و هەم سوودبەخش لەبارەی بەسەرهاتەکانی خەڵکی خۆجێی ئەو وڵاتە پڕ لە مارەی کە ئەمەریکای پێ دەگوترێ، بنووسێ، ئەو خەڵکە دەبەنگەی کە بەسەرهاتەکان هیچ شتێکی لە ڕەوتی ژیانیان نەگۆڕیبوو. بەدەم گێڕانەوەی وردەکارییەکانەوە، گوتی باسی ئەو پاشا منداڵەش دەنووسم کە چۆن لەبەرئەوەی بایەخی بە زانست نەدەدا، گاورەکانی ئیسپانیا لە ئاکامدا لەسەر مێخرنجیر دایاننیشاند. بەڵام خۆجە هەرگیز زاتی نەکرد کتێبەکە تەواو بکات. نیگارەکانی ئەو وەستای میناتۆرەی کە بانگمان کردبوو وێنەی گامێشی باڵدار و گای شەشپێ و ماری دووسەرمان بەشێوەیەکی بەرجەستە بۆ بکێشێ، جێی ڕەزامەندیمان نەبوو. خۆجە گوتی: "ڕاستی لە ڕابردوودا بەوجۆرە بوو، بەڵام ئێستا هەموو شتێک سێ دووری و سێبەری ڕاستەقینەی هەیە. تۆ بڕوانە؛ تەنانەت مێروولەیەکی زۆر ئاسایی، وەک ئەوەی هاوجمکی خۆی بەدوای خۆیدا ڕابکێشێ، سێبەری خۆی هەڵگرتووە و لەسەرخۆ دەیگوازێتەوە."

لەبەرئەوەی سوڵتان هیچ لێی نەپرسییەوە، بڕیاری دا کتێبەکان لە ڕێی والییەوە پێشکەش بە سوڵتان بکات، بەڵام دواتر زۆر لەمە پەشیمان بووەوە. والی گوتبووی: "ئەستێرەناسی سۆفیگەرییە، حوسێن ئەفەندی دەستی دابووە کاری باڵاتر لە بەژنی خۆی و دەستی کردبوو بە فرت و فێڵی سیاسی. ئێستاش گومانم هەیە تۆ چاوت لە

جێی ئەو بریبێ. من بڕوام بە شتێک هەیە کە زانستی پێ دەگوترێ. ئەمەش پێوەندیی بە چەکەوە هەیە نەک ئەستێرە. ئەستێرەناسی کارێکە نەگبەتیی بەدواوەیە. ئەمەشم لەوەوە بۆ دەرکەوتووە کە هەموو ئەوانەی چوونەتە ئەو کارەوە، یان کوژراون، یاخۆ لە هەمووی خراپتر، ڕۆژێک لە ڕۆژان بەشێوەیەکی نهێنی بێ سەروشوێن کراون، بۆیە بەهیچ جۆرێک نامەوێ تۆ، کە زۆرم خۆش دەوێیت و باوەڕم بە زانستەکەت هەیە، ئەو ئەرکە بگریتە ئەستۆ. بڕیار وایە پۆستی گەورەی ئەستێرەناسان بدرێ بە سدقی ئەفەندی کە بەشی ئەوە گەمژە و ساویلکەیە بتوانێ پێداویستییەکانی ئەو ئەرکە بەجێ بگەیەنێ. بیستوومە دەستت بەسەر کتێبەکانی گەورەی ئەستێرەناسانی پێشوودا گرتووە. داوات لێ دەکەم خۆت لە قەرەی ئەو کارە نەدەی." خۆجەش گوتبووی لە زانست بترازێ، خۆی بەهیچ شتێکی ترەوە خەریک ناکات و پاشان ئەو کتێبانەی دابوویێ کە دەیویست بە سوڵتانی بگەیەنێ. ئێوارە لە ماڵەوە گوتی لە زانست بترازێ، خۆی بەهیچ شتێکی ترەوە سەرقاڵ ناکات، بەڵام هەرچییەک لەپێناوی پەیڕەوکردنی زانستەکەیدا پێویست بێ، دەیکات. وەک سەرەتای کاریش، نەفرەتی لە والی کرد.

مانگی دواتر، کاتێک پەرۆشی زانینی چۆنیەتیی کاردانەوەی سوڵتانی منداڵ بووین لە بەرامبەر ئاژەڵە ڕەنگاوڕەنگەکانی زادەی خەیاڵی ئێمەدا، خۆجە بیری لەوە دەکردەوە بۆچی دەبێ تا ئێستا لە کۆشکەوە بانگ نەکرابێ؟ لە ئاکامدا بۆ ڕاو بانگیان کرد. پێکەوە چووین بۆ کۆشکی میراخۆڕ لە کەناری چەمی کاغەزخانە بۆ ئەوەی ئەو لە تەنیشت سوڵتانەوە بێ و منیش لە دوورەوە سەیری بەزمی ڕاو بکەم. زۆر قەرەباڵغ بوو. سەرکردەی پاسەوانەکان هەموو شتێکی ئامادە کردبوو. هەموومان بینیمان چۆن کەروێشک و ڕێوی بەرەڵا کران و تاژییەکان نیشتنە سەریان. سەرجەم چاوەکان بینییان چۆن یەکێک لە کەروێشکەکان لە هاوڕێکانی جیابووەوە و خۆی هەڵدایە ئاوەکەوە. بە مەلە خۆی گەیاندە ئەوبەری ئاوەکە و بینیمان و گوێمان لێ بوو پاسەوانەکان ویستیان لەوێش سەگی تێ بەردەن، بەڵام سوڵتان مۆڵەتی نەدا و گوتی: "با کەروێشکەکە ئازاد بێ." سەگێکی بیانی لەوبەر ئاوەکەوە بوو، کەروێشکەکە دیسانەوە خۆی هەڵدایەوە ناو ئاوەکە، بەڵام سەگەکە

فریای کەوت و گرتی. پاسەوانەکان دەستبەجێ خۆیان گەیاندێ و کەروێشکەکەیان لە دەمی دەرهێنا. هێنایانە بەردەمی سوڵتانی منداڵ. ئەویش یەکسەر کەروێشکەکەی پشکنی و دڵخۆش بوو بەوەی کە برینی سەختی پێوە نەبوو. پاشان دەستووری دا ببرێتە سەر شاخ و لەوێ ئازاد بکرێ. دواتر، ئاپۆرەیەک کە خۆجە و گرگنە قژ سوورەکەشم لە ناویاندا بینی، لە دەوری سوڵتان گردبوونەوە.

خۆجە، ئێوارە بۆمی گێڕایەوە: سوڵتان پرسیاری چۆنیەتیی لێکدانەوەی ڕووداوەکەی کردبوو. خۆجە، کە دوای هەمووان نۆرە هاتبووە سەر ئەو، گوتبووی لە شوێنی چاوەڕوان نەکراوەوە دوژمن بۆ سوڵتان پەیدا دەبێ، بەڵام بێ دەرد و بەڵا لەو مەترسییە دێتە دەرێ. ئاپۆرەکە، هەوڵیان دابوو لێکدانەوەکەی خۆجە لەبەرئەوەی باس لە دوژمن و مەترسیی مردن دەکات و تەنانەت سوڵتان لەگەڵ کەروێشکێکدا بەراورد دەکات، خراپ لە سوڵتان بگەیەنن، بەڵام سوڵتان هەموویانی، بە سدقی ئەفەندیی گەورەی ئەستێرەناسانیشەوە کە لە ناو ئاپۆرەکەدا بووە، بێدەنگ کردووە و گوتوویەتی قسەکانی خۆجە دەکات بە گوارە و لە گوێیان دەکات. پاشان بەدەم سەیرکردنی نیشتنەوەی چەند بازێکەوە بەسەر قەلەڕەشێکەوە و بینینی کۆتاییی غەمگینی ڕێوییەک کە بەهەموو تواناوە بەرگریی لە خۆی دەکرد و لە ئاکامدا تاژییە بێ شەرمەکان لەتوپەتیان کرد، سوڵتان گوتبووی شێرەکەی دوو بەچکەی بووە، یەکێکیان نێرە و ئەوی تریان مێیە و هەردووکیشیان هاوکێشی یەکترن و کتێبەکانی ئاژەڵانیشی زۆر بەدڵ بووە. پرسیاری ئەو گا باڵ شینانە و پشیلە پەمەییانەی کردبوو کە لە مێرگەکانی قەراغ ڕووباری نیلدا بیندراون. خۆجە بەشێوەیەکی سەیر مەستی سەرکەوتن بوو و لە هەمان کاتیشدا ترسی لێ نیشتبوو.

ماوەیەکی زۆر دوای ئەوە هەواڵمان زانی چەند شتێک لە کۆشکدا ڕوویان داوە: سوڵتان کوێسەم دەستی لەگەڵ ئاغاکانی یەنیچەرەدا تێکەڵ کردووە و نەخشەیەکی داڕشتووە بۆ بە کوشتدانی سوڵتان و دایکی و دانانی شازادە سلێمان لە جێی سوڵتان، بەڵام هەوڵەکەی سەری نەگرتووە. دەست خرابووە بیناقاقای سوڵتان کوێسەم تا خوێن لە دەم و لووتی هاتبوو و مردبوو. خۆجە هەواڵی ڕووداوەکانی لە میانەی قسە و قسەڵۆکی ئەو هاوڕێ گەمژانەیەوە پێ دەگەیشت کە دەچوونە

مووەقیتخانە. جاروباریش دەچووە دەرسخانە، وەکو تر ڕووی لە هیچ شوێنێکی دی نەدەکرد.

لە پایزدا بیری کردەوە جارێکی تر بیردۆزەی کۆسمۆگرافی بگرێتەوە دەست، بەڵام تووشی نائومێدی بوو: ڕوانگەخانەیەک پێویست بوو. دەشیگوت هەروەک چۆن گەمژەکان قرۆشێک بە ئەستێرە نادەن، ئەستێرەکانیش هیچ بایەخێک بۆ ئەوان دانانێن. زستان هات و تەم ڕۆژگاری داگرت. ڕۆژێک بیستمان والی لە کار دوور خراوەتەوە. ویستبوویان ئەویش بخنکێنن، بەڵام دایە سوڵتان ڕازی نەبووبوو. دەست بەسەر ماڵ و موڵکیدا گیرابوو و خۆیشی بۆ ئەرزنجان دوور خرابووەوە. دواتر جگە لە هەواڵی مردنی، هیچ دەنگوباسێکی تری ئەومان پێ نەگەیشتەوە. خۆجە گوتی ئیدی لە کەس ناترسێ و قەرزاری هیچ کەسێکیش نییە. نەمزانی داخۆ لەو کاتەدا بیری لەوە کردووەتەوە کە زۆر شت لە منەوە فێر بووە یان نا؟ ئیدی نە لە منداڵەکە دەترسا و نە لە دایکی. وەک ئەوەی دروشمی: "یان گەیشتن بە لوتکەی دەوڵەت، یان مرداربوونەوە وەک قەلەڕەشکە"ی بەرز کردبێتەوە! بەڵام لە ماڵەوە بە بێدەنگی لە ناو کتێبەکانماندا دادەنیشتین و لەبارەی مێرووڵە سوورەکانی ئەمەریکاوە دەدواین و خەیاڵاتی مێرووڵەنامەیەکی نوێمان دادەڕشت.

ئەو زستانەشمان وەک زۆری پێشووتر و دواتر لە ماڵەوە بەسەر برد. هیچ شتێک نەقەوما. لە شەوانی سارددا، لە نهۆمی خوارەوەی ماڵەکە کە بای باکور لە دەرگا و پەنجەرەکانەوە خۆی پێدا دەکرد، دادەنیشتین و قسەمان دەکرد. چی دی بە چاوی سووک بۆمی نەدەڕوانی، یاخۆ وای نیشان دەدا کە بەوجۆرە بۆم ناڕوانێ. من ئەم نزیکبوونەوەی ئەوم بەوەوە گرێ دەدا کە نە لە کۆشک و نە لە دەوروبەری کۆشک کەس منەی نەدەکرد. جاروباریش بیرم دەکردەوە کەوا ئەویش وەک من لێکچوونی نێوانمان دەبینێ. بەخۆم دەگوت ئیدی کاتێک سەیری من دەکات، خۆی دەبینێ و بە پەرۆش بووم بزانم لەو ساتانەدا بیر لە چی دەکاتەوە. کتێبێکی تری درێژمان لەسەر ئاژەڵان تەواو کردبوو، بەڵام لەبەرئەوەی والی دوور خرابووە و خۆجەش دەیگوت ئامادە نییە بۆنی دەمی ئەو ناسیاوە دوورانەی بکات کە هاتوچۆی کۆشک دەکەن، کتێبەکە هەروا لەسەر مێزەکە کەوتبوو. جاروبار، لە بێزاریی ڕۆژانی بێکاریمدا،

لاپەڕەکانیم هەڵدەدایەوە و سەیری نیگاری ئەو کوللە مۆر و ماسییە فریوانەم دەکرد کە خۆم کێشابوومن و بە پەرۆش بووم بزانم سوڵتان لە کاتی خوێندنەوەی ئەم دێرانەدا بیر لە چی دەکاتەوە.

سەرەتای بەهار ئینجا خۆجە بانگ کرا. سوڵتانی منداڵ بە بینینی زۆر کەیفخۆش بووبوو. بە گوێرەی قسەکانی خۆجە، لە سەرجەم ڕەفتار و گوتاریەوە بۆی دەرکەوتبوو ماوەیەکی درێژە بیری لە خۆجە کردووەتەوە، بەڵام بەهۆی پاڵەپەستۆی گەجەر و گوجەری دەوروبەریەوە لەدووی نەناردووە. سوڵتان یەکسەر قسەی بردبووەوە سەر پیلانەکەی نەنکی و گوتبووی خۆجە پێشبینیی ئەم مەترسییەی کردووە، بەڵام هەمان کات پێشبینیی ئەوەشی کردووە کە سوڵتان بە سەلامەتی لەو مەترسییە ڕزگاری دەبێ. سوڵتان، ئەو شەوە هیچ لەو هەرا و هوریایە نەترساوە کە بەنیازی لەناوبردنی ئەو ساز کراوە، چونکە ئەو سەگە ناپاکەی بیر کەوتبووەوە کە ددانەکانی کاریان لە کەروێشکەکە نەکردبوو. سوڵتان، دوای پیاهەڵدان و ستایشکردن، دەستووری دابوو لە شوێنێکی گونجاو کێڵگەیەک بدرێ بە خۆجە. بەرلەوەی کار بە فاڵگرتنەوە بکات، خۆجە ناچار بووبوو بێتە دەرەوە. پێشیان گوتبوو دەبێ بۆ بەراتی کێڵگەکە تا کۆتاییی وەرزی هاوین چاوەڕێ بکات.

خۆجە لە ماوەی چاوەڕوانیکردندا و بە پشتبەستن بە داهاتی کێڵگەکەی، نەخشەی دارشت بۆ دامەزراندنی ڕوانگەخانەیەکی بچووک لە باخچەکەدا. پێوانەکانی ئەو چاڵەی دەبوو هەڵبکەندرێ و تێچوونی ئەو ئامێرانەی پێویست بوو جێگیر بکرێن، حساب کرد، بەڵام ئەمجاریان هەر زۆر زوو بێزار بوو. لەو سەروبەندەدا دەستنووسێکی بە هێڵێکی ناخۆش نووسراوی کتێبێکی دۆزییەوە کە ئەنجامەکانی چاودێریکردنی ئەستێرەکانی لە لایەن سۆفی تەقیەدینەوە لەخۆ گرتبوو. دوو مانگی خۆی بە پشکنینی ڕاستی و دروستیی چاودێریکردنەکانەوە بە خەرج دا، بەڵام لەبەرئەوەی بۆی ئاشکرا نەبوو کام هەڵە لە ئامێرە هەرزانبەهاکانی خۆی و کامیان لە تەقیەدین خۆی و کامیان لە بێ سەروبەرەییی کتێبە دەستخەت ناخۆشەکەوە سەرچاوەی گرتووە، لە ئاکامدا بە هەڵچوونەوە دەستی لە کار هەڵگرت. ئەو شتەی زیاتر ڕقی هەستاند، ئەو بەیتە قافیەدار و هاوکێشانە بوون کە بە شێوازی

شەشـەوانە حساب کرابوون و لە لایەن یەکێک لە خاوەنەکانی پێشووتری کتێبەکەوە خزێندرابوونە نێـوان خشـتـەی سێگۆشـەییی هێڵـەکـانەوە. خـاوەنـی کـتـێـبـەکـە بە بەکارهێنانی حسابی ئەبجەد و بە گرتنەبەری شێوازی تر، چەند بۆچوونێکی سادەی سـەبارەت بە داهـاتووی جیـهـان خسـتـبـووە ڕوو: بەو پێیـە دەبوو کـابرا لە ئاکـامـدا و لەدوای چوار کچ، کوڕێکی ببێ و پەتایەک بڵاو ببێتـەوە کە بێتاوانان لە گوناهکاران جیـا بکاتەوە و بەهـائەدین ئەفەندیی هـاوسێشـی بمرێ. خۆجە ئەگـەرچی لە سـەرەتاوە کەیفی بە خـوێندنەوەی ئەو فالانە دەهـات، بەڵام دواتر دووچاری نائومێدی بوو. ئیدی بە بـاوەڕ بـەخـۆبوونێکـی سـەیر و ترسـنـاکـەوە باسـی ناواخـنـی مـێـشـکـمـانـی دەکـرد. بەجۆرێک دەدواین وەک ئەوەی باسی سندووقگەلێک کە بتوانین سـەریان هەڵبدەینەوە و سەیری ناویان بکەین، یاخۆ باسی دۆڵابەکانی ناو ژوورەکە بکەین.

ئەو کێڵگەیەی کە سـوڵتان دەسـتووری دابوو بدرێ بە خۆجە، نە لە کۆتاییی هـاوین و نە لە سـەرەتای زسـتاندا بەناویـەوە نەکرا. لە بەهـاریشدا پێیـان گوتبـوو تۆمـارێکی نوێی بۆ دەکرێ و دەبێ چاوەڕێ بکات. لەو ماوەیەدا، ئەگەر جاربەجاریش بووایە، بۆ کۆشک بانگ دەکرا و وەڵامی پرسیارەکانی سوڵتانی لەمەڕ لێکدانەوەی پەیدابوونی درزێک لە ئـاوێنەدا، برووسکـەیەکی سـەوز کـە لە قـەراغ دووڕگـەی یاسـیـادای داوە، وردوخاشبوونی سوراحییەکی ڕەنگ سووری خوێنینی پڕ لە ئاوی گێلاس لە شوێنی خـۆی و لەبارەی ئاژەڵەکانی ناو دواین کتێبی ئێمـەی دەدایەوە. کاتێک دەهـاتەوە بۆ ماڵـەوە، دەیگوت منداڵەکە گەیشـتووەتە قۆناغی پێگەیشـتن. ئـەمەش باشـترین قۆنـاغە بۆ کاریگەری دانان لەسەر مرۆڤ و دەیگوت سوڵتان دەخاتە ناو لەپی دەستییەوە.

بۆ ئەو مـەبەسـتـە دەسـتـی بە نووسـیـنـی کـتـێـبـێکی سـەرلەبەر نوێ کـرد. لە منەوە کۆتاییی ئازتیکەکان و بیرەوەرییەکانی کۆرتێزی بیسـتبـوو، هەر لە سـەرەتاشـەوە چیرۆکی ئەو پاشـا منداڵە بەلەنگازەی لە خـەیاڵدا بوو کە بەهـۆی پشـتگوێ خسـتنی زانسـتـەوە لەسـەر مێخـزنجیـر دانیشـێندرابوو. ئەو مـاوەیە لە بارەی کەسـانێکی بێ ناموسـەوە قسـەی دەکرد کە بە تۆپ و ئامێری جەنگ و ئەفسانە و چەکەوە لە کاتی خـەودا پەلاماری مرۆڤە باشـەکانیان داوە و ناچاریان کردوون سەر بۆ نەزمی ئەمـان دابنەوێنن، بەڵام ماوەیەکی درێژ ئەو شتانەی لە من شـاردەوە کە خەریکی نووسینیان

بوو. پێم وابوو چاوەڕێی سەرنجی منی دەکرد، بەڵام تاسەی نیشتمانەکەم کە لەو ڕۆژانەدا لەپڕ بەرەو نائومێدییەکی قووڵ بەکێشی کردبووم، ڕقی منی لە بەرامبەر خۆجە ئەستوورتر کردبوو. پەرۆشیی خۆم جڵەو کرد و توانیم لە بایەخ نەدان بەو ئامانجانەی کە بە زیرەکیی خۆی و بە پشتبەستن بە خوێندنەوەی چەند کتێبێکی شڕ و هەرزانبەها و بە گێڕانەوەکانی من بەدەستی هێنابوو، سەرکەوتوو بم. بەمجۆرە، بە شادمانییەوە بینیم چۆن ڕۆژ بە ڕۆژ، سەرەتا متمانەی بەخۆی و دواتر بەو شتە نەما کە سەرقاڵی نووسینی بوو.

دەچووە ژوورە بچووکەکەی سەرەوە کە کردبووی بە ژووری کاری خۆی. لەبەردەم ئەو مێزە دادەنیشت کە من بە دروستکردنم دابوو، بگەرە بیریشی دەکردەوە، بەڵام نەیدەتوانی بنووسێ. هەستم دەکرد ناتوانێ بنووسێ. دەمزانی هەتا ڕای من لە بارەی بۆچوونەکانی خۆیەوە نەزانێ، ناوێرێ بنووسێ. ئەوەی وای لێ دەکرد متمانەی بەخۆی نەبێ، هەر کەموکوڕیی بۆچوونە سادەکانی من نەبوو کە بەلای ئەوەوە مایەی ڕق لێبوونەوە بوون. ئەو لە ڕاستیدا دەیویست زانستەکانی من، بیرکردنەوەی "ئەوانە"ی کە ئەو هەموو زانستەیان فێری من کردبوو و قوتوو و چاوی زانستیان لە مێشکی مندا چەسپاندبوو، فێر ببێ. گەلۆ ئەوانە لە ڕەوشێکی وەک ئەوەی ئەمدا چۆن بیر دەکەنەوە؟ ئەمە ئەو پرسیارە بوو کە دەیویست ژیانی خۆی لەپێناودا دابنێ و لە منی بکات، بەڵام ئەوە بوو نەیدەکرد! ئای چەندە چاوەڕێم کرد پێ بە جەرگی خۆیدا بنێ و ڕاست و مەردانە ئەو پرسیارەم لێ بکات! بەڵام نەیپرسی. دوای ماوەیەک دەستی لەو کتێبە هەڵگرت، جا نازانم تەواوی کرد یان نا. سەرلەنوێ گەڕایەوە سەر بەزمی "گەمژەکان". دەیگوت پەیڕەوکردنی زانستی ڕاستەقینە بە تێگەیشتن لە هۆی گەمژەیی ئەواندا تێ دەپەڕێ، بە زانینی هۆی ئەوەی بۆچی مێشکیان وایە و پاشان بیرکردنەوە لەبەر ڕۆشنایی بەرئەنجامەکانیدا! بەخۆم دەگوت لە نائومێدیدا هەمان شت کاوێژ دەکاتەوە، چونکە لە کۆشکەوە ئاماژەی بانگهێشتی چاوەڕوانکراوی پێ نەدەگەیشت. کات بەفیڕۆ دەچوو. قۆناغی باڵقبوونی سوڵتانیش بە کەڵکی هیچی ئەوتۆ نەدەهات.

بەڵام هاوینی بەر لە گەیشتنی کۆپرولو مەمەد پاشا بە پلەی باشوەزیر، خۆجە لە

ئاكامدا بە کێڵگەکەی شاد بوو و بەدڵی خۆی شوێنێکی هەڵبژارد. داهاتی دوو ئاشی ئاوی دەوروبەری گەبزە و داهاتی دوو گوندی سەعاتە ڕێیەک دوور لە شارۆچکەکەی بۆ دیاری کرابوو. لە وادەی بەروبووم کۆکردنەوەدا چووین بۆ گەبزە و هەمان خانووە کۆنەکەی پێشوومان بەکرێ گرت کە بەرێکەوت چۆڵ کرابوو. بەڵام خۆجە ئەو مانگانەی لەوێمان بەسەر بردبوو و ئەو ڕۆژانەی من مێزەکەم لای دارتاش هێنایەوە و ئەو نەفرەتی لێ دەکرد، هەمووی لە بیر کردبوو. وا دیار بوو بیرەوەرییەکانی ئەمیش وەک ماڵەکە کۆن و دزێو بووبن. تووشی بێ ئۆقرەییەکیش بووبوو کە بواری پێ نەدەدا خۆی بەهیچ شتێکی ڕابردووەوە خەریک بکات. چەند جارێک سەردانی گوندنیشنەکانی کرد و کاروبارەکانی بەسەر کردەوە. بڕی داهاتەکانی ساڵی پێشووی بۆ ئاشکرابوو، ئاشکراشی کرد لەژێر کاریگەریی ئەحمەد پاشای تەرخونچوودا کە ئەم ناوەکەی لە دۆستەکانی خۆیەوە لە مووەقیتخانە بیستبوو، فێری شێوازێک بووە بۆ تۆمارکردنی بڕی داهاتی کێڵگەکەی بەجۆرێکی سادە و شیاوی تێگەیشتن.

بەڵام بەم داهێنانەشەوە کە نە باوەڕی بە ڕەسەنایەتی و نە بە سوودەکانی هەبوو، ڕانەوەستا، چونکە دانیشتنەکانی شەوانەی لە باخچەی پشتی ماڵەوە و ڕوانینی بۆ ئاسمان سەرلەنوێ خولیای گەردوونناسیی تێدا زیندوو کردبووەوە. جارێکیان منیش زاتم خستە بەر، چونکە پێم وابوو دەتوانێ بیر و ڕامانی خۆی هەنگاوێک ببات پێشەوە، بەڵام ئەو نیازی چاودێریکردن یاخۆ بەرهەمهێنانی ئەقڵی نەبوو. منداڵان و هۆشمەندترین ئەو گەنجانەی لە گوندەکە و لە گەبزە دەیناسین، بۆ ماڵەوە بانگ کرد و پێیانی ڕاگەیاند فێری بەرزترین زانستیان دەکات. منی ناردەوە بۆ ئەستەنبوڵ بۆ هێنانی میناتۆر و زەنگەکان و ئەویش دەستێکی پێدا هێنانەوە و چەوری کردن و لە باخچەکەدا بۆ میوانەکانی دامەزراند. ئێوارانێک، بەهێز و بە ئومێدێکی زۆرەوە، کە من نەمتوانی تێ بگەم لە کوێوە سەرچاوە دەگرێ، بە جۆش و بێ پێوەنان ئەو بیردۆزانەی ئاسمانی دووپات کردەوە کە پێشتر بۆ والی و دواتر بۆ سوڵتانی شی کردبووەوە. ڕۆژی دواتر لەبەر دەرگای ماڵەکەماندا دڵی کونکونی مەڕێکمان دۆزییەوە کە هێشتا خوێنی لێ دەچۆڕا. ئەمە بەس بوو بۆ ئەوەی بۆ دواجار هیوای خۆمان لە

گەردووناسی و ئەو ئاپۆڕەیەش ببڕین، کە بێ ئەوەی تەنانەت یەک پرسیاریش بکەن، لە نیوەی شەودا بڵاوەیان لێ کرد و هەرکەس بۆ ماڵە خۆی گەڕایەوە.

بەڵام ئەم دۆڕانەشی زۆر گەورە نەکردەوە و بەسەر خۆیدا نەهێنا. پێی وابوو ئەوانە کەسانێک نین لە خولانەوەی زەوی و ئەستێرەکان تێ بگەن و پێویستیش ناکات لەم کاتەدا تێ بگەن. ئەوەی دەبوو لەم بابەتە تێ بگات، کەسێک بوو کە لە دەورانی باڵقبووندا بوو. لەوانەیە لە ئامادە نەبوونماندا منەمانی کردبێ. کەچی ئێمە وا خەریکە لێرە لەپێناوی بەدەست خستنی چوار پێنج قروشی دوای کۆکردنەوەی بەروبووم ئەو هەلە لە دەست خۆمان دەدەین. یەکسەر دوای ئەوەی کاروبارەکانی خۆمان جۆر کرد، یەکێک لە لاوە هۆشمەندەکان، کە بە ڕواڵەت هۆشمەندترینیان بوو، بە سەرپاڵە ڕاگرت و خۆمان گەڕاینەوە بۆ ئەستەنبوڵ.

سێ ساڵی دوای ئەوە لە ڕیزی خراپترین ساڵەکانی ئێمەدا بوون. هەر ڕۆژێک و مانگێک و وەرزێک کە بەسەرمان دەبرد، دووبارەبوونەوەیەکی بێزار و وەڕەسکەری ڕۆژ و مانگ و وەرزی پێشووی خۆیان بوون. بەدەم دەرد و نائومێدییەوە هەمان شتەکانی پێشوومان دەبینییەوە و وەک ئەوە وابووین چاوەڕێی دۆڕانێکی ناو لێ نەنراو بکەین. دیسان ناوبەناو لە کۆشکەوە بەدوای خۆجەدا دەنێردرا و داوای لێکدانەوەی بێ شەرمانەی لێ دەکرا. دیسان، هەموو دوانیوەڕۆیانێکی پێنجشەممان لەگەڵ هاوزانیارەکانی خۆیدا لە مووەقیتخانە بەیەک دەگەیشتن و قسە و باسیان دەگۆڕییەوە. گەرچی بەهەمان ڕێکوپێکیی جارانیش نەبوو، بەڵام دیسان بەیانیان قوتابیانی دەبینی و لێیانی دەدا. دیسان. سەرباری ئەوەی کەمێک شل بووبوو، بەڵام هێشتا دەیتوانی خۆی لە بەرامبەر ئەو کەسانەدا ڕابگرێ کە بەمەبەستی هاندانی ئەم بۆ ژنان هێنان دەهاتن. دیسان، ناچار دەبوو لەپێناوی خەوتن لەگەڵ ژناندا گوێ لەو موزیکە بگرێ کە خۆی دەیگوت حەزی لێی نییە. دیسان، هەندێ جار وا دەهاتە بەرچاو وەک ئەوەی لەو نەفرەتەدا، کە لە گەمژەکانی دەکات، نقوم بووبێ. دیسان، دەچووەوە ژوورەکەی خۆی، لە جێگەکەیدا ڕادەکشا و دوای هەڵدانەوەی لاپەڕەی کتێب و دەستنووسەکانی دەوروبەری بە هەڵچوونەوە، چەندین سەعات بۆ بنمیچەکەی دەڕوانی و چاوەڕوانی دەکرد.

ئەوەی لە نائومێدیی ئەمی زیاتر دەکرد، سەرکەوتنەکانی کۆپرولو مەمەد پاشا بوو کە ئەم لە ڕێی دۆستەکانی مووەقیتخانەوە پێی دەگەیشتەوە. بۆمی دەگێڕایەوە کە ڕەوە کەشتییەکانی کۆپرولو مەمەد پاشا بەسەر ڤینیسیاییەکاندا سەرکەوتوون و بۆزجائادا و لیمنیی بەدەست هێناوەتەوە، یان ئابازا حەسەن پاشای یاخیبووی تەمێ کردووە. درێژەی دەدایێ و دەیگوت: "ئەمانە کۆمەڵێک سەرکەوتنی کۆتایی و کاتین، دوا لەقەفرتێی ئەو کەمئەندامەیە کە لە ماوەیەکی نزیکدا لە قوڕاوی دەبەنگی و بێ توانایییدا دەچەقێ." وا دیار بوو چاوەڕێی خراپەیەک بکات بۆ گۆڕینی ئەو ڕۆژانەی کە خۆیان دوویات دەکردەوە و ئێمەیان زیاتر ماندوو دەکرد. سەرباری هەموو ئەمانەش، حەوسەڵە و ئومێدی نەمابوو خۆی بەو شتەوە سەرقاڵ بکات کە ناوی زانست بوو و ئەو خۆی پێوە ماندوو دەکرد. خرۆشی هەر بیرۆکەیەکی نوێ لە هەفتەیەک زیاتر بڕی نەدەکرد، چونکە لە ماوەیەکی کورتدا گەمژەکانی بیر دەکەتەوەوە و هەموو شتێکی لە بیر دەکرد. ئایا ئەو هەموو بیرەی کە تا ئەو کاتە لە ئەوانی کردبووەوە، بەس نەبوو؟ ئەو هەموو هەڵچوونە؟ لەوانەشە نەیتوانیبێ هێز و ویست بۆ شۆڕبوونەوە بە وردەکارییەکانی ئەو زانستەدا گرد بکاتەوە، چونکە لەو کاتانەدا تازە بەتازە فێر بووبوو خۆی لەوانی دی جیا بکاتەوە، بەڵام هاتبووە سەر باوەڕهێنان بەوەی ئەو لەوان جیاوازترە.

یەکەمین خرۆشی ڕووناکیدەر ڕاستەوخۆ لە هەناوی بێزارییەوە لە دایک بوو. لەبەرئەوەی چی دی نەیدەتوانی بەدوور و درێژی لە هیچ بابەتێک ڕامێنێ، کتومت جۆری ئەو منداڵە گەمژە و خۆپەرستانەی نازانن خۆیان بە چییەوە سەرقاڵ بکەن، ئەو ڕۆژانە کاتی خۆی بەوە بەسەر دەبرد خۆی بەم ژوورەی ماڵەکەدا بکات و لەوی تریانەوە بێتە دەرەوە، سەر بکەوێتە نهۆمی سەرەوە و دابەزێتە خوارەوە و بێ کار و کردەوە لە پەنجەرەکانەوە سەیری دەرەوە بکات. لە میانەی گەڕانە وەڕەسکەر و بێ کۆتاییەکەی ئەوەوە کە ماڵە لە تەختە بنیادنراوەکەی پڕ کردبوو لە قرتەقرت، دەمزانی چاوڕێی بەزمێک بۆ خۆ پێوە خەریککردن و بیرۆکەیەک و وشەیەکی ئومێدبەخش لە من دەکات. بەڵام من بەهۆی ئەوەی هێزی ڕق و نەفرەتم لە بەرامبەریدا هیچ کەمی نەکردبوو، سەرباری چاوترساویی خۆیشم، وشەی

چاوەڕوانکراوم بەوی نەدەگوت. ئەو کاتانەش بۆ دەسگیرکردنی وەڵامێک لە من، پێی لە جـەرگی خـۆی دەنا و چەند ڕسـتـەیەکی بۆ دڵدانەوەم دەگـوت، من ئەو وشـە بەفریادەچووانەم نەدەدرکاند. کاتێک دەمبیست لە کۆشکەوە هەواڵێکی بەخێری پێ گەیشتووە، یاخۆ بیرۆیەکی نوێی هەیە و ئەگەر خۆی ڕابگرێ و دوای بکەوێ لەوانەیە ئەنجامێک بەدەستەوە بدات، من یان خۆم لێ کەڕ و کپ دەکرد، یاخۆ دەستبەجێ لایەنی گشتی و باوی ئەو شتەم دەخستە ڕوو کە ئەو دەیگوت و بەو جۆرە گڕی خرۆشیم دەکوژاندەوە. شادمان دەبووم کە دەمبینی لە بۆشایی و نائومێدیدا پێچی دەخوارد.

بەڵام دواترێ هەر لەو بۆشاییەدا بیرۆکەیەکی نوێی بۆ خۆ سەرقاڵکردن دۆزییەوە. ڕەنگە ئەم دۆزینەوەیەی لەژێر کاریگەریی بەتەنیایی مانەوەی خۆیدا سەری گرتبێ، یاخۆ بەهۆی ئەوەی نەیدەتوانی هۆشی لە وردەکاریی هیچ شتێکدا چڕ بکاتەوە و بپەڕێتەوە دەرەوەی سنوورەکانی نائاسوودەیی خۆی. ئەو کاتە وەڵامم دایەوە، چونکە دەمویست هێزی بخەمە بەر و هانی بدەم. ئەو شتەی بە خەیاڵی ئەودا هاتبوو، سەرنجی منیشی ڕاکێشابوو. بیرم لەوە کردەوە لەو نێوانەدا هەست بە منیش بکات. ئێوارانێک، خۆجە بەدەم دەنگی هەنگاوەکانیەوە کە ماڵەکەی بە قرتەقرت خستبوو، هاتە ژوورەکەم و وەک ئەوەی لە بارەی شتێکی ڕۆژانە و زۆر ئاساییەوە بدوێ، لە منی پرسی: "بۆچی من منم؟" منیش لەبەرئەوەی لە هاندانی بووم، وەڵامم دایەوە.

پاش ئەوەی پێم گوت نازانم بۆچی ئەو ئەوە، گوتم ئەم پرسیارە، لەوێ، لە نێوان ئەواندا، زۆر دەکرێ و هەموو ڕۆژێکیش زیاتر و زیاتر دەکرێ. کاتێک ئەمانەم دەگوت هیچ نموونەیەک و بیرۆکەیەک و هیچ شتێکی ترم لە خەیاڵدا نەبوو تاکو لە قسەکانمدا پشتی پێ ببەستم، تەنیا ویستم بەوجۆرەی کە ئەو ئارەزوو دەکات، وەڵامی پرسیارەکە بدەمەوە. لەوانەشە بە غەریزەیەکی سادەوە هەستم کردبێ ئەم گەمەیەی بەلاوە خۆش بێ. سەری سوڕما. بەپەرۆشەوە بۆمی دەڕوانی، دەیویست بەردەوام بم. "ئەوانیش ئەو پرسیارە لە خۆیان دەکەن؟" کاتێک بینی بە پێکەنینەوە سەری بەڵێی بۆ دەلەقێنم، یەکسەر هەڵچوو: "من ئەمەم نەپرسیوە لەبەرئەوەی ئەوان

دەیپرسن. بێ ئەوەی بزانم ئەوان ئەمەیان لە خۆیان پرسیوە، من لە خۆمم پرسیوە، بەلایشمەوە گرینگ نییە ئەوان چییان کردووە." دواترێ بە نمایشێکی سەیرەوە گوتی: "وا هەست دەکەم دەنگێک لە گوێیەکانمدا بەردەوام گۆرانیم بۆ دەڵێ." ئەم گۆرانبێژەی ناو قوولاییی گوێیەکانی، باوکی خوا لێخۆشبووی هێنابووەوە یادی، ئەویش بەر لە مردنی گۆرانبێژێکی لەو جۆرەی هەبووە، بەڵام گۆرانییەکانی ئەو جۆرێکی تر بووە. گوتی: "ئەوەی من هەمان بالۆرە دەڵێتەوە." لەوە دەچوو کەمێک شەرم بکات، بەردەوام بوو و گوتی: "من منم، من منم، ئا خ!"

خەریک بوو بدەمە قاقای پێکەنین، بەڵام دانم بە خۆمدا گرت. ئەگەر ئەمە گاڵتەیەکی خۆش بووایە، پێویست بوو ئەویش پێ بکەنێ. پێ نەدەکەنی، بەڵام خۆی هەستی کرد کە لە تخووبەکانی پێکەنین نزیک بووەتەوە. ئەوەی لەسەر من بوو دەبوو نیشانی بدەم هەم هەستم بە پێکەنینەکەی و هەم بەواتای بالۆرەکە کردووە، چونکە ئەمجارەیان دەمویست گەمەکە درێژە بکێشێ. گوتم پێویستە بالۆرەکە بەهەند وەربگیرێ. بێگومان ئەو کەسەی کە لە قوولاییی گوێیەکانیدا گۆرانی دەچڕی، لە خۆی بترازێ، کەسێکی تر نەبوو. لەوەدا بوو جۆرێک لە گاڵتە لە قسەکانمدا بدۆزێتەوە، بەڵام لەپڕ هەڵچوو: خۆیشی ئەمەی نەدەزانی؛ ئەوەی ئەم دەیویست بیزانێ، ئەوە بوو بۆچی ئەو دەنگە هەمان ڕیزە وشە دەڵێتەوە؟

بێگومان نەمگوت لە ڕووی بێزارییەوە، بەڵام لە ڕاستیدا مەبەستم بوو پێی بڵێم: نەک هەر خۆم، بگرە لەڕێی خوشک و براکانیشمەوە دەمزانی ئەو بێزارییەی کە لە منداڵانی خۆپەرستدا بەدی دەکرێ، لەو جۆرە بەرهەمە و تەنانەت شتی تووڕەهاتی تریشی لێ دەکەوێتەوە. گوتم پێویستە بیر لە واتای بالۆرەکە بکەینەوە نەک هۆیەکەی. لەپڕ بە خەیاڵمدا هات بۆی هەیە لەو بۆشاییییەدا شێت ببێ. ئەگەر وا بوایە، منیش لە بێزاریی نائومێدی و ترسنۆکیی ئەو ڕزگارم دەبوو. لەوانەش بوو ئەمجار بەڕاستی پێی سەرسام بوومایە. ئەگەر ئەمەی بکردایە، ئەوا ئەمجارە شتێک لە ژیانی هەردووکماندا ڕووی دەدا. پاشان بە بێچارەیییەوە گوتی: "واتە چی بکەم؟" گوتم بیر لە هەبوونی خۆت بکەوە. بەڵام ئەمەم بەجۆرێک نەگوت وەک ئەوەی ئامۆژگاریی بکەم، چونکە نەمدەتوانی لەو بابەتەدا هاوکاریی ئەو بکەم. هەموو

کارەکە کەوتبووە ئەستۆی خۆی. بە گاڵتەوە گوتی: "واتە چ بکەم، سەیری ئاوێنە بکەم؟" هێوربوونەوەش بە ڕووخساریەوە دیار نەبوو. من بێدەنگ بووم بۆ ئەوەی بیر بکەمەوە. ئەو دووبارەی کردەوە: "سەیری ئاوێنە بکەم؟" لەپڕ هەڵچووم، بیرم کردەوە کە خۆجە بەتەنیا ناتوانێ بەهیچ ئاکامێک بگات. خۆزگەم دەخواست هەست بەم ڕاستییە بکات. دەمویست لە ناخەوە پێی بڵێم بەبێ من ناتوانێ بیر لە هیچ شتێک بکاتەوە، بەڵام زاتم نەدەکرد. پێم گوت بە سستی و خاوی سەیری ئاوێنە بکات. نەخێر، زات نا، بگرە هێزم تێدا نەبوو. هەڵچوو، بەدەم دەرچوونەوە لە ژوورەکە، دەرگاکەی دا بە یەکدا و نەڕاندی: "تۆ گەمژەیت."

دوای سێ ڕۆژ، کاتێک سەرلەنوێ بابەتەکەم کردەوە و بینیم ئەو دەیەوێ دیسان قسە بباتەوە سەر "ئەوان"، من ویستم درێژە بە گەمەکە بدەم، چونکە تەنانەت هەر بەتەنیا ڕاوەستانیش لەسەر بابەتەکە لەو کاتەدا مایەی ئومێد بوو. گوتم ئەوانەی ئەوێ سەیری ئاوێنە دەکەن، بگرە زۆر زیاتر لەمانەی ئێرە. نەک بەتەنیا کۆشک و سەرای پاشا و شازادە و نەجیبزادەکان، بگرە ماڵی کەسانی سادەش پڕە لە ئاوێنەی ئەوتۆ کە بە زەریفی لە چوارچێوە گیراون و بە دیوارەکاندا هەڵواسراون. ئەمەشیان بۆ لاساییکردنەوەی پادشا و شازادەکان نییە، بگرە خۆیان ڕەنجیان لەو کارەدا کێشاوە و تیایدا پێشکەوتوون. بە پەرۆشی و سادەییەکەوە کە بووە هۆی سەرسوڕمانم، پرسی: "لە کام کاردا؟" وای بۆچووم کە باوەڕی بە دانە بەدانەی قسەکانم کردبێ، بەڵام دوایی زەردەخەنەیەکی خستە سەر لێوی و گوتی: "کەواتە ڕۆژ تا ئێوارە سەیری ئاوێنە دەکەن!" جاری یەکەمی بوو گاڵتەی بەوانە دەکرد کە من لە نیشتمان لەدوای خۆم بەجێم هێشتبوون. بە هەڵچوونەوە بەدوای قسەیەکدا گەڕام کە ئاگر لە ڕۆحی بەربدات. بێ بیرکردنەوە و بێ ئەوەی خۆیشم باوەڕم بەوە هەبێ کە دەیڵێم، یەکسەر گوتم: "مرۆڤ تەنیا خۆی دەتوانێ بیر بکاتەوە چییە، بەڵام خۆجە بەشی ئەو کارە بوێریی تێدا نییە." کوڵێک دڵخۆش بووم کاتێک بینیم ئازار، وەک ئەوەی من دەمویست، ڕووخساری دەجەڕاند.

بەڵام ئەو دڵخۆشبوونەم زۆر گران لەسەر کەوت. نەک لەبەرئەوە هەڕەشەی لێم کرد کە ژەهرم دەرخوارد دەدات، نەخێر، بگرە لەبەرئەوەی دوای چەند ڕۆژێک داوای لە

من کرد ئەو بوێرییەی نیشان بدەم کە من بەوم گوتبوو توانای نیشاندانی نییە، سەرەتا ویستم بەرگی گاڵتە بە بەر شتەکەدا بکەم. گوتم بیرکردنەوەی مرۆڤ لەوەی کە چییە، گاڵتەیەکە لە جۆری سەیرکردنی ئاوێنە. گوتم ئەو قسانەم بە هەڵچوونەوە کردووە بۆ ئەوەی توورەت بکەم. بەڵام پێ نەدەچوو ئەو بڕوا بە قسەکانم بکات. هەڕەشەی لێم کرد ئەگەر بوێریی خۆم نەسەلمێنم، خۆراکم کەم دەکاتەوە و لەوەش خراپتر، دەرگام لەسەر قفڵ دەدات. دەبوو بیر بکەمەوە من چیم و ئەنجامی بیرکردنەوەکەشم لەسەر کاغەز تۆمار بکەم. ئەوسا بۆی دەردەکەوێ ئەم کارە چۆن دەکرێ و منیش چەند بوێرم.

# 5

سـەرەتا، چەند لاپەڕەیەکم لەبارەی ئەو ڕۆژە خـۆشـانەی لەگـەڵ براکـانم، دایکم و دایکی دایکمدا لە کێڵگەکەی خۆماندا لە ئەمپۆلی بەسـەرم بردبوو، نووسـیـیەوە. ڕاستییەکەی، نەمدەزانی بۆچی ئەمانەم هەڵبژارد بۆ گێڕانەوەی "من بۆچی منم." پێم وابێ لەبەر پێویستیی تاسەکردنی ڕۆژانی جوانیی بەباچوو بوو. سەرباری ئەوەش، دوای قسەکانی ڕۆژی پێشـووترم کە بە هەڵچوونێکی زۆرەوە کردبووم، خۆجە هێندە پاڵەپەستۆی بۆم هێنابوو، وەک ئێستا ناچار بووم ترش و خوێ بە وردەکارییەکانەوە بکەم و بە خەیاڵ هەندێک شت بخـوڵقـێنم و بنووسـم بەجۆرێک خوێنەر باوەڕی پێ بکات. بەڵام خۆجە لە سـەرەتاوە نووسـینەکانمی بەگەن نەکرد، چونکە بە بۆچوونی ئەو، ئەمە کردەوەی کەسانێکە بەدەم سەیرکردنی ئاوێنەوە ڕادەمێنن و ئەوەشی من نووسـیـومە، شتگەلێکن هەمـوو کـەسێ دەتوانێ بیـر بکاتەوە و بیـانـووسێ. دەیگوت ئەمـە ئەو بوێرییـە نیـیـە تۆ لـە مندا بەکـەمی دەبینی. دوای خـوێندەوەی ئەوەی چۆن جـاڕێک لەگـەڵ باوکم و براکـانمدا بۆ ڕاو چووبووین و لەپڕ ورچێکی ئالپ لە بەردەممدا قوت بووەوە و ماوەیەکی درێژ چاومان بڕییە چاوی یەکتر و بەیانکردنی هەستی خۆم بەرامبەر بە مردنی لێخوڕی خۆشەویستی گالیسکەکانمان، کە چۆن بە بەرچاومـانەوە کەوتە ژێر پێی ئەسـپەکـانی خۆیەوە و دوایی لە نـاو جێدا گیـانی لە دەستدا، خۆجە هەمان وەڵامی دایەوە: هەموو کەسێک دەتوانێ ئەمانە بنووسێ.

بەدوای ئەو قسـەیەیدا گـوتم ئەو شـتـانەی ئەوانەی ئەوێندەرێش دەیکەن، لەمـانە زیاتر نییە. پێم گـوت قسـەی یەکەمم پێوەنـانێک بووە و بە هەڵچـوونەوە دەربڕاوە و

نەدەبوو لەوە زیاتر لە من چاوەڕێ بکات. بەڵام گوێی بۆم ڕانەدەگرت. لە ترسی قفڵدانی ژوورەکە لەسەرم، درێژەم بە نووسینەوەی خەیاڵەکانم دا. بەوجۆرە و لە ماوەی دوو مانگدا ناوبەناو بەخۆشی و جاروباریش بەدەم ئازارەوە کۆمەڵێک بیرەوەریی بچووکی لەو جۆرەی شایەن بە بیرهێنانەوەم ڕێک خستەوە و چاوم پیایاندا گێڕایەوە. هەرچی شتی باش و خراپ هەیە، ئەوانەی تا کاتی کەوتنەداوی دیلی بەسەرم هاتبوون، هێنایەوە بەرچاوی خۆم و جارێکی تر هەستم بە ڕوودانیان کردەوە. لە ئاکامدا هەستم کرد چێژ لەم کارەم وەردەگرم. ئیدی پێویستی نەدەکرد خۆجە بۆ نووسینەوە زۆرم لێ بکات. هەر جارێک بیگوتایە ئەمە ئەو شتانە نییە ئەو دەیەوێ، من دەستم دەدایە بیرەوەرییەکی تر و بەسەرهاتێکی تر، کە پێشوەخت بڕیاری نووسینەوەیم دابوو.

پاش ماوەیەکی درێژ، کاتێک دەمبینی خۆجەش چێژ لە نووسراوەکانم وەردەگرێ، کەوتمە چاوەڕێکردنی کاتێکی گونجاو بۆ بەکێشکردنی بۆ ناو ئەم گەمەیە. بەمەبەستی ئامادەکردن و سازدانی، باسی چەند ئەزموونێکی سەردەمی منداڵیی خۆمم بۆ گێڕایەوە: بێخەوی و ترسی شەوێکی درێژ و نەبڕاوە؛ هەستی نزیکیم لە برادەرێکی تافی لاویم کە خوومان بەوەوە گرتبوو لە هەمان کاتدا بیر لە هەمان شت بکەینەوە؛ دواتریش باسی مردنی برادەرەکەم و ترسی ئەوەم بۆ گێڕایەوە وا تێ بگەن منیش مردووم و بە زیندوویی لەگەڵ ئەودا بمنێژن: دەمزانی کەیفی بەم شتانە دێ! پاش ماوەیەکی کورت، غیرەت گرتمی و خەونێکی خۆم بۆ گێڕایەوە: جەستەم لە خۆم جیا بووبووەوە و لە تاریکیدا لەگەڵ هاوشێوەیەکی ڕووخسار نادیاری خۆمدا مامەڵەیان دەکرد و هەردووکیان دەیانویست گەلەکۆمەکێم لێ بکەن. خۆجەش لەو ڕۆژانەدا دەیگوت دیسانەوە و زۆر بەچڕی هەمان بالۆرەی سەمەرەی ناو گوێی دەبیستێ. دوای ئەوەی بینیم، وەک ئەوەی خۆم دەمویست، کەوتبووە بەر کاریگەریی خەونەکەم، بە سووربوونەوە پێم گوت ئەم جۆرە نووسینەوەیە، کارێکە دەبێ ئەویش تاقی بکاتەوە. گوتم بەمە هەم خۆت لەو چاوەڕێکردنە نەبڕاوەیە ڕزگار دەکەیت و هەم هێڵەکانی ئەو سنوورە دەدۆزیتەوە کە تۆ لە گەمژەکانت جیا دەکاتەوە. جاروبار لە کۆشکەوە بەدوویدا دەنێردرا، بەڵام هیچ پێشهاتێکی ئومێداوی بەدی نەدەکرا. لە

پێشدا کەمێک نازی کرد، بەڵام کە من پێم داگرت، ئەو بەپەرۆش و کەمێک شەرمەوە گوتی ئامادەیە نووسین تاقی بکاتەوە. لەبەرئەوەی دەترسا ببێ بە مایەی پێکەنین، گاڵتەیەکیشی کرد: "ئایا وەک ئەوەی پێکەوە دەنووسین، دەتوانین پێکەوە سەیری ئاوێنەش بکەین؟"

کاتێک باسی پێکەوە نووسینی کرد، من هیچ خەیاڵم نەچوو بۆ ئەوەی ئەو بیەوێ پێکەوە لە بەرامبەر هەمان مێز دابنیشین و بنووسین. من پێم وابوو کاتێک ئەو دەست بە نووسین دەکات، من دیسان دەگەڕێمەوە بۆ ئازادیی بەتاڵی کۆیلەیەکی تەمەڵ، بەڵام بە هەڵەدا چووبووم. ئەو گوتی پێویستە هەردووکمان لەمبەر و ئەوبەری مێزەکە دابنیشین و رووبەڕووی یەکدی بنووسین: ئەو دەیگوت ئاوەزمان، کە لەبەرامبەر ئەم بابەتە ترسناکانەدا مەیلی تەمەڵی و تەوەزەلی دەکات، تەنیا بەم شێوەیە دەتوانین بیخەینە کار و تەنیا بەمجۆرە دەتوانین هەست و نەزمی کار بە یەکدی بدەین. بەڵام هەموو ئەمانە بیانوو بوون. دەمزانی لە تەنیایی و لە هەستکردن بەوەی کە لە کاتی بیرکردنەوەدا تەنیایە، دەترسێ. ئەمەشم بەوەدا بۆ دەرکەوت کە سەیری کاغەزێکی بەتاڵی بەردەمی خۆی کرد و بە دەنگێکی بیستراو لەبەر خۆیەوە دەستی بە قسان کرد. پێشەکی چاوەڕێی ڕەزامەندیی منی لەسەر ئەو شتانە دەکرد کە دەیویست بیاننووسێ. دوای نووسینی چەند ڕستەیەک، بە بێ فیزی و پەرۆشێکەوە کە سادەیی منداڵی بەبیر دەهێنایەوە، لەبەرەوە دەستی کرد بە نیشاندانی نووسینەکانی خۆی بە من. پرسی: "داخۆ ئەمانە شایەنی نووسینەوەن؟" هەڵبەتە منیش پەسنی نووسینەکانیم دا.

بەمجۆرە، ئەوەی لە ماوەی یازدە ساڵدا لە بارەی ژیانی ئەوەوە بۆم دەرنەکەوتبوو، لە ماوەی دوو مانگدا بۆم ڕوون بووەوە. لە ئەدرنە کە دواتر لەگەڵ سوڵتان بۆی چووین، ژیابوون. باوکی زۆر زوو کۆچی دوایی کردبوو، شێوەی بیر دەکەوتەوە و نەدەکەوتەوە. دایکی ژنێکی تێکۆشەر بووە. دواتر، جارێکی تر شووی کردبووەوە. لە شووی یەکەمی کچێک و کوڕێکی هەبوو. لە شووی دووەمیشی چوار کوڕی بووبوو. پیاوەکەی لێفەدروو بووە. تامەزرۆترین براشیان بۆ خوێندن، بێگومان هەر خۆی بووە. زانیشم کە خۆی هۆشیارترین، جەربەزەترین، لێوەشاوەترین و بەهێزترین

برای ناو براکانی بووە و هەر خۆیشی سەرڕاستترینی هەموویان بووە. خوشکەکەی لێ دەربچێ، بە نەفرەتەوە باسی براکانی تری دەکرد، بەڵام دڵنیا نەبوو لەوەی هەموو ئەمانە شایەنی تۆمارکردنن یان نا. من هانم دا، لەوانەیە لە سۆنگەی پەی بردنم بووبێ بەوەی کە ڕۆژێک منیش دەبم بە خاوەنی ئەو شێواز و چیرۆکی ژیانە. شتێک لە زمان و ڕەفتاریدا هەبوو حەزم پێ دەکرد و دەمویست فێری بم. مرۆڤ، پێویستە ئەو ژیانەی ئەو بۆ خۆی هەڵبژاردووە بە ڕادەیەک خۆش بوێ کە لە ئاکامدا وا هەست بکات ژیانی خۆیەتی؛ خۆشیشم دەوێ. بێگومان، پێی وابوو هەموو براکانی گەمژەن، تەنیا بۆ پارە پێوەندییان بە ئەمەوە دەکرد، بەڵام ئەو خۆی بە خوێندن دابوو. لە دەرسخانەی سەلیمییە وەرگیرابوو. لەگەڵ نزیکبوونەوەی تەواوکردنی خوێندندا بووبووە قوربانیی ئاژاوەبازییەک. جارێکی تر نەگەڕایەوە سەر ئەو پرسە، بەهیچ جۆرێکیش باسی ژنانی نەکرد. سەرەتا نووسی کە جارێک خەریک بووە ژن بهێنێ، دواتر، هەرچی لەو بارەیەوە نووسیبوو، بە هەڵچوونەوە دڕاندی. ئەو شەوە لە دەرەوە شەستە باران دەباری. سەرەتای ئەو شەوە ترسناکانە بوو کە کاتەکانی دواتر زۆر لە ژیانمدا دووبارەبوونەوە. جنێوی زۆری پێم دا. گوتی هەموو نووسینەکانی درۆیە. دواتر سەرلەنوێ دەستی کرد بە نووسینەوەی هەر هەموویان. منیش دوو شەو خەو نەچووە چاوم، چونکە دەیویست بەرامبەری دابنیشم و بنووسم. ئیدی سەیری نووسینەکانی منی هەر نەدەکرد. لەوسەری مێزەکەوە دادەنیشتم، بێ ئەوەی پاڵەپەستۆ بۆ خەیاڵی خۆم بهێنم، هەمان شتەکانی پێشووترم دەنووسییەوە و بە تیلەی چاو بۆ ئەوم دەڕوانی.

دوای چەند ڕۆژێک و هەموو بەیانیانێک لەسەر ئەو پەڕە گرانبەها و سپییانەی لە ڕۆژهەڵاتەوە هێنرابوون، لەژێر سەردێری "بۆچی من منم"دا دەستی بە نووسین دەکرد، بەڵام جگە لە ڕوونکردنەوەی ئەوەی بۆچی ئەوانی دی هێندە نزم و بێ ئاوەزن، هیچی تری لەژێر ئەو سەردێرەدا بۆ نەدەنووسرا. دیسان بۆم ڕوون بووەوە کە دوای مردنی دایکی، ناهەقیی لە بەرامبەر کراوە. بەو پوولەی دەستی کەوتووە، هاتووە بۆ ئەستەنبوڵ و ماوەیەک لە تەکیەیەکدا سەری خۆی کزکردووە. بەڵام کە زانیویەتی ئەوانەی ئەوێ تێکڕا نامەرد و ساختەکارن، شوێنەکەی جێ هێشتووە.

ویستم کەمێک زیاتر ماجەرای ئەو تەکیەیەم بۆ بگێڕیتەوە. وای بۆچووم ڕزگاربوون لەوانە سەرکەوتنێکی ڕاستەقینەی خۆجە بووبێ. توانیبووی خۆی جیا بکاتەوە. کاتێک من ئەمەم پێ گوت، ئەو هەڵچوو. بە منی گوت گوایە پەرۆشی ئەوەم ڕۆژێک لە ڕۆژان وردەکارییە دزێوەکانی ژیانی لەدژی خۆی بەکاربهێنمەوە. بەڕای ئەو، ئەوەی تا ئێستا زانیومە سەر و زیادە. جگە لەوەش، لێرەدا وشەیەکی زبری ڕەگەزبازیی بەکارهێنا، ڕای وابوو کە خواستی من بۆ زانینی ئەو هەموو وردەکارییە، ئەو دەخاتە گومانەوە. دواتریش بە تێروتەسەلی باسی سەمرای خوشکی بۆم گێڕایەوە، باسی چاکەی ئەو و خراپەی پیاوەکەی. لە بارەی غەمی چەندین ساڵەی نەبینینی خوشکەکەیەوە قسەی کرد، بەڵام کاتێک هەستی کرد بە پەرۆشەوە گوێم بۆ ڕاگرتووە، ئەو گومانی کرد و چووە سەر بابەتێکی تر. بەو پوولەی بە دەستییەوە ماوە کتێبی کڕیوە و ماوەیەکی درێژ، جگە لە خوێندنەوە، هیچ شتێکی تری بۆ نەکراوە. دواتریش، لێرە و لەوێ کاری بچووکی نووسیاریی دۆزیوەتەوە. لەوەدا بوو باسی بێ ئابڕوویی مرۆگەل بگێڕێتەوە، والی سادقی بیر کەوتەوە کە ماوەیەکی کورت لەوەوبەر لە ئەرزنجانەوە هەواڵی مردنیمان پێ گەیشتبوو. خۆجە لەو کاتانەدا والیی ناسیبوو. والی لە سۆنگەی بایەخدانیەوە بە زانست، دەستبەجێ ئەمی بە دڵدا چووە و هەر ئەویش لە فێرگەی سەربازی کاری مامۆستایی بۆ دۆزیوەتەوە. لێرەدا خۆجە گوتی بەڵام لە ڕاستیدا گەمژەی ڕاستەقینە والی بوو. لە کۆتایی کاری نووسینەوەدا کە ماوەی مانگێکی خایاند، شەوێک پەشیمانی دایگرت و هەموو نووسراوەکانی لەتوپەت کرد. بۆیە ئێستا کاتێک بە پشتبەستن بەهێزی خەیاڵی خۆم ئەو نووسراوانە و ڕابردووی خۆم دادەڕێژمەوە، هیچ ترسی ئەوەم نییە بکەومە ژێر کاریگەریی وردەکارییە شیرینەکانەوە. خۆجە بەدواین خرۆشەوە کەوتە نووسینەوەی کۆمەڵە شتێک بە سەردێری "ئەو گەمژانەی لە نزیکەوە دەیانناسم"، بەڵام هەڵچوو و پێی وابوو ئەو جۆرە نووسینانە ئەوی بەهیچ جێگایەک نەگەیاندووە و شتێکی نوێی لێوە فێر نەبووە، چونکە هێشتا نەیدەزانی بۆچی ئەو ئەوە. بە بۆچوونی ئەو، من ئەوم لە خشتە بردووە و وام لێ کردووە لە شوێنی ناپێویستدا بیر لە شتگەلێک بکاتەوە کە نایەوێ. پێمی گوت ڕۆژێک دێ سزام بدات.

نازانم بۆچی لەو ڕۆژانەدا، کە سەرەتای ڕۆژانی هاوبەشی ڕابردوومانی بیرم دەخستەوە، ئەو بەڵێنی سزادانە لە کەللەی دابوو! هەندێک جار وای بۆ دەچووم لەبەرئەوەی ترسنۆکێکی گوێڕایەڵ و ژیرم، خۆم زەمینەم بۆ هەڕەشەکەی خۆش کردبێ. شەویش، لەگەڵ یەکەم قسەکردنیدا سەبارەت بە سزادان، بڕیارم دا بەرگری لە خۆم بکەم. خۆجە بەهۆی بێزاربوونی زۆریەوە لە بیرکردنەوە، ماوەیەک بەئەمسەر و ئەوسەری ماڵەکەدا سوڕایەوە. دواتریش، دیسان هاتەوە بۆ لای من و گوتی: "پێویستە کرۆکی بیرۆکەکە بنووسین: مرۆڤ وەک ئەوەی چۆن لە سەیرکردنی ئاوێنەدا دیمەنی خۆی دەبینێ، لە سەیرکردنی بیری خۆیدا، ناواخنی مێشکی خۆی دەبینێ."

ئەو شتە درەوشاوەیەی ئەو کە ئاماژەیەک بوو بۆ بەراوردکردن، منیشی خستە ماخۆلان. یەکسەر لەمسەر و لەوسەری مێزەکە دانیشتین. ئەمجار، ئەگەر بەنیوە گاڵتە پێداهاتنەوەوەش بێ، لە سەرەوەی لاپەڕەکە نووسیم "بۆچی من منم." دەستم کرد بە نووسینەوەی بیرەوەرییەکی سەردەمی منداڵیم کە باسی لە شەرمنیم دەکرد، چونکە لەو کاتەدا ئەوەم وەک نیشانەیەکی کەسایەتیی خۆم بیرکەوتەوە. دوای خوێندنەوەیەکی تری نووسینەکانی خۆجە کە گازندەی لە خراپیی ئەوانی تر دەکرد، بیرۆکەیەکم بۆ هات کە لەو ساتەدا بڕوام کرد گرینگ بێ و گوتم: "پێویستە خۆجەش خراپەکارییەکانی خۆی بنووسێتەوە." لەبەرئەوەی لەو ساتەدا سەرقاڵی خوێندەوەی نووسینەکانی من بوو، سەیرێکی کردم و گوتی: "من ترسنۆک نیم." بەرپەرچم دایەوە: "بەڵێ، ترسنۆک نیت، بەڵام تۆش وەک هەموو مرۆڤێکی تر لە کەموکوڕی بەدەر نیت. ئەگەر بەدوایاندا بگەڕێی، ئەوا کرۆکی خۆت دەدۆزێتەوە. من وام کردووە و تۆش دەتەوێ وەک منت لێ بێ." کاتێک گوتم هەستم بەمە کردووە، هەڵچوونم بە ڕووخساریەوە بینی، بەڵام خۆی ڕاگرت. بەدەم هەوڵدانەوە بۆ ڕاگرتنی کێش و هاوسەنگیی خۆی، گوتی: "خراپەکار ئەوانی ترن. هەڵبەتە هەموو کەسێکیش نا، بەڵام هۆی چەوتیی شتەکان بۆ ناتەواوی و خراپیی ئەوانی تر دەگەڕێتەوە." بەدوای ئەوەدا من بەرەنگاری بوومەوە و گوتم: "خۆیشت لایەنی خراپ، زۆر خراپت هەیە و پێویستە ئاشکرایان بکەی." بێ شەرمانە درێژەم دایێ و گوتم: "تۆ لە منیش خراپتری."

بەو جۆرە، ڕۆژانی ئەو خراپەکارییە سەمەرە و ترسناکانە دەستیان پێ کرد! دوای بەستنەوەم بە کورسییەکەوە و دانانم لەبەردەم مێزەکەمدا، لە بەرامبەرم دادەنیشت و دەستووری پێم دەدا ئەو شتە بنووسم کە ئەو دەیویست، بەڵام ئیدی وای لێ هاتبوو خۆیشی نەیدەزانی ئەو شتە چییە. لەو چوواندنە بترازێ، هیچ شتێکی تری لە خەیاڵدا نەبوو: مرۆڤ چۆن سەیری ئاوێنە دەکات و ددانی خۆی دەبینێ، ئەگەر بیر بکاتەوە، دەتوانێ چاودێریی ئاوەزی خۆیشی بکات. ئەو پێی وابوو من ئەمە دەزانم، بەڵام نهێنییەکە لەو دەشارمەوە. خۆجە لە بەرامبەرم دادەنیشت و چاوەڕێی دەکرد ئەو نهێنییەی بۆ بنووسمەوە، بەڵام من کاغەزەکانی بەردەمم بە خراپەکارییەکانی خۆم، کە بە پێوەنانەوە دەمنووسینەوە، پڕ دەکردەوە. هێندەی ترم دەخستە سەر دزییە بچووکەکانی سەردەمی منداڵیم، ئەو درۆیانەی لە ئێرەیی پێبردندا دەمکردن، ئەو فێڵ و تەڵەکانەی کە بۆ ئەوەی خۆم زیاتر لای دایک و باوکم بەرمە پێشەوە و خۆم لە خوشک و براکانی ترم شیرینتر بکەم، دەمکرد و هەروەها تاوانە زایەندییەکانی تافی لاویی خۆم بە خۆشحاڵییەوە تۆمار دەکرد. خۆجە، دوای ئەوەی نووسراوەکانی منی بە پەرۆشەوە و بە چێژ و ترسێکی سەیرەوە کە منی دەترساند، دەخوێندەوە، زیاتر توڕە دەبوو، هاوسەنگی و ویقاری خۆی لە دەست دەدا و ئازاری زیاتری پێم دەگەیاند. لە ناخی خۆیدا گەیشتبووە ئەو باوەڕەی کە ڕۆژێک لە ڕۆژان دەبێ بە خاوەنی ڕابردووی من، بۆیە لە سۆنگەی ئەوەی نەیدەتوانی خۆی بخاتە ژێر باری خراپەکارییەکانی ڕابردوومەوە، یاخی دەبوو. ڕاست و ڕەوان دەستی کردبوو بە دارکاریکردنم. دوای خوێندنەوەی هەر گوناهێکم، دەیگوت "هەی بێ ناموس" و بە توڕەبوونێکی تێکەڵ لەگەڵ گاڵتە بەناو لەپی دەست دەیکێشا بە پشتمدا. جاری وا هەبووە خۆی بۆ ڕام نەکراوە و زللەی لە بناگوێم سرەواندووە. پێ دەچێ تەنیا لە ڕووی بێزارییەوە ئەم ڕەفتارانەی لێ وەشابێتەوە، چونکە ئیدی خۆیشی هاتبووە سەر ئەو باوەڕەی کە لە کۆشکەوە کەمتر بەدوایدا دەنێردرێ و لە من و خۆیشی زیاتر، هیچ شتێکی تر نییە خۆی پێوە سەرگەرم بکات. بەڵام تا ئەو زیاتر خراپەکارییەکانی منی بخوێندایەتەوە و لەسەر سزادانە منداڵانەکەی بەردەوام بووایە، متمانە و باوەڕ بەخۆبوونێکی سەیر منی دادەگرت: یەکەمجارم بوو هاتبوومە

سەر ئەو باوەڕەی خۆجەم لە مستی خۆم ناوە.

جارێکیان، پاش ئەوەی ئازارێکی زۆری دام، سەرنجم دا بەزەییی پێمدا دێتەوە. ئەمە هەستێکی خراپی تێکەڵ بە ڕق و نەفرەت بوو بەرامبەر بە کەسێک کە مرۆڤ هیچ کاتێک لە ئاستی خۆیدا نایبینێ. ئەمەم لەوەوە بۆ دەرکەوتبوو کە ئیدی دەیتوانی بێ نەفرەت لێکردنم بۆم بڕوانێ. گوتی: "ئیدی با هیچ نەنووسین." دوایی قسەکەی ڕاست کردەوە و گوتی: "نامەوێ تۆ هیچ بنووسی"، چونکە ماوەی چەندین هەفتە بوو من خراپەکارییەکانی خۆم دەنووسییەوە و ئەویش تەنیا تەماشای دەکرد. خۆجە گوتی: "پێویستە لە ماڵ، کە تا دێ تەنگەبەرتر دەبێ، دەربچین و گەشتێک بکەین. لەوانەشە بچین بۆ گەبزە." دەیویست بچێتەوە سەر کاری گەردووونناسی و بیری دەکردەوە کتێبێکی بەهەندتر دەربارەی ژیانی مێرووله بنووسێ. کاتێک بینیم خەریکە بەیەکجاری ڕێزی بۆم نامێنێ، ترسم لێ نیشت. بۆ ئەوەی سەرنجی ئەو بەرامبەر بەخۆم بە زیندوویی ڕابگرم، چیرۆکێکی ترم هەڵبەست کە تا چوونە خوارەوە بە ناخی زەویدا خۆمی بچووک دەکردەوە. خۆجە دوای ئەوەی نووسراوەکەمی بە زەوق و کەیفەوە خوێندەوە، تەنانەت هەڵیش نەچوو، بەڵام هەستم دەکرد پەرۆشی زانینی ئەوەیە من چۆن توانیومە شان بدەمە بەر ئەو هەموو خراپەکارییە. لەوانەیە لەو کاتەدا بەوە ڕازی بووبێ کە تا کۆتایی وەک خۆی بمێنێتەوە. بێگومان زۆر باش دەیزانی ئەم ماستە موویەکی تێدایە. ئەو ڕۆژە، وەک لێبووکێکی کۆشک و سەرای خۆ بە مرۆڤ نەزان قسەم لەگەڵدا کرد. هەوڵمدا پەرۆشییەکەی تاو بدەم کە تا دەهات زیاتر پەرەی دەسەند: چی لە دەست دەدات ئەگەر بۆ ڕوونکردنەوەی ئەوەی بۆچی ئەو کەسێکی وەهایە، بۆ دواجار و پێش چوونمان بۆ گەبزە، چەند شتێک دەربارەی خراپەکارییەکانی خۆی بنووسێ؟ هیچیش پێویست نەبوو نووسینەکانی ڕاست بن یاخۆ کەس باوەڕیان پێ بکات. ئەگەر ئەمە بکات، تێ دەگات کەسانی هاوشێوەی من چۆنن و ڕۆژێکیش دێ ئەم زانیارییانە فریای بکەون! لە ئاکامدا، لە بەرامبەر پەرۆشیی خۆی و چەنەبازیی مندا خۆی بۆ ڕانەگیرا و بەڵێنی دا ڕۆژی دواتر نووسینەوەی خراپەکارییەکانی خۆی تاقی بکاتەوە. بێگومان لە بیری نەچوو درێژەی بداتێ و بڵێ: " لەبەرئەوەم نییە گوایە

کەوتبێتمە داوی گەمە گەمژەکانی تۆوە. لەبەرئەوەی خۆم دەمەوێ، دەیکەم."

ڕۆژی دواتر، شادمانترین ڕۆژی کۆیلایەتیی من بوو. ئیدی منی بە کورسییەکەوە نەدەبەستەوە، بەڵام بۆ بەچێژەوە چاودێریکردنی دروستبوونی لەسەرخۆی مرۆڤێکی نوێ، تەواوی ڕۆژم بە دانیشتن لە بەرامبەریدا بەسەر برد. سەرەتا هێندە متمانەی بە کارەکەی خۆی بوو، تەنانەت لە سەرەوەی لاپەڕەکەدا خۆی لە قەرەی قسەی سەمەرەی "بۆچی من منم" نەدا. پاشان، متمانەی منداڵێکی قۆشمە کە بەدوای درۆیەکی سەفابەخشدا دەگەڕێ، کەوتە سەر ڕووی. بە تیلەی چاو دەمبینی هێشتا لە دنیا ساغڵەمەکەی خۆیدایە. بەڵام ئەم متمانە بۆشە هێندە درێژەی نەخایاند. ئەو هەستە خۆکردەی خۆ بەتاوانبار زانینیش، کە بەلای منەوە لە نمایش دەچوو، زۆری نەبرد خامۆش بوو. لە ماوەیەکی کورتدا گاڵتەجاری وەرگەڕایە سەر نیگەرانی و گەمە بوو بە ڕاستی. خۆ تاوانبارکردن، ئەگەرچی بەدرۆش بێ، تا ڕادەی سەرسوڕمان خۆجەی دەترساند. ئەو شتەی کە نووسیبووی، بێ ئەوەی نیشانی منی بدات، یەکسەر ڕەشی کردەوە! بەڵام خولیا و پەرۆشبوون بە ناخیدا چووبووە خوارێ و پێم وابێ شەرمی لە منیش دەکرد، بۆیە درێژەی بە نووسینەوە دا. لێ ئەگەر پەیڕەویی لەو جووڵەیە بکردایە کە یەکسەر بە خەیاڵیدا هات و لەبەردەم مێزەکە هەڵستایە، لەوانەبوو بێ ئەوەی ئارامیی خۆی بشێوێنێ، ڕزگاری بوایە.

ساتەکانی دواتر سەیری داڕووخاندنە لەسەرخۆکەیم کرد. هەندێک شتی بۆ تاوانبارکردنی خۆی دەنووسی. دوایی نووسراوەکانی، بێ ئەوەی نیشانی منی بدات، دەدڕاند. هەر جارێک زیاتر متمانە بەخۆبوون و ڕێزی لە دەست دەدا، بەڵام دیسانەوە بە ئومێدی دۆزینەوەی لە دەستدراوەکانەوە تێ هەڵدەچووەوە. بە قسەی خۆی دەبووایە دانپیانانی خراپەکارییەکانی خۆی نیشانی من بدایە، بەڵام لەگەڵ داهاتنی تاریکی تەنانەت یەک وشەی ئەو نووسراوانەشم نەدەبینی کە تامەزرۆی خوێندنەوەیان بووم. تا ئەو کاتە هەمووی دڕاندبوو و توڕی هەڵدابوون. ئیدی بڕستی لێ بڕابوو. بەدەم هاوار و قیڕاندنەوە بە منی گوت ئەمە گەمەیەکی دزێوی گاورانەیە. متمانەشی بە خۆی بەڕادەیەک لاواز بووبوو، تەنانەت من بێ ئابڕووانە وەڵامم دایەوە و گوتم: "هێندە مەکڕوزێوە. لەسەر خراپەکاری ڕادێیت." لەوانەیە لە بەرامبەر

نیگاکانی مندا خۆی بۆ ڕانەگیرابێ، بۆیە لە ماڵ دەرچوو و ڕۆیشت. درەنگانێکی شەوێ گەڕایەوە، بەهۆی ئەو بۆنی گوڵاوەی لێی دەهات، وەک بۆی چووم، لەو ماڵە لەگەڵ ژنان نووستبوو.

دوانیوەڕۆی ڕۆژی دواتر، بۆ ئەوەی هانی بدەم لەسەر کارەکەی بەردەوام بێ، گوتم خۆجە لەوە گەورەترە ئەو گەمە بچووکانە بریندار بکەن. گوتم: "ئەم کارە بۆ کات بەسەر بردن نا، بگرە لەپێناوی فێربوونی شتێکدا دەکەین و هۆی گەمژەیی ئەوانەی بە گەمژە ناویان دەبەی، لە ئەنجامی کارەکەماندایە. ئایا ئەمە بەلای تۆوە کارێکی وەک پێویست سەرنجڕاکێش نییە بۆ ئەوەی یەکتری بەتەواوی بناسین؟" درێژەم دایێ و گوتم: "مرۆڤ دەکەوێتە ژێر کاریگەریی ئەفسوونی کەسێکەوە کە تا سەر کرۆک دەیناسێ، تەواو وەک ئەوەی خەونێکی ترسناکی خۆش بوێت."

بەهۆی کاریگەریی قسەکانی منەوە نا، کە هەر هێندەی گەمە و قۆشمەکارییەکانی گرگنێکی کۆشک و سەراکان بەهەندی وەرگرت، بگرە بەو متمانەیەی تیشکی ڕۆژەکە دەیبەخشی، دیسان لەبەردەم مێزەکەدا دانیشتەوە. ئێوارە کە لەسەر مێزەکە هەستا، لە دوێنێ کەمتر متمانەی بەخۆی مابوو. شەوێ، کاتێک بینیم وا دیسان بۆ کن ژنەکان دەڕوات، بەزەییم پێدا هاتەوە.

بەوجۆرە، هەموو بەیانییانێک وای بۆ دەچوو ئەو ڕۆژە لە نووسینەوەی خراپەکارییەکانی دەبێتەوە. بەهیوای بەدەستهێنانەوەی ئەوەی لە ڕۆژی ڕابردوودا لە دەستی دابوو، لە بەردەم مێزەکەدا دادەنیشت و ئێواران دوای هەستانی، شتێک زیاتر لەوانەی بەردەستی لەسەر مێزەکە دەمایەوە. لەبەرئەوەی خۆی بە سووک و چرووکی دەهاتە بەرچاو، چی دی بە چاوی سووکەوە بۆ منی نەدەڕوانی. وا بیرم دەکردەوە لە ئاکامدا ئەو هەستی یەکسانییەم دۆزیوەتەوە کە لە ڕۆژانی سەرەتای مانەوەمدا لای ئەو تەنیا بە خەیاڵ پەیم بە هەبوونی بردبوو. زۆر لە خۆم ڕازی بووم. لەبەرئەوەی لێم بێزار دەبوو، کار گەیشتە ئەوەی پێم بڵێ پێویست نییە لەبەردەم مێزەکەدا دابنیشی. ئەمەش ئاماژەیەکی باش بوو، بەڵام ڕق و کینەی کەڵەکەبووی چەندین ساڵەی خۆم بۆ ڕام نەدەکرا. دەمویست تۆڵە بکەمەوە و بچمە دۆخی هێرش بردنەوە. منیش وەک ئەو تیرم ئاراستەی نیشان کردبوو. ئەگەر بتوانم وا لە خۆجە

بکەم کەمێکی تر لە خۆی بکەوێتە گومانەوە، کەمۆکەیەک لەو دانپیانانەم بخوێندایەتەوە کە بەوردی لێمی دەشاردەوە و بە جوانی ڕەزیلم بکردایە، وام دەهاتە بەرچاو ئیدی ئەو کۆیلە بێ نەک من. ئەو مرۆڤی خراپی ئەو ماڵە بێ، نەک من. نیشانەکانی ئەمەش دیار بوون: ناوبەناو هەستم دەکرد دەیەوێ دڵنیا بێ لەوەی داخۆ پێم ڕابواردووە یان نا؟ وەک هەرکەسێکی لاواز و پشت بەخۆ نەبەستوو کاری گەیاندبووە ئەوەی چاوەڕێی لەقاندنی سەری ڕەزامەندیی من بکات. ئیدی زیاتر ڕای منی لەسەر شتە بچووکەکانی ڕۆژانە دەپرسی: لە بارەی ڕێکوپێکیی جلوبەرگەکانیەوە پرسیاری دەکرد؛ ئەگەر وەڵامی کەسێکی بدایەتەوە، لە منی دەپرسی داخۆ باش وەڵامی داوەتەوە یان نا؛ دەیپرسی داخۆ دەستنووسەکانیم پێ جوانە و بیر لە چی دەکەمەوە؟ بۆ ئەوەی بێ ئومێد نەبێ و دەست لە گەمەکە هەڵنەگرێ و ئاسوودە بێ، جاروبار خۆم سووک و ڕیسوا دەکرد. زمانی نیگاگانی دەیگوت: "تۆ، قورت بەسەر!"، بەڵام چی دی نەیدەتوانی زللەم تێ بسرەوێنێ. دڵنیاش بووم بیری لەوە دەکردەوە خۆیشی شایەنی ئەوەیە زللەیەکی تێ بسرەوێندرێ.

زۆر بەپەرۆش بووم بزانم ئەو دانپیانانە چین وایان لێ کردووە خۆی هێندە بە سووکی بێتە بەرچاو. لەو ڕۆژانەدا لەبەرئەوەی لەسەر سووکایەتی پێکردنی ڕاهاتبووم، خۆبەخۆی خۆم بیرم دەکردەوە دانپیانانەکانی زنجیرەیەک خراپەکاریی پروپووچ بن. ئێستا، بۆ ڕاستگۆیی بەخشین بە ڕابردووم، بەخۆم گوت با یەک دوو وردەکاریی ئەو دانپیانانەی تەنانەت دێڕێکیشیم نەخوێندبووەوە، دابڕێژمەوە، بەڵام هەرچەندی دەکەم ناتوانم هیچ خراپەکارییەک بدۆزمەوە شایەن بە خۆجە بێ و هاوسەنگیی بەسەرهاتەکەم و ژیانە خەیاڵ کردەکەم تێک نەدات. بەڵام دەمتوانی پێشبینی بکەم هەرکەسێکی تر بووایە لە جێی من، متمانەی بە خۆی پەیدا دەکردەوە. پێویستە بڵێم، یارمەتیی خۆجەم دابوو، بێ ئەوەی خۆی هەستی پێ بکات، داهێنانێک بکات و ئەگەر یەکجارەکی و ئاشکراش نەبێ، پەردەم لەسەر خاڵی لاوازی خۆی و هاوشێوەکانی هەڵدابووەوە! ئەو کاتە وا بیرم دەکردەوە ئەو ڕۆژە نزیک بووەتەوە بتوانم نەک هەر ماڵی ئەو، بگرە ماڵی ئەوانی تریش وێران بکەم. خراپبوونیانم دەسەلماند و دەمشۆردنەوە: پێم وابێ خوێنەرانی بەسەرهاتەکەم ئیدی

تێ دەگەن دەبێ منیش لە خۆجەوە هێندەی ئەوە فێر بوویم کە ئەو لە منەوە فێر بووە! لەوانەیە ئێستا بۆیە وا بیر بکەمەوە، چونکە مرۆڤ لە تەمەنی پیریی خۆیدا، لە بەسەرهاتەکانیدا زیاتر بەدوای شتە هاوشێوەکاندا دەگەڕێ. پێویستە لەو کاتانەدا قینی کەڵەکەبووی چەندین ساڵەم گوڕ و تینی پێم بەخشیبێ و پێم وابووبێ دوای بە باشی ڕیسواکردنی خۆجە، بە کەڵک وەرگرتن لە سەردەستیی خۆم، هیچ نەبێ، سەربەستیی خۆم پێی دەسەلماند و بێ شەرمانە داوای بەڵگەنامەی ئازادبوونم لێ دەکرد. خەیاڵم بۆ ئەوە دەچوو بێناز و نووز ئازادم دەکات و بیرم لە وردەکارییەکانی ئەو کتێبانە دەکردەوە کە دەمویست دوای گەڕانەوەم بۆ وڵاتەکەم، لەبارەی بەسەرهاتەکانی خۆم و تورکەکانەوە بیاننووسم! دەمەوبەیانییەک هەواڵێکی بۆم هێنا کە هەموو شتێکی سەروبن کرد.

پەتا بە شاردا بڵاو بووبووەوە! سەرەتا بڕوام نەکرد، چونکە ئەمەی بەجۆرێک گێڕایەوە وەک ئەوەی باسی ئەستەنبوڵ نا، بگرە شارێکی تری دوور بکات. لێم پرسی هەواڵەکەی چۆن بیستووە، چونکە دەمویست وردەکارییەکان بزانم. گوتی: "خەڵکی سەیریان کردووە ژمارەی ئەوانەی لەپڕ دەمردن لە زیادبووندایە!" بیرم کردووە لەوانەیە ئەمە پەتا نەبێ. لە بارەی نیشانەکانی نەخۆشییەکەوە پرسیارم لێ کرد. خۆجە پێکەنینی پێم هات، گوتی: "پێویست ناکات خۆت نیگەران بکەی. هەر کاتێک تووش بووی، ئەوا بێ هیچ گومانێک بە تووشبوونی خۆت دەزانی. بۆ تێگەیشتنی ئەمە، مرۆڤ ئەوەندەی بەسە سێ ڕۆژ بە ئاگری نەخۆشییەکەوە بسووتێ. هەندێک کەس لەژێر گوێ و بن باڵ و سەر سکیان دوومەڵ و قنچکە دەردێ و دواتریش لەرزوتا تاویان بۆ دێنێ. هەندێ جار برینەکان دەتەقنەوە و جاروباریش خوێن لە جگەریان دێتە دەرەوە. کەسانێکیش هەبوون وەک تووشبووانی ژانی زراو، بەدەم کۆکینەوە مردوون." درێژەی دایێ و گوتی: "لە هەر گەڕەکێک چوار پێنج کەسێک تێداچوون." بە پەرۆشەوە پرسیاری گەڕەکی خۆمانم کرد. گوتی: "مەگەر نەتبیستووە ئەو وەستای دیوارەی کە بەهۆی ئەوەی منداڵان سێوی باخچەکەیان دەخوارد و مریشک بەسەر دیوارەکانیدا دەچوونە حەوشەکەیەوە، بەردەوام لەگەڵ خەڵکی گەڕەک لە شەڕدابوو، هەفتەیەک لەمەوبەر بەدەم تا و هاوارەوە مردووە.

ئێستا هەموو کەسێک دەزانێ بە پەتاکە مردووە."

دیسانیش نەمدەویست بڕوا بکەم. هەموو شتێک لە دەرەوە هێندە ئاسایی بوو و ئەو کەسانەی بە بەردەم پەنجەرەکەدا تێ دەپەڕین، ئەوەندە هێمن و لەسەر خۆبوون، بەجۆرێک پێم وابوو پێویستە کەسێک بدۆزمەوە بۆ ئەوەی شپرەزیی و پەرۆشیی خۆمی لەگەڵدا دابەش بکەم. سەرلەبەیانیی ڕۆژی دوایی، پاش ئەوەی خۆجە بۆ دەرسخانە چوو، من دەرپەڕیمە دەرەوە. بەدوای ئەو خێزانە ئیتاڵییە لە ئاین وەرگەڕاوانەدا گەڕام کە توانیبووم لە ماوەی یازدە ساڵ مانەوەمدا لەوێ بیانناسم. یەکێکیان، بە ناوە تازەکەی، مستەفا ڕەیس، چووبوو بۆ کارخانەی دروستکردنی کەشتی. ئەوی تریان، عوسمان ئەفەندی، سەرباری ئەوەی شێتانە بە دەرگای ماڵەکەیمدا دەکێشا، لە پێشدا دەرگای لێم نەکردووە. بە غولامەکەی گوت پێم بڵێ لە ماڵ نییە، بەڵام دواتر خۆی بۆ ڕانەگیرا و لە دوواوە بانگی کردم و گوتی: "چۆن وا دەبێ؟ تازە بەتازە دەپرسی داخۆ نەخۆشییەکە ڕاستە! مەگەر ئەو دارەبازانە نابینی بەسەر شانی خەڵکەوە؟" پاشان گوتی: "بە ڕووتدا تێ گەیشتووم دەترسیت. بۆیە دەترسیت، چونکە هێشتا پێ لەسەر کرستیانبوونی خۆت دادەگری!" لۆمەی کردم: "مرۆڤ ئەگەر بخوازێ لێرە کامەران بێ، پێویستە بچێتە سەر ئاینی ئیسلام." بێ ئەوەی تەوقەم لەگەڵدا بکات و دەستم پێوە بدات، چووەوە ماڵە تاریک و شێدارەکەی خۆی. کاتێک ئاپۆڕەی حەوشی مزگەوتەکانم بینی، ترسم لێ نیشت و بەپەلە گەڕامەوە بۆ ماڵەوە. ئەو گەمژەیی و سەرسوڕمانەم پێوە دیار بوو کە لە ساتەکانی کارەساتدا بە مرۆڤەوە دیارە. وەک بڵێی ڕابردووی خۆیشم لە بیر کردبوو. ڕەنگی بیرەوەرییەکانم کاڵ بووبووەوە و هەستم دەکرد لە دەست و پێ کەوتووم. بە بینینی دەستەیەک خەڵک لە کۆڵانەکەدا کە دارەبازەیەکیان هەڵگرتبوو، بەجارێک قەڵەمی ئەژنۆم شکا.

خۆجە لە دەرسخانە گەڕایەوە، هەستم کرد دڵخۆشە بە بینینیم لەم بارەدا. دەمبینی لەبەرئەوەی من بە ترسنۆک دەزانێ، متمانەی بەخۆی زیاتر دەبێ و ئەمەش منی پەست دەکرد. ویستم هەرچۆنێک بووە لەو چاوقایمی و نەترسانە لووتبەرزانەیەی خۆی ڕزگاری بێ. بەدەم هەوڵدانەوە بۆ جڵەوکردنی هەڵچوون و

خـرۆشـی خـۆم، هـەرچـی زانسـتـی پـزیشـکـی و ئـەدەبـیم هـەبـوو، هـەمـوویـم خـسـتـە ڕوو. هـەرچـی دیـمـەنێکی پەتا کـە لـە هـیـپـۆکـرات و تـوکـیـدیـدەس و بـۆکـاچـیـۆوە لـە بـیـرەوەریـمـدا مـابـووەوە، هـەمـوویـم گـێـڕایـەوە و گـوتـم ئـەم نـەخـۆشـیـیـە پـەتـایـە، بـەڵام قـسـەکـانـم جـگـە لـەوەی کـە مـنـیـان سـووک و ڕیـسـواتـر هـێـنـایـە بـەرچـاوان، بـەکـەڵکی هـیـچـی تـر نـەهـاتـن. خـۆجـە گـوتـی: "لـەم پـەتـایـە نـاتـرسـم، چـونـکـە نـەخـۆشـی بـە دەسـتـی خـوایـە، مـرۆڤ ئـەگـەر سـاتـی مـردنـی نـزیـک بـووبـێـتـەوە، دەمـرێ. بـۆیـە تـرسـی پـڕوپـووچـت و خـۆخـزانـدنـە کـونـی مـــاڵەوە و پـێــوەنـدی بـڕیـن لـەگـــەڵ دەرەوەدا و تـەنـانـەت هـەوڵدان بـۆ ڕاکـــردنـیـش لـە ئـەسـتـەنـبـوڵ بـێ سـوودە. مـردن لـە چـارەی هـەمـوومـان نـووسـراوە و لـە هـەر شـوێـنـێـک بـین، دەمـانـدۆزێـتـەوە و دەمـانـگـاتـێ. بـۆچـی دەتـرسـی؟ لـەبـەر ئـەو خـراپـەکـارییـانـەی کـە چـەنـدیـن ڕۆژە لـەسـەر کـاغـەز دەیـانـنـووسـیـتـەوە؟" ئـەمـەی دوایـیـیـانـی بـەدەم زەردەخـەنـەیـەکـەوە گـوت. چـاوەکـانـی بـە ئـومـێـدەوە دەدرەوشـانـەوە.

تـا ئـەو ڕۆژەی لـە یـەکـدی جـیـابـووینـەوە، نـەمـتـوانـی تـێ بـگـەم داخـۆ بـاوەڕی بـەم گـوتـانـەی خـۆی هـەیـە یـان نـا. بـۆ سـاتـێـک لـە بـێ پـەروایـیـیـەکـەی تـرسـام. دواتـریـش کـاتـێـک وتـوێـژی دەوری مـێـزەکـەمـان و ئـەو گـەمـە تـرسـنـاکـانـەم بـیـر دەکـەوتـەوە، گـومـانـیـشـم پـەیـدا کـردبـوو. گـڕگـڕ قـسـەی دەهـێـنـایـەوە سـەر ئـەو خـراپـەکـارییـانـەی کـە بـەرامـبـەر یـەک دادەنـیـشـتـین و دەمـانـووسـی و بـە لـە خـۆبـایـیـبـوونـەوە هـەمـان پـاسـاوی دەهـێـنـایـەوە و وای لـە مـن دەکـرد لـە پـێـسـتـی خـۆم بـێـمـە دەرەوە: "بـەپـێـی ئـەوەی هـێـنـدە لـە مـردن دەتـرسـی، هـیـچ نـەتـتـوانـیـوە بـەسـەر ئـەو خـراپـەکـارییـانـەتـدا زاڵ بـی کـە بـە ڕواڵەت وا دیـارە زۆر بـوێـرانـە تـۆمـاریـان دەکـەی. ئـەو بـوێـریـیـەی بـۆ خـسـتـنـەڕووی گـونـاهـەکـانـت نـیـشـانـت داوە، سـنـووری بـێ ئـابـڕووییـیـەکـی سـادە زیـاتـر تـێ نـاپـەڕێـنـێ!" ئـەمـە لـە کـاتـێـکـدا خـۆجـە دەبـوو لـەو ڕۆژانـە کـە تـووشـی بـێ بـڕیـاری هـاتـبـوو، زۆر بـەوردی لـە بـچـووکـتـریـن خـراپـەکـاریـی خـۆی بـکـۆڵـیـبـایـەوە. ئـیـدی دەروونـی ئـاسـوودە بـووبـوو، ئـەو چـاوقـایـمـیـیـە بـەهـێـزەی لـە بـەرامـبـەر پـەتـاکـەدا نـوانـدی، ئـەوی لـە نـاخـەوە هـێـنـابـووە سـەر ئـەو بـاوەڕەی کـەسـێـکـی بـێ تـاوانـە.

نـەفـرەتـم لـەو لـێـدوانـانـە کـرد کـە بـە دەبـەنـگـیـی خـۆم بـاوەڕم پـێ هـێـنـابـوو و بـڕیـارم دا بـەرەنـگـاری بـبـمـەوە. ڕێـک و ڕەوان پـێـم گـوت نـەتـرسـانـەکـەی لـە ئـاسـوودەیـیـی دەروونـیـیـەوە

سەرچاوە ناگرێ، بگرە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی نازانێ مردن چەندێک لێوەی نزیکە. باسی ئەوەم بۆ کرد چۆن مرۆڤ دەتوانێ خۆی لە مردن بپارێزێ. گوتم پێویستە دەست نەدرێتە کەسانی تووشبوو بە پەتاکەوە. مردووەکان لە چاڵی گەچیندا بنێژرێن. پێوەندیی نێوان مرۆڤەکان بۆ نزمترین ئاست دابگیرێ و خۆجەش نەچێتە ئەو دەرسخانە قەرەباڵغە.

ئەم قسەیەی دوایم شتی خراپتر لە پەتاکەی بە خەیاڵیدا هێنابوو! دوانیوەڕۆی ڕۆژی دواتر گوتی دەستی داوەتە یەکە بە یەکەی منداڵەکانەوە و دەستی بۆ لای من درێژ کرد. کاتێک بینی ترسام و نامەوێ دەستی پێوە بدەم، بە کەیفەوە لێم نزیک کەوتەوە و لە ئامێزی گرتم. ویستم هاوار بکەم، بەڵام وەک کەسێک لە خەون بینیندا بێ، نەمدەتوانی هاوار بکەم. خۆجەش بە قەشمەری پێکردنێکەوە، کە زۆر دواتر بۆم ئاشکرا بوو، دەیگوت فێری نەترسیت دەکەم.

## 6

پەتاکە زۆر بەخێرایی تەشنەی دەکرد، بەڵام من چەندی کردم و کۆشام نەمتوانی لەو شــتــە بگەم کــە خــۆجــە بە چاوقــایمی و ئـازایەتـی ناوی دەبرد. وەک چەند ڕۆژی ڕابردوویش خـۆم نەدەشــاردەوە. خـۆ خـزاندنە کونی ژوورەوە وەک ژنـی نەخـۆشـی ناو جـێگا و چەندین ڕۆژ لە پەنجــەرەوە ســەیرکــردنی دەرەوە، ئۆقــرەی لەبەر بڕیبــووم. جـاروبار لە ماڵ دەردەپەڕیم و وەک ســەرخـۆش دەچوومە کوچە و کۆڵانەکان. ســەیری ژنانی کـڕیاری بـازاڕ و کـاسب و ئەربابی ســەرقـاڵی کـار لە دوکـانـەکـانـیـاندا و ئەو کەسانەم دەکرد کە دوای بەخاک سپاردنی کەسوکاریان لە چایخانەکان کۆدەبوونەوە و هەوڵم دەدا خــۆم لەگــەڵ پەتاکــەدا ڕابهـێنم. لەوانەش بوو بـتـوانم خـۆمی لـەگـەڵدا ڕابهێنم، ئەگەر خۆجە ئەوەندە تەنگاوی نەکردمایە.

شـەوانە دەستـەکانی خۆی، کە دەیگووت بەدرێژاییی ڕۆژ بەدەسـتی خـەڵکی تریەوە داوە، بۆ من درێژ دەکـرد. بێ ئەوەی جــووڵەم لێـوە بـێ، لە چاوەڕوانیـدا دەمــامــەوە: کتومت وەک ئەوەی لە خەو ڕابیت و ببینیت وا دووپشکێک بەسەر لەشتدا دەگەڕێ و تۆش وەک بەرد لە شـوێنی خـۆتدا وشک بیت! پەنجەکانی کە لەوانەی من نەدەچوون، بە سـارد و سڕی بەسـەر جەسـتـەمدا دەگێڕا و دەیپرسـی: "دەترسـی؟" من جـووڵەم لە خــۆم دەبڕی. "دەترسی، بـۆچی دەترسـی؟" جــاری وا هـەبوو بـە خــەیاڵـمــدا دەهات دەســتی بگێڕمـە دواوە و بیـانکێشـم بەیەکدا، بـەڵام سـوور دەمـزانی ڕەفـتـارێکی وا دەهریتـری دەکـات. "با من پێت بڵـێم بۆچی دەترسی. بۆیە دەترسـی، چونکە نوقـمی تاوانیت. بۆیە دەترسی، چونکە تۆ زیاتر باوەڕت بە منە وەک لەوەی من بە تۆم بێ."

هەر خۆیشی گوتی پێویستە لەبەردەم مێزەکە دابنیشین و چەند شتێک بنووسینەوە. پێی وابوو ئێستا باشترین کاتە بۆ نووسینەوەی ئەوەی کە بۆچی من منم. کەچی لە ئاکامدا جگە لەوەی بۆچی ئەوانی تر ئاوەهان، شتێکی تری تۆمار نەکرد. یەکەم جاری بوو بە لووتبەرزییەوە نووسینەکانی خۆی نیشانی من دەدا. لەبەر هەر هۆیەک بێ، بیرم لەوە کردەوە لەوانەیە چاوەڕێ بکات دوای خوێندنەوەی نووسینەکانی، من شەرم دامبگرێ. بەڵام نەفرەتی خۆم بۆ نەشاردرایەوە و بە خۆجەم گوت لەگەڵ گەمژەکانی لەمەڕ خۆیدا دەیخەمە تای هەمان تەرازووەوە و ئەوەشم نایە چنگی کە ئەو بەر لە من دەمرێ.

لەو کاتەدا هاتبوومە سەر باوەڕێک ئەو وشانە کاریگەرترین چەکی دەستی من بوون. بەدوای ئەوەدا کاری دە ساڵی ڕابردووم هێنایەوە بیری: لەمەڕ ئەو ساڵانەی بۆ دانانی بیردۆزەی کۆسمۆگرافی بە خەرجی دابوون، ڕامانی چەندین سەعاتە لە ئاسمان کە نرخەکەی بە تێکچوونی چاوەکانی لە سەری کەوتبوو و لەبارەی ئەو ڕۆژانەوە قسەم بۆ کرد کە ئامادە نەبوو سەر لەسەر کتێبەکانی هەڵبگرێ. ئەمجارەیان من بەسەر ئەودا چووم، گوتم: "لە کاتێکدا بکرێ خۆمان لە پەتاکە بپارێزین و بتوانین بژین، بێ ئەقڵییە ئەگەر بەلاش و حەلاش خۆمان بدەینە دەم مردنەوە." پەیڤەکانم، هاوکات لەگەڵ بەرزبوونەوەی ڕادەی گومان تیایاندا، سزادانی ئەویان لە لایەن منەوە زیاتر دەکرد. لەو ساتەدا هەستم کرد لەگەڵ خوێندنەوەی نووسراوەکانی من، خەریکە بەبێ ویستی خۆی ئەو ڕێزە دەدۆزێتەوە کە پێشتر بەرامبەر بەمن هەیبوو و دواتر لە دەستی دابوو.

بەمەبەستی لە بیرکردنی بەدبەختی و کڵۆڵیی خۆم، لەو ڕۆژانەدا چەندین لاپەڕەم بەو خەونە بەختەوەرانە پڕ کردەوە کە نەک بەتەنیا لە شەودا، بگرە لە ساتەکانی نیوەڕۆخەویشدا چەندین جار دەمبینین. لەدوای هۆشیاربوونەوەم و بۆ لە بیرکردنی هەموو شتێکی تر، بە زمانێکی شیعرئامێز و بەوپەڕی وردەکارییەوە دەستم دەکرد بە نووسینەوەی خەونەکانم کە لە واتە و ڕەوتدا لەیەک دەچوون: لە ناو دارەکانی دارستانی پشت ماڵەکەماندا مرۆگەلێکی ڕازدار دەژیان کە ساڵانێکی درێژ بوو پەرۆشی زانینی نهێنییەکانیان بووین و ئەگەر مرۆڤ بیوێرابایە بچێنە تاریکایی

قـەراغ دارسـتـانەكـەوە، ئەوا لەگـەڵیـان دەبوو بـە دۆست؛ لەگـەڵ ئاوابوونی ڕۆژدا سێبەرەكانمان لە ناو نـەدەچوون، بگرە دەستاودەستیـان بە هەزاران شتی بچووكی پێویست بۆ فێربوون دەكرد و ئێمە بێ ماندووبوون لە كاتی ڕاكشـان لە ناو پێخـەوە فـێنك و خـاوێنەكـانماندا هەسـتمـان پـێ دەكـرد؛ مـرۆڤـەكـانی ناو ئەو وێنـانەی لە خـەونەكانمدا دەمكێشـان، وەک مـرۆڤی جـوانی سێ ڕەهـەندی نەدەمـانـەوە، بگرە لە چوارچێوەی خـۆیان دەهاتنە دەرێ و تێكەڵ بەخـۆمـان دەبوون؛ دایكم، باوكم و من لە باخـچەی پشـتەوەی مـاڵەكەمـاندا خـەریكی دانـانی ئامێرگەلی پۆلاین بووین كـە دەبوو لەجێی ئێمە كارەكان لە ئەستۆ بگرن.

خـۆجـە بێ ئاگـا نەبوو لەوەی ئەم خـەونانە تەڵە و داوی ئیبلیسـین بۆ بەكێشكردنی ئەو بـۆ ناو تاریكاییی زانیـاریی نەمـر. بـەڵام سـەرەڕای ئەوەش، هەرچـەندە سـوور دەیزانی لە هەر پرسیاركرندێكیدا كەمێک زیاتر لە متمانەی خۆی دەدۆڕێنێ، لە منی دەپرسـی: "ئەو خـەونە تەوش و تورەهـاتانە واتـەی چ دەگـەیـەنن؟ ئایا بـەڕاسـتی ئەو خـەونـانە دەبینی؟" بەوجـۆرە، ئەو شـتـەی دوای چەندین سـاڵ پێكەوە بە سـوڵتـانمان كـرد، من بە ئەوم كـرد؛ لە خـەونەكـانمانەوە بـەرئەنجامم بۆ داهـاتووی هەردووكمـان دەردەهێنـا: ئاشكرایە لە كـاتی تەشـەنەكـردنی نەخـۆشـیـدا، مـرۆڤ هەروەک چۆن ناتوانێ لە دەسـتی ڕابكات، بەهەمـان شـێوە ناتوانێ دەسـتـبـەرداری زانسـتیش بێ. هێندە چەتوونیش نەبوو بە خـۆجـە بڵێم نەخـۆشـییـەكە پەی بـە ئەویش بردووە، بەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا پەرۆشـی زانینی خـەونەكـامـی خـۆجـە بووم! بـەئاشكرا بـەدەم پێ ڕابواردنەوە گـوێی بۆم ڕاگـرتـبـوو، بەڵام لەبـەرئەوەی بە پرسـیـاركـردن پۆتـی خـۆی شكاندبوو، نەیدەتوانـی هێندە پێم لێ بكات بـە كـەوشـدا و لە كـاتی گـێـڕانەوەشـدا دەمـبـینی قـسـەكـانم لە ڕادەی پەرۆشـیی ئەو دەبەنە سـەرێ. كـاتێک هەسـتم دەكـرد خـەریكە ئـەو دڵنیـاییـیـەی لە سـەرەتای تەشـەنەكـردنی پەتاكەوە هەسـتی پێ دەكـرد، شلۆق دەبێ، گـەرچی ترسم لە مـردن كـەم نەدەبووەوە، بەڵام پێم وابـوو هـەر هیـچ نەبێ لە بەتەنیـایی ترسان ڕزگـارم دەبێ. بێگومان نرخی ئەمـەم لە ئەشكەنجەدانی شـەوان دەدا، بـەڵام ئیدی گـەیشـتبـوومـە ئەو ئاكـامـەی تێكۆشـانەكەم لە خـۆڕایی نەبووە: هـەر كـاتێک خـۆجـە دەسـتی لێم بەرز دەكـردەوە، بیـرم دەخسـتـەوە ئـەو بەر لە من دەمـرێ.

نەزانیی ئەوانەی ناترسن و نووسینە نیوەناچڵەکانی و ئەو خەونە کامەرانانەی خۆم بیر دەخستەوە کە ئەوێ ڕۆژێ خوێندبوونیەوە.

بەڵام جامی ئەو بە قسەکانی من نا، بە شتێکی تر پڕ بوو. ڕۆژێک باوکی یەکێک لە قوتابییەکان هات بۆ ماڵ. بە ڕوویدا پیاوێکی جوامێر دیار بوو، لە گەڕەکی خۆمان دادەنیشت. من وەک پشیلەی تەمبەڵی ماڵەوە خۆم خزاندبووە گۆشەیەکەوە و گوێم ڕاگرتبوو. بە دووروودرێژی لەبارەی چەند بابەتێکەوە قسەیان کرد. دواتر میوانەکەمان هاتە سەر کرۆکی مەبەست: کچی پوورەکەی، پاش ئەوەی پیاوەکەی هاوینی پار لە کاتی سواغدانی سەربان‌دا کەوتووەتە خوارێ و مردووە، بە بێوەژنی ماوەتەوە. ئێستا داخوازیکاری زۆری هەیە، بەڵام ئەو خۆجەی بە خەیاڵدا هاتووە، چونکە لە دانیشتووانی گەڕەکی بیستووە خۆجە پێشوازی لە هەندێ کەس کردووە کە بەنیاز بوون ژنی بۆ بدۆزنەوە. خۆجە کاردانەوەیەکی هێندە توندی نیشان دا من هەرگیز چاوەڕێم نەدەکرد: بە کابرای گوت نایەوێ ژن بهێنێ و تەنانەت ئەگەر ژنیش بخوازێ، بێوەژن ناهێنێ. بەدوای ئەوەدا میوانەکەمان بیری خۆجەی خستەوە کە موحەمەد بێ ئەوەی گوێ بە بێوەژنیی حەزرەتی خەدیجە بدات، خواستوویەتی و کردوویەتی بە ژنی یەکەمی خۆی. خۆجەش گوتی ناوی بێوەژنەکەی بیستووە و گوتی تەنانەت ناگات بە نینۆکی حەزرەتی خەدیجەدا. پاشان میوانە لووت سەیرەکەمان ویستی لە خۆجە بگەیەنێ کە خۆیشی کابرایەکی هێندە دانسقە نییە و گوتی: "من خۆم بڕوا ناکەم، بەڵام خەڵکی گەڕەک دەڵێن خۆجە ڕەپ و ڕاست هۆشی لە دەست داوە. کەسیش نییە سەیرکردنی ئاسمانت و گەمەکردنت بە زەڕەبین و دروستکردنی سەعاتی سەیروسەمەرەت بە باشە لێک بداتەوە." میوانەکەمان، وەک بازرگانێکی چاوچنۆک کە هەوڵ دەدات بۆ شکاندنی بەهای ئەو کاڵایەی دەیەوێ بیکڕێ، درێژەی دایێ و گوتی: "خۆجە بۆ نان خواردن چۆک دانادات و چوارمشتەقی دانانیشێ، بگرە گاورئاسا لەسەر مێز نان دەخوات. دوای ئەوەی بە توورەکە پارە بە کتێب دەدات، کتێبەکان لەسەر زەوی فڕێ دەدات و پێ بەو لاپەڕانەدا دەنێ کە ناوی پێغەمبەریان تێدایە. لەبەرئەوەی دوای چەندین سەعات سەیرکردنی ئاسمان ناتوانێ ئیبلیسی ناو هەناوی خۆی ئاسوودە بکات، لەبەر تیشکی ڕۆژ لەسەر پێخەوەکەی ڕادەکێشێ و سەیری بنمیچی قرێژاویی ماڵەکەی دەکات. دەرودراوسێ دەڵێن: خۆجە

تەنیا خۆشیی بەچارەی کوڕاندا دێتەوە، نەک ژنان. ئەو پیاوەی ماڵەوە هاوجمکێتی و چەند ڕۆژێکیشی لە ڕۆژووی ڕەمەزان خواردووە، بۆیە ئەم پەتایە بڵاوبووەتەوە."

دوای ئەوەی میوانەکەمان دەرکرایە دەرەوە، خۆجە تووشی تەنگژەی هەڵچوون بوو. دڵنیابووم ئەو ئارامییەی لە ئەنجامی هاوسۆزی نیشاندان لەگەڵ ئەوانی تردا هەستی پێ دەکرد، کۆتاییی پێ هاتووە. بۆ ئەوەی دواین جەزرەبەی لێ هەستێنم، گوتم ئەوانەی لە پەتاکە ناترسن وەک ئەو کابرایە دەبەنگن. شڵەژا، بەڵام ڕوونی کردەوە خۆیشی لە پەتاکە ناترسێ. لەبەر هەر هۆیەک بێ خۆم قایل کرد بەوەی ئەم قسەیەی لە ناخەوە کردبێ. زۆر توڕە بوو، جێیەکی نەدەدۆزیەوە دەست و قۆڵی خۆی بۆ ببات. دیسانەوە بالۆرەی "گەمژەکان"، کە ماوەیەک بوو لە بیری کردبوو، کەوتەوە سەر زمانی و دووبارەی دەکردەوە. دوای داهاتنی تاریکی، فانۆسەکەی داگیرساند و لە ناوەڕاستی مێزەکەدا داینا و داوای کرد هەردووکمان لەبەردەمیدا دانشین. پێویست بوو چەند شتێک بنووسین.

وەک دوو کوڕی زگورتی کە بۆ بەسەربردنی شەوە درێژ و نەبڕاوەکانی زستان گەمەی کاغەز دەکەن، لە بەرامبەر یەک لەمبەر و ئەوبەری مێزەکە دانیشتبووین و لە سەر کاغەزە بەتاڵەکانی بەردەممان شتمان دەنووسییەوە. خۆمانم زۆر سەیر دەهاتە بەرچاو! لەوەش سەیرتر، نووسینەکانی خۆجە بوو، کە بەیانیی ڕۆژی دواتر خوێندیەوە و خۆی بە خەون ناوی بردن. وەک لاساییکردنەوەیەکی خەونەکانی من، ئەویش خەونێکی گێڕایەوە، بەڵام بەهەموو شتێکیدا دیاربوو ئەوە خەونێکی نەبینراوە: لە خەونی ئەودا ئێمە برا بووین! خۆی ڕۆڵی براگەورەی منی بەخۆی ڕەوا بینیبوو، منیش ئاقڵ ئاقڵ گوێم بۆ قسە زانستییەکانی ڕاگرتووە. سەرلەبەیانیی ڕۆژی دواتر، لە کاتێکدا تاشتیمان دەخوارد، لە منی پرسی داخۆ چۆن بۆ واتەواتی خەڵکی گەڕەک سەبارەت بەوەی ئێمە دووانەین، دەڕوانم؟ ئەم پرسیارەم پێ خۆش بوو، بەڵام ختووکەیەکی ئەوتۆی شکۆشمی نەدا . دوو ڕۆژ دواتر لە نیوەی شەودا هۆشیاری کردمەوە و گوتی بەڕاستی خەونێکی بینیوە. لەوانەیە ڕاستیشی گوتبێ، بەڵام من، لەبەر هەر هۆیەک بێ، گوێم نەدایێ. شەوی دواتر گوتی لەوە دەترسێ بە پەتاکە بمرێ.

بەهۆی بێـزاربوونمەوە لە مـانەوەی زۆر لـە مـاڵەوە، لای ئێـوارە چوومـە کـوچە و کۆلانان. لە باخچەیەکدا، مندالان چووبوونە سەر دارەکان و پێلاوە ڕەنگینەکانیشیان لە خوارەوە جێ هێشـتبوو. دەستـەیەک ژنی چەنەباز بەدەوری کانییـەکەوە ڕیزیان بەستبوو و تەنانەت بە تێپەڕبوونی منیش بەلایاندا بێدەنگ نەبوون. بازاڕ پڕ بوو لە کڕیار. هەندێک بە لەزەتەوە سەیری شەڕکەران و ناوبژیوانانیان دەکرد. هەوڵم دەدا باوەڕ بـەخـۆم بهـێنم کـە پەتاکـە تـەوژمی خـۆی لەدەست داوە، بەڵام بەبینینی ئەو دارەبازانەی یەک بەدوای یەک لە مزگەوتی بایەزیدەوە دەهێنرانە دەرێ، دەمارەکانی مێشکم گرژ بوونەوە و بەلەز گەڕامەوە ماڵەوە. لەوەدا بووم بچمە ژوورەکەی خۆم، خۆجە بانگی کرد: "ئا وەرە سەیرێکی ئەمە بکە." قۆپچەی کورتەکەکەی کردبووەوە و ئاماژەی دەکرد بۆ دوومەڵێکی بچووک و قنچکەیەکی ژێر سکی. گوتی: "مەگەز هەموو شوێنێکی تەنیوەتەوە." لێی نزیک بوومەوە و بەوردی سەرنجم دا، پەڵەیەکی سووری بچووک بوو، دوومەڵێکی سووکەڵە، وەک جێی گەستنی مەگەزێک. بەڵام بۆچی نیشانی منی دەدا؟ ترسام ڕووی خۆم زیاتر نزیک بخەمەوە. خۆجە گوتی: "جێی گازی مەگەزە، وا نییە؟" نووکی پەنجەی خستە سەر دوومەڵەکە: "یان کێچە؟" بێدەنگ بووم. نەمگوت هەرگیز جێگازی لەو جۆرەی کێچم نەبینیوە.

بیانووییەکم دۆزییەوە و تا ڕۆژ ئاوابوون لە باخچەکە مامەوە. هەستم دەکرد دەبێ چی دی لە ماڵەوە نەمێنم، بەڵام شوێنێکم لە خەیاڵدا نەبوو بۆی بچم. پەڵەکەی ژێر سکی خۆجە لە جێی گەستنی مەگەز دەچوو، بەڵام بەقەد برینی پەتایەک گەورە و بەرین نەبوو. پاشان شتێکی ترم بە خەیاڵدا هات کە ڕەنگە هۆیەکەی بۆ پیاسەکردنم بەناو گیای خێرا گەشە کردووی باخچەکەدا بگەڕێتەوە: بیرم لەوە دەکردەوە پەڵە سوورەکەی لە ماوەی دوو ڕۆژدا دەئاوسێ، وەک گوڵێک دەم دەکاتەوە و دەتەقێتەوە و خۆجە بەدەم ئازارەوە گیان دەسپێرێ. دەمویست پێی بڵێم ئەوە جێی گەستنی مەگەزی زەبەلاح و شەوگەڕی ولاتێکی زۆر گەرمە، بەڵام هەرچەندی کۆشام ناوی ئەو مەگەزەی خەیاڵم لێ دابوو، نەدەکەوتە سەر زمانم.

ئێوارە، کاتێک بۆ خواردن دانیشتین، خۆجە دەکۆشا خۆی کەیفساز نیشان بدات. گەمەی کرد، سەری نایە سەرم، بەڵام ئەمە زۆری نەخایاند. پاش هەستانی

بێدەنگمان لەسەر خواردنەکە و ساتێکی درێژ دوای سنگدادانی تاریکییەکی بێ هەوا و ئارام، خۆجە گوتی: "هەست بە بێزاری دەکەم، بیرۆکەیەکم بۆ هاتووە، با بچینە بەردەم مێزەکە و شتگەلێک بنووسین." دەیگوت تەنیا بەو جۆرە دەتوانێ دڵی خۆی بداتەوە.

بەڵام نەیتوانی بنووسێ. من بەوپەڕی ئاسوودەییەوە دەمنووسی و ئەویش بێ کاروبار دانیشتبوو و بە تیلەی چاو سەیری منی دەکرد. گوتی: "چی دەنووسی؟" نووسیبووم چۆن دوای کۆتاییی ساڵی یەکەمی قوتابخانەی ئەندازیاری لە سەرەتای پشوو، بیری ماڵەوەم دەکرد و بە گالیسکەیەکی تاک ئەسپی گەڕامەوە، بەڵام لە هەمان کاتدا قوتابخانە و هاوڕێکانیشم زۆر خۆش دەویست. نووسیبووم زۆر بیری ئەو کتێبانەم کردووە کە لە پشوو لەگەڵ خۆم دەمهێنانەوە و بەتەنیا لە قەراغ سەرچاوەیەکی ئاو دەمخوێندنەوە. دوای بێدەنگییەکی کورت، خۆجە، وەک ئەوەی نهێنییەک بدرکێنێ، بە چرپە پرسی: "ئایا ئەوانەی ئەوێ بەردەوام بەو شێوەیە بە کامەرانی دەژین؟" وامزانی دوای لێبوونەوە لە پرسیارەکەی، یەکسەر پەشیمان دەبێتەوە، بەڵام هێشتا بە پەرۆشێکی منداڵانەوە سەیری منی دەکرد. منیش بە چرپە گوتم: "من کامەران بووم!" سووکە ئێرەیی پێبردنێک کەوتە سەر ڕووی، بەڵام ترسناک نەبوو. بە شەرم و دوودڵییەوە دەستی بە گێڕانەوە کرد:

ئەو سەردەمەی لە ئەدرنە بووە و دوازدە ساڵان بووە، ماوەیەک لەتەک دایک و خوشکیدا هاتوچۆی تیمارخانەی مزگەوتی بایەزیدی کردووە، چونکە باوکی دایکی نەخۆشیی گەدەی هەبووە. بەیانیان بەرلەوەی بەڕێ بکەون، دایکی، براکەی تری لای هاوسێکان جێ هێشتووە. خۆجە و خوشکەکەی و قاپی موحەلەبیی پێشتر ئامادەکراوی هەڵگرتووە و پێکەوە کەوتوونەتە ڕێ. هەموو جارێک بە ڕێگایەکی کورت، بەڵام زۆر دڵگیر بەژێر سێبەری ئەسپینداردا تێ پەڕیون. باپیریان بەسەرهاتی بۆیان گێڕاوەتەوە. خۆجە حەزی لەو بەسەرهاتانە نەبووە، زیاتر ئارەزووی بینینی ناو تیمارخانەکەی کردووە، بۆیە هەموو جارێک ئەوانی تری بەجێ هێشتووە و سەیری دەوروبەری کردووە. جارێک لەژێر قوبەیەکی زۆر گەورەدا کە تیشکی ڕۆژی دزەکردوو لە کڵاوڕۆژنەکانەوە ڕووناکی کردووەتەوە، گوێی لە

مۆسیقایەک بووە کە بۆ کەسانی تووشبوو بە نەخۆشیی دەروونی ژەندراوە. دەنگی ئاویش هاتووە، ئاوی زێ. دواتر بە چەند ژوورێکی لە شووشە و قاپی درەوشاوەی دەگمەن و ڕەنگیندا گەڕاوە. جارێک ڕێی لێ ون بووە و دەستی بەگریان کردووە. ژوور بە ژووری تیمارخانەکە گەڕاندوویانە تا عەبدوڵا ئەفەندییان دۆزیوەتەوە. دایکی جاروبار گریاوە، ناوبەناویش لەگەڵ کچەکەیدا گوێیان بۆ چیرۆکەکانی باپیرە ڕاگرتووە. دواتر، قاپە بەتاڵەکەیان لە باپیرە وەرگرتووەتەوە و گەڕاونەتەوە، بەڵام بەرلەوەی بگەنەوە ماڵ، دایکی حەلوای بۆیان کڕیوە و گوتوویەتی با بێ ئەوەی کەس بمانبینێ، بیخۆین. لە ناو ئەسپیندارەکانی قەراغ ئاوەکەدا شوێنێکیان هەبووە، هەرسێکیان دانیشتوون و لاقیان بۆ ناو ئاوەکە درێژ کردووە و بێ ئەوەی کەس چاوی پێیانەوە بێ، حەلوایان خواردووە.

کاتێک خۆجە کۆتاییی بە قسەکانی هێنا، بێدەنگییەک، کە ئێمەی لە یەکدی نزیک دەخستەوە، باڵی بەسەرماندا کێشا و هەستێکی سەیری برایەتیی لامان دروست کرد کە هەردووکمانی نائارام دەکرد. خۆجە ساتێکی درێژ بەرگەی ئەم نیگەرانییەی گرت. دواتر، کاتێک دەرگای گەورەی ماڵێکی نزیکمان بێ بیرکردنەوە و بەدەم زرمەیەکی گەورەوە پێوە درا، خۆجە گوتی: "یەکەمجار لەو کاتە بەهۆی نەخۆشەکان و ئەو شووشە و قاپە ڕەنگاوڕەنگ و تەرازووانەوە کە شیفای پێیان دەدا، خووم دایە زانست." بەڵام دوای مردنی باپیری، بۆیان نەلواوە جارێکی تر بچنەوە ئەوێ. ئیدی خۆجە بەردەوام لە خەیاڵی خۆیدا بیر دەکاتەوە هەر کاتێک پێ گەیشت و گەورە بوو، بەتەنیا بۆ ئەوێ بچێ. بەڵام ساڵێک ئاوی ڕووباری تونجا سەر دەکات. نەخۆشەکان لە جێگا دەردەهێندرێن و دوور دەخرێنەوە. ئاوی قرێژ و بۆگەنی ناو ژوورەکانی تیمارخانەکە تا ماوەیەکی درێژ ناکشێتەوە. دوای کشانەوەش، تیمارخانە جوان و دڵگیرەکە لە قوڕ و لیتەیەکی بۆگەن و بە نەفرەت کراودا دەمێنێتەوە و تا ساڵانێکی درێژ خاوێن ناکرێتەوە.

ئەمجارەیان کە خۆجە بێدەنگ بوو، چیدی هەستمان بە نزیکیی نێوانمان نەکرد. لەبەردەم مێزەکە هەستابوو، بە تیلەی چاو سێبەرەکەیم دەبینی کە بە ژوورەکەدا دەگەڕا. پاشان فانۆسی سەر ناوەڕاستی مێزەکەی هەڵگرت و چووە پشتمەوە، ئیدی

نە سێبەرەکەیم دەبینی و نە خۆی. ویستم خۆم بسووڕێنم و سەیری بکەم، بەڵام نەمتوانی، هەستم دەکرد لە چاوەڕوانیی خراپەیەکدام و نیگەرانم. دوای کەمێک گوێم لە خشەی داکەندنی جلێک بوو، بەترسەوە ئاوڕێکم دایەوە. لە ناوقەد بەرەو سەرەوەی ڕووت کردبوو. چووە بەردەم ئاوێنەکە، لەبەر تیشکی فانۆسەکە بە سەرنجەوە لە سنگ و سکی خۆی ورد بووەوە و گوتی: "ئەی خوا، ئەمە چ دوومەڵێکە؟" بێدەنگ بووم. گوتی: "ئا وەرە سەیرێکی ئەمە بکە." نەمدەتوانی لە شوێنی خۆم بجووڵێم. هاواری کرد: "گوتم ئا وەرە!" وەک یەکێک لە قوتابییەکانی خۆی لە کاتی سزادانی، بە ترسەوە لێی نزیک بوومەوە.

هەرگیز ئەوەندە لە جەستەی ڕووتی نزیک نەکەوتبوومەوە و حەزم بەو نزیکبوونەوەیە نەدەکرد. سەرەتا ویستم باوەڕ بەخۆم بهێنم تەنیا لەبەرئەوەیە نامەوێ لێی نزیک بکەومەوە، بەڵام دەمزانی لەبەر ترسانمە لە دوومەڵەکە. ئەویش لەمە حاڵی بوو. ئەمە لەو کاتەی تا وا تێ نەگات، سەرم لێ نزیک کردبووەوە و بە جۆری پزیشکێک چاوم لەو دوومەڵ و پەڵەکانی بریبوو و لەژێر لێوەوە بڵەبڵمێکم بۆ کرد. خۆجە لە ئاکامدا گوتی: "دەترسی، وا نییە؟" بۆ سەلماندنی نەترسانی خۆم، هێندەی دی سەرم لێی نزیک خستەوە. گوتی: "ترسی ئەوەت هەیە دوومەڵی پەتا بێ؟" وا ڕەفتارم کرد وەک ئەوەی ئەو وشەیەم نەبیستبێ. دەمویست بڵێم جێگازی مەگەزە، مەگەزێکی دەگمەن کە جارێک بە شوێنێکی لەشی منیشیەوە دابوو، بەڵام هێشتا ناوی ئەو بوونەوەرەم بە خەیاڵدا نەهاتبوو. خۆجە گوتی: "ئا دەستێکی لێ بدە! چۆن تێ دەگەی ئەگەر دەستی لێ نەدەی؟ سا دەی دەستێکم لێ بدە!"

کاتێک بینی دەستی لێ نادەم، خۆشحاڵی گرتی. پەنجەکانی بەسەر دوومەڵەکەدا هێنا و پاشان لە ڕووی منی نزیک خستەوە. کاتێک بینینی وا بە ڕق و نەفرەتەوە چارەی خۆم گرژ کردووە، قاقایەکی بۆ کرد. لەبەرئەوەی لە جێگازی بچووکی مەگەزێک دەترسم، کەوتە شۆخیکردن پێم، بەڵام ئەم شاگەشگەبوونەی زۆری نەکێشا. لەپڕ گوتی: "لە مردن دەترسم." وەک ئەوە وابوو لە بارەی شتێکی ترەوە بدوێ، لە شەرم زیاتر، تووڕەیی پێوە دیاربوو، تووڕەیی کەسێکی زۆر لێکراو. گوتی: "دڵنیای تۆ ئەم دوومەڵەت لێ نەهاتووە؟ ئادەی خۆت ڕووت بکەرەوە!" کاتێک زیاتر

پێی داگرت، وەک منداڵێک کە ڕقی لە خۆشووشتن دەبێتەوە، کراسەکەم داکەند. ژوورەکە گەرم و پەنجەرەکە داخرابوو، بەڵام لە شوێنێکەوە شنەیەکی فێنک هات، نازانم، لەوانەیە ساردیی ئاوێنەکە بووبێ مچورکەی پێمدا هێنابێ. لەبەرئەوەی شەرمم بە دیمەنی خۆم دەهاتەوە، هەنگاوێکم نا و لە چوارچێوەی ئاوێنەکە چوومە دەرەوە. ئەمجارەیان لە لایەکی ئاوێنەکەدا ڕووی خۆجەم بینی سەری لە جەستەی من نزیک دەخستەوە. ئەو سەرە زللە، کە هەموو کەس پێیان وابوو لە سەری من دەچێ، ئێستا بەلای جەستەمدا لار بووەتەوە. لەپڕ بە خەیاڵمدا هات ئەم ڕەفتارەی بۆ ژەهراویکردنی ڕۆحی منە. ئەمە لە کاتێکدا من تەواو بەپێچەوانەوە ڕەفتارم دەکرد و ساڵانێک بوو شانازیم بەوەوە دەکرد من ئەو فێر دەکەم. گەرچی ئەوەی بە خەیاڵمدا هات مایەی پێکەنین بوو، بەڵام بۆ ساتێک وای بۆچووم ئەو سەرە ڕیشنەی لەبەر تیشکی فانۆسەکەدا شەرمی لەبەر هەڵگیراوە، خەریکە خوێنم دەمژێ! لەو کاتەدا هەستم بە تام و چێژی ئەو بەسەرهاتە ترسناکانە دەکرد کە لە منداڵیمدا گوێم لێیان بووبوو. لەو بیرکردنەوانەدا بووم هەستم بە پەنجەکانی کرد لەسەر سکم. دەمویست هەڵبێم و شتێک بکێشم بە سەریدا. گوتی: "تۆ نیتە." چووە پشتمەوە، بن قۆڵ و مل و پشت گوێیەکانیشمی پشکنی. گوتی: "ئێرەشت هیچی پێوە نییە، مەگەز بە تۆوەی نەداوە."

دەستی خستە سەر شانم و هاتە تەنیشتمەوە. وەک ئەوەی برادەرێکی سەردەمی منداڵیی ئەو بم و گرێی دڵی خۆیم بۆ بکاتەوە، بە پەنجەکانی پشتی ملمی گوشی و منی بۆ لای خۆیەوە ڕاکێشا. گوتی: "وەرە با پێکەوە سەیری ئاوێنە بکەین." سەیرم کرد و لەبەر تیشکی درەوشاوەی فانۆسەکەدا جارێکی تریش لەیەکچوونی لە ڕادەبەدەری نێوان خۆمانم بینی. بیرم کەوتەوە، کاتێک لەبەردەم دەرگای والی سادق پاشا چاوەڕێم دەکرد و یەکەمین جار خۆجەم بینی، هەمان ئەم هەستەی ئێستام لا دروست بووبوو. ئەو کاتە کەسێکم بینی بوو کە دەبوو خۆم بوومایە. ئێستاش بیر دەکەمەوە دەبێ ئەویش کەسێک بێ وەک من. هەردووکمان یەکێک بووین! ئێستا ئەمەم جۆری ڕاستییەکی ڕوون دەهاتە بەرچاو. وەک ئەوەی دەست و پێم لە کۆت و زنجیردا بێ، بەگۆجی هەستامە سەر پێ. بۆ خۆدەربازکردن جووڵەیەکم کرد.

بەجۆرێک بڵێی بمەوێ بۆم دەربکەوێ ئاخۆ من منم، بەپەلە دەستم بە قژمدا هێنا. ئەویش زۆر شارەزایانە و بێ ئەوەی هاوشێوەی ناو ئاوێنەکە تێک بدات، هەمان شتی کرد. لاسایی نیگاکانیشی کردمەوە. ئەو، شێوەی ڕاوەستانی سەرم و سەرسوڕمانیشم کە من توانای سەیرکردنیم لە ئاوێنەکەدا نەبوو و لە ترساندا بۆم نەدەکرا نیگای لەسەر هەڵبگرم، دووبارە دەکردەوە. وەک منداڵێک، کە لاسایی قسە و جووڵەکانی هاوڕێیەکی بکاتەوە و پەستی بکات، شاگەشگە بووبوو. نەڕاندی: پێکەوە دەمرین! لە خەیاڵی خۆمدا گوتم چ توڕەهاتێکە. بەڵام ترساشم. ئەو شەوە، یەکێک بوو لە ترسناکترین ئەو شەوانەی لەگەڵ ئەودا بەسەرم بردبوو.

پاشان گوتی هەر لە سەرەتاوە لە پەتاکە ترساوە و هەموو شتێکیشی بۆ تاقیکردنەوەی من کردووە؛ وەک کاتێک جەلادەکانی والی سادق پاشاش منیان بۆ کوشتن داوەتە پێش خۆیان، یان وەک ئێستا کە خەڵکانی تر ئێمە بە جمک دەزانن. پاشان گوتی: "ڕۆحت لە لەپی دەستمدایە. کتومت وەک چۆن کەمێک لەمەوپێش لاسایی جووڵەکانتم کردەوە، لەمەودوا بیر لە هەرچییەک بکەیتەوە، من پێی دەزانم. هەرچیش بزانی، من بیری لێ دەکەمەوە!" دوایی لێمی پرسی ئاخۆ لەو ساتەدا بیر لە چی دەکەمەوە. منیش، جگە لە ئەو، هیچ شتێکی تر لە خەیاڵمدا نەبوو. گوتم بیر لە هیچ ناکەمەوە. بەڵام گوێی لێم نەدەگرت، چونکە بۆ تێگەیشتن نا، تەنیا بۆ ترساندنی من دەدوا و گەمەی لەتەک ترسەکەی خۆیدا دەکرد و مەبەستی بوو منیش بەشی خۆم لەو ترسە بەرکەوێت. سەرنجم دابوو تا زیاتر هەستی بەتەنیایی بکردایە، مەیلی شەڕانگێزیی زیاتر دەبوو. کاتێک دەستی بەسەر ڕووی هەردووکماندا دەگێڕا و دەیویست بە ئەفسوونی ئەو لەیەکچوونە سەیرەمان سەرسامم بکات و لە من زیاتر دەهاتە جۆش، من وای بۆ دەچووم دەخوازێ ڕەفتاری خراپ بنوێنێ. بەخۆم گوت لەبەرئەوەی لە دڵەوە ڕازی نییە یەکسەر دەست بە شەڕانگێزی بکات، منی لەبەردەم ئاوێنەکەدا ڕاگرتووە و پشتی ملم دەگوشێ، بەڵام هێندەش توڕەهات و بێچارە نەدەهاتە بەرچاوم. مافدار بوو، منیش دەمویست قسە و ڕەفتارەکانی ئەو بکەم. لەپای ئەوەی دەسپێشخەریی نواندبوو و توانیبووی گەمە بە پەتاکە و ترسی ناو ئاوێنەکە بکات، ئێرەییم پێ دەبرد.

بەڵام سەرباری ئەو هەموو ترسە و بیرکردنەوەم لە پەیبردن بەو شتانەی تایبەت بەخۆم بوون و پێشتر بیرم لێ نەکردبوونەوە، کردم و کۆشام نەمتوانی خۆم لەو هەستە ڕزگار بکەم کە هەموو ئەم شتانە گەمەن. پەنجەکانی شل کردبوو و چی دی پشتەملمی نەدەگوشی، بەڵام من لەبەردەم ئاوێنەکە نەدەکشامەوە. خۆجە دواتریێ گوتی: "من وەک تۆم لێ هاتووە. ئیدی دەزانم چۆن دەترسی. من بووم بە تۆ. " تێ گەیشتم چی دەڵێ، بەڵام هەوڵم دا ئەو فاڵگرتنەوەیە، کە ئەمرۆ گومانم لە ڕاستبوونی نیوەی نییە، بە توڕەهات و منداڵانە دابنێم. لافی ئەوەی لێ دا کەوا جیهان وەک من دەبینێ. دیسان دەیگوت "ئەوان" چۆن بیر دەکەنەوە و چۆن دەبیستن، من ئێستا هەمووی تێ دەگەم. نیگای لە ئاوێنەکە دوورخستەوە و سەیرێکی مێزەکە، کە تیشکی فانۆسەکە نیوەی ڕووناک کردبووە و سەیری پەرداخ و کورسی و شتەکانی تری کرد و کەمێک قسەی کرد. دواتر گوتی گوایە ئەو شتانەی پێشتر لەبەر نەبینینیان نەیدەتوانی گوزارەیان لێ بکات، ئێستا دەتوانێ دەریان ببڕێ. بەڵام من پێم وابوو خۆی لەخشتە دەبرد، چونکە وشەکانیش و شتومەکانیش هەمان ئەوانەی پێشوو بوون. تاکە شتێکی نوێ لەودا، ترسەکەی بوو. ئەوەش نا، بگرە شێوازی هەڵکردن لەگەڵ ترسەکەیدا. بەڵام من پێم وابوو ئەو شێوازی هەڵکردنە، کە من ئێستاش ناتوانم ڕوونی بکەمەوە، شتێکی نوێ یان گەمەیەکی نوێی ئەو بوو لەبەردەم ئاوێنەکەدا. پێ دەچوو بێ ویستی خۆی بووبێ، گەمەکەی لادەدایە لاوە و گرگر دەگەڕایەوە سەر دوومەڵەکە و دەیپرسی ئاخۆ جێگازی مەگەزە یان پەتایە؟

پاشان گوتی دەیەوێ من هەموو شتێک لەو شوێنەوە، کە تیایدا ڕاوەستابووم، دەست پێ بکەمەوە. هێشتا نیوە ڕووت بووین و لەبەردەم ئاوێنەکە نەکشابووینەوە. پێشنیازی وا بوو ئەو بێتە جێی من و منیش بچمە جێی ئەو. بۆ ئەمەش، ئەوەندەمان بەس بوو جلوبەرگی خۆمان بگۆڕینەوە و ئەو ریش بتاشێ و منیش ڕیش بەربدەمەوە. ئەم بیرۆکەیە، لەیەکچوونی ئێمەی لە ئاوێنەکەدا ترسناکتر نواند، دەمارەکانی مێشکم بەتەواوی ئاوسان، گوێم ڕاگرت: ئەگەر وا بوایە، دەبوو من ئەوم ئازاد بکردایە. زۆر بە شادمانییەوە باسی ئەو شتانەی دەکرد کە دوای ئەوەی لە جێی من دەچێتەوە وڵاتەکەم، لەوێ دەیانکات. هەرچییەکم لە بارەی منداڵی و

گەنجایەتیی خۆمەوە بۆ گێڕابووەوە، هەر هەمووی بە بچووکترین وردەکارییەوە لە هۆشی خۆیدا پاراستبوو. زۆریش سەرم سوڕما کاتێک بینیم بە پشتبەستن بەو وردەکارییانە و بەپێی بۆچوونی خۆی، لە خەیاڵی خۆیدا جیهانێکی سەیر و دەرەوەی ڕاستیی خولقاندووە. وەک ئەوە وابوو ژیانم لەژێر دەستی خۆم دەرچووبێ و لە دەستی ئەودا ئاراستەی شوێنی تر بکرێ، منیش، هیچی ترم لە دەست نەیەت جگە لەوەی وەک ئەوەی خەون ببینم و لە دوورەوە سەیری ئەو شتانە بکەم کە بەسەرم دێن. بەڵام گەڕانەوەی ئەو لەبری من بۆ وڵاتەکەم و ئەو ژیانەی لەوێ بەسەری دەبات، ڕەهەندێکی گاڵتەجاڕانەی هێندە سەیر و سادەی تێدا بوو، بەجۆرێک منی بەتەواوی لە باوەڕ پێهێنانی دوور دەخستەوە. لە لایەکی ترەوە سەرم لە لۆجیک و گونجانی وردەکارییەکانی ناو خەیاڵی ئەو سوڕمابوو: لە ناخەوە دەمویست بڵێم کەواتە بۆی هەیە شتی واش بقەومێ و منیش بتوانم وا بژیم. لەو ساتەدا تێ گەیشتم بۆ یەکەمجار پەیم بە شتێکی قووڵی تایبەت بە ژیانی خۆجە بردووە، بەڵام لە ڕەوشێکدا نەبووم بتوانم بڵێم ئەو شتە چییە. ئەوەندە نەبێ بە سەرسوڕمانەوە گوێم بۆ ڕەفتار و کردەوەکانی دنیای کۆنم ڕاگرتبوو، کە ساڵانێک بوو بە تاسەوە بیرم لێ دەکردەوە و ترسی پەتاکەم لە بیر چووبووەوە.

بەڵام ئەمە زۆری نەخایاند. ئەمجار خۆجە داوای لێم کرد پێی بڵێم ئەگەر بچمە بەرگی ئەوەوە، چی دەکەم. لەیەکچوونەکەمان و ڕاوەستانی سەیری من لەو بارەدا بەدەم هەوڵدانمەوە بۆ ئەوەی بڕوا بەخۆم بهێنم دوومەڵەکە جێگازی مەگەز نەبێ هیچی تر نییە، منی بەڕادەیەک پەست کردبوو، بەجۆرێک هیچ شتێکی ترم بە خەیاڵدا نەهات. کاتێک زۆری بۆم هێنا، بیرم کەوتەوە گوتم ماوەیەک لەمەوبەر ئەوەم لە خەیاڵدا بووە لە گەڕانەوەمدا بۆ وڵاتەکەم بیرەوەرییەکانم بنووسمەوە. هەر ئەوەندەی گوتیشم لەوانەیە ڕۆژێک لە ڕۆژان چیرۆکێک لە بەسەرهاتەکانم پێک بهێنم و بینووسمەوە، ئەو بە نەفرەت و بەچاوی سووکەوە بۆمی ڕوانی. ئەو ڕای وابوو هێندەی ئەو من دەناسێ، من هیچ کاتێک ناتوانم ئەوەندە ئەو بناسم! پاڵێکی پێمەوە نا و خۆی بەتەنیا چووە بەردەم ئاوێنەکە: ئێستا ئەو پێم دەڵێ چیم بەسەردێ ئەگەر بێتو ئەو بچێتە پێستی منەوە! دەسپێک گوتی: "دوومەڵەکە برینی پەتایە و دەمرێ."

پاشـان باسـی ئـەوەی کرد چـۆن بەر لە مـردنم بەدەست ئازارەوە دەناڵێنم. "لە مـردن خراپتر، ترستە لە مردن، چونکە تا ئێستا خۆت بۆ ئامادە نەکردووە." کاتێک خۆجە باسی چۆنیەتیی نقوومبوونی منی لە ئازارەکانی نەخۆشیدا دەکرد، لە ئاوێنەکە دوور کەوتبووەوە. پاش کەمێک بینیم لەسەر پێخەوە پەرت و بڵاوەکەی سەرزەوی ڕاکشاوە و باسی ئێش و ئازارە چاوەڕوانکراوەکانی من دەکات. دەستێکی نابووە سەر سکی، وەک بڵێی خستێبێتیە سەر شوێنی ئەو ئازارانەی باسی دەکرد. ڕێک لەو کاتە بانگی منی کرد، بەترسەوە چوومە تەنیشتی، بەڵام دەستبەجێ پەشیمان بوومەوە، چونکە دیسـان هەوڵی دا دەستم پێدا بـهێنێ. هەرچۆنێک بێ ئیدی بڕوام بـەخـۆم هێنا ئەوە تەنیا جێگازی مەگەزێک بێ، بەڵام سەرباری ئەوەش هەر دەترسام.

تەواوی شـەو بـەوجـۆرە بەسـەرچوو. بەمـەبـەسـتی ئەوەی نەخـۆشـی و ترسـەکـەی تووشی من بکات، پەیتا پەیتا دووبـارەی دەکردەوە کە من ئەوم و ئەویش منە. لە دڵی خـۆمـدا گـوتم ڕەنگە لەبەر چێـژ وەرگـرتنـی بێ لەوەی لە پێـسـتی خـۆی دەرچووە و سـەیری خـۆی دەکات. وەک کەسـێک بیـەوێ لـە خـەو بێدار بێتـەوە، بەخـۆم دەگوت: "گـەمـە دەکـات، چونکە خـۆیشی ئەو وشـەی "گـەمـە"یەی دەگوتەوە." بـەڵام لە لایەکی دیشەوە چین چین ئارەقەی دەردەدا، وەک کەسێک نا کە لە ژوورێکی گەرمدا بەدەست وشە خنکێنەرەکانەوە تەنگاو بووبێ، بگرە وەک نەخۆشێکی کەمئەندام.

لەگەڵ تاریک و ڕوونی بەیان، ئەو لەبارەی ئەستێرەکان و مردن، فاڵگرتنەوەی درۆ و بێ بنـەمـا، گـەمـژەییی سـوڵتـان، بەواتـایەکی تر بـێ وەفـاییی سـوڵتـان، گـەمـژە خـۆشـەویسـتـەکـانی خـۆی، "ئێـمـە" و "ئەوان" و لەبارەی ویسـتـی خـۆی بـۆ بوون بە کەسێکی تر دەدوا! چی دی گوێم لێ نەگرت و چوومە ناو باخچەکە. نازانم لەبەر چی بوو چەند بیرۆکەیەکی تایبەت بە نەمری کە لە کتێبێکی کۆندا خوێندبوومەوە، هاتەوە بیرم. جگە لە پۆلێک چۆلەکە کە بەسەر دار مازووەکانەوە دەیانجریواند و لـەم چڵەوە بـۆ ئەو چڵ دەفـڕین، لـە دەرەوە هـەست بەهـیـچ چرپە و جــووڵـەیەکی تر نـەدەکــرا. بێدەنگییـەکی سـەرسـوڕهێن! بیـرم لـە ژوورەکانی تری ئەسـتـەنبـوڵ و تووشـبـووانی پەتاکە کردەوە. لە دڵی خـۆمدا گوتم ئەگەر ئەوەی خۆجـە پەتا بێ، ئەوا تا مردن درێژە دەخـایەنێ. ئەگەر نا، هەر هیچ نـەبێ تا ونبـوونی ئەو دوومـەڵە سـوورە. ئیدی هـەسـتم

دەکـرد ناتـوانم لەوە زیاتـر لەم مــاڵە بمێنمــەوە. کـاتێک چوومــەوە ژوورەوە، بەهـیچ شـێوەیەک بـە خـەیاڵمدا نەهات بۆ کـوێ هـەڵبێم و خـۆم لە کوێ بشــارمـەوە. ئەوەندە نەبێ کـە پێم وابوو پێویسـتـە شـوێنێکی دوور لە خـۆجـە و لە پەتاکە بێ. چەند پارچە جلوبەرگـێکی خـۆمم خـزاندە توورەکەیەوە. تـەنیـا ئـەوەندەم دەزانـی ئەو شـوێنە دەبێ ئەوەندە نزیک بێ کە بێ ئەوەی دەسـتگیـر بکرێم، بتـوانم بۆی هـەڵبێم. هـەر ئەوەندە و بەس.

# 7

کەمۆکەیەک پوولّم پێکەوە نابوو کە لە کاتی خۆیدا کەموکورت لە خۆجەم دزیبووەوە. لێرە و لەوێش بڕێکی ترم پەیدا کردبوو. پێش ئەوەی لە ماڵ دەربچم، پوولەکانم لە شوێنی شاردنەوەیان، لە گۆرەوییەکی ناو سندووقی ئەو کتێبانەی چی دی نەدەخوێندرانەوە، دەرهێنا. دواتر، لە ڕووی فزوولەوە چووم بۆ ژوورەکەی خۆجە، فانۆسەکە داگیرسابوو، خۆیشی لە ئارەقەدا نقوم بووبوو و نووستبوو. سەرم لە بچووکیی ئەو ئاوێنەیە سوڕما کە بەدرێژاییی شەو منی بەو لێکچوونە ئەفسووناوییەی هیچ کاتێک نەمتوانی بەتەواوی باوەڕی پێ بهێنم، ترساند. بێ ئەوەی دەست بەهیچ شتێکەوە بدەم، بەپەلەپروزێ لە ماڵ دەرچووم. لە کاتی ڕۆیشتنم بە کۆڵانەکاندا، بایەکی سووک هەڵی کرد. لە ناخەوە دەمویست دەستەکانم بشۆم. دەمزانی ڕوو لە کوێ دەکەم و لە خۆم ڕازی بووم. ڕۆیشتن بە کۆڵانەکاندا لە بێدەنگیی بەیانیاندا، دابەزین لە هەورازەکانەوە بەرەو دەریا، شۆرینی دەستەکانم لە کانیاوەکان و سەیرکردنی کەنداوی زێڕین، شادمانیی خستە دەروونمەوە.

یەکەمجار باسی دوورگەی هەیبەلیم لە قەشەکەیەکی گەنج، کە لەوێوە بۆ ئەستەنبوڵ دابەزیبوو، بیستبوو. کاتی خۆی کە لە گالاتا یەکمان بینی، بە جۆشەوە باسی جوانی و دڵگیریی دوورگەکانی بۆم گێڕابووەوە. بێگومان پێشتر لە خەیاڵم چەسپیبوو، بۆیە هەر کە لە گەڕەک دوور کەوتمەوە، دەمزانی ڕوو لەوێندەرێ دەکەم. لەگەڵ خاوەن بەلەم و ماسیگرەکاندا قسەم کرد، بەڵام داوای پارەیەکی خەیاڵییان دەکرد بۆ گەیاندنم بە دوورگەکە. هەستم بە بێزاری کرد، لە دڵی خۆمدا گوتم ئەگەر

بزانن قاچاخم، ئەوا شوێنەکەم بۆ ئەو پیاوانە دەستنیشان دەکەن کە خۆجە بەدوامدا دەیاننێرێ! دواتر هاتمە سەر ئەو باوەڕەی ئەمە چاو سوورکردنەوەیەک بێ لەدژی فەلەکان کە لە ترسی پەتاکە بەچاوی سووکەوە سەیر دەکران. بۆ ئەوەی سەرنجی زۆر بۆ سەر خۆم ڕانەکێشم، خاوەن بەلەمی دووەمم دواند و لەگەڵی ڕێک کەوتم. پیاوێکی هێندە بەهێز و بەگوڕ نەبوو. لەبری ئەوەی هەموو هێزی خۆی بخاتە سەر سەوڵ لێدان، چەنەی دەدا و باسی ئەوەی دەکرد پەتاکە سزای کام گوناهانەیە. ئەوەشی بۆ قسەکانی زیاد کرد کە هەڵهاتن لە پەتاکە و خۆشاردنەوە لە دوورگە پووڵێک ناکات. لە میانەی قسەکانی بۆم دەرکەوت ئەویش بەقەد من ترسی لێ نیشتووە. ڕێگا شەش سەعات درێژەی خایاند.

ڕۆژگارێکی دواتر هاتمە سەر ئەو باوەڕەی کە ڕۆژانێکی شادم لە دوورگەکەدا بەسەر بردووە. بە پارەیەکی کەم لە ماڵی ڕۆمێکی ماسیگری بێ کەسوکار دەمامەوە و هەوڵم دەدا لەو ناوە نەبیندرێم. ئۆقرەم لەبەر بڕابوو. جاروبار وام دەهێنایە بەرچاوی خۆم خۆجە مردووە. ناوبەناویش بیرم لەو پیاوانە دەکردەوە کە دەبوو بەدوای مندا بیاننێرێ. فەلەیەکی زۆر لە دوورگەکە هەبوون کە وەک من لە دەست پەتاکە ڕایان کردبوو، بەڵام نەمدەویست خۆمیان نیشان بدەم.

بەیانیان لەتەک ماسیگرەکەدا دەچوومە دەریا و لای ئێواران دەگەڕامەوە. ماوەیەک خووم دابووە ڕاوکردنی قرژانگ و پاقوریا بە ڕم. ئەگەر هەواش خراپ بوایە و دەستی نەدایە بۆ دەرچوون بۆ دەریا، بەدەوری دوورگەکەدا دەخولامەوە. جاروبار دەچوومە باخی خەڵوەتخانەی دوورگەکە و لەژێر دارمێوەکاندا سەرخەوێکی شیرینم بۆ دەشکاند. ڕەزێکیش لەوێدا هەبوو و سەبەتەیەک بە دار هەنجیری ناو ڕەزەکەوە هەڵواسرابوو. ئەو ڕۆژانەی هەوا ساف بوایە، دەچوومە ئەوێ و لەوێوە تا ئەیاسۆفیام لێوە دیار بوو. لەژێر سەبەتەکەدا دادەنیشتم و بەدەم سەیرکردنی ئەستەنبوڵەوە چەندین سەعات داڵغەم لێ دەدا. جارێکیان لە خەونمدا خۆجە بەخۆی و چەند دۆلفینێکەوە بە بەلەم هاتبوو بۆ دوورگەکە. دۆستانە لەگەڵ دۆلفینەکاندا هەڵسوکەوتی دەکرد و هەواڵی منی پرسی. کەواتە کەوتبووە گەڕان بەدوامدا. جارێکیشیان لەگەڵ دایکمدا بوو، سەرکۆنەیان دەکردم و لە هۆی دواکەوتنی منیان

دەپرسی. دوای ئەوەی تیشکی ڕۆژ لە ڕوومی دەدا و بەدەم ئارەقەدەردانەوە هۆشیار دەبوومەوە، دەمویست بگەڕێمەوە بۆ ناو خەونەکانم، بەڵام لەبەرئەوەی ئەمەم بۆ نەدەلوا، خۆم ناچاری بیرکردنەوە دەکرد. هەندێک جار پێشبینیم دەکرد خۆجە مردووە. بیرم لە تەرمەکەی دەکردەوە لەو ماڵە چۆڵە کە من جێم هێشتبوو. بیرم لەوانەی بۆ هەڵگرتنی تەرمەکەی دەهاتن و لە بێدەنگیی بە خاکسپاردنی بێکەسانەی دەکردەوە. پاشان فاڵگرتنەوەکانیم بیر دەکەوتەوە. ئەو شتە گەمەئامێزانەیم دەهاتەوە یاد کە بە نەفرەت و ڕقەوە لەبەرخۆیەوە دەیگوت. سوڵتان و ئاژەڵەکانیم بیر دەکەوتەوە. کاتێک نووکی ڕمم بەپشتی قرژاڵ و پاڤوریاکاندا دەکرد و لە سکیانەوە دەرم دەهێنا، ئەوان بە جوڵاندنی لەسەرخۆی پەل و پۆی خۆیان هاوڕایەتیی خەیاڵەکانی ڕۆژمیان دەکرد.

خەریک بووم هێدی هێدی باوەڕ بەخۆم بهێنم کە دەتوانم بۆ وڵاتی خۆم هەڵبێم. بۆ ئەمەش، هێندەم بەس بوو کەمێک پارە لەو ماڵانەی دووڕگەکە بدزم کە لە هەموو لایەکەوە دەرگاکانیان لەسەر پشت بوون. بەڵام پێویست بوو بەر لە هەموو شتێک خۆجە لە بیر خۆم ببەمەوە، چونکە کەوتبوومە ژێر کاریگەریی ئەفسوونی بەسەرهاتەکانم و هێزی ڕاکێشانی بیرەوەرییەکانم. بەخۆمم دەگوت کەسێکم بەتەنیا بۆ مردن جێ هێشتووە کە زۆر لە خۆم دەچێ و خەریک بوو خۆم تاوانبار دەکرد. ئەو کاتەش، وەک ئێستا، لە دڵەوە تاسەی بینینیم دەکرد. ئایا بەڕاستی هێندەی ئەوەی لە بیرەوەریمدا هەیە لە من دەچوو، یان خۆم لەخشتە دەبرد؟ پاشان هاتمە سەر ئەو باوەڕەی لە ماوەی یازدە ساڵی ڕابردوودا تەنانەت جارێکیش تێروپڕ سەیری ڕوویم نەکردبوو، بەمەرجێک، زۆر جاران ئەوەشم کردبوو. تەنانەت بە خەیاڵمدا هات خۆم بگەیەنمەوە ئەستەنبوڵ و بۆ دواجار چاوێک بە تەرمەکەیدا بگێڕم. بۆ ئەوەی ئازاد بم، بڕیارم دا باوەڕ بەخۆم بهێنم کەوا وێکچوونمان یادگارییەکی چەوت و هەڵەیەکی بێ تامە و پێویستە لە بیر بکرێ.

باشتر کە خۆم لەسەر ئەو بیرکردنەوەیە ڕانەهێنا، چونکە ڕۆژێک خۆجەم لەبەردەم خۆمدا بینییەوە! لە باخچەی پشتەوەی ماڵی کابرای ماسیگر ڕاکشابووم، ڕووی چاوە داخراوەکانم لە ڕۆژ کردبوو و داڵغەم لێ دابوو. هەستم بە سێبەرەکەی کرد،

لەبەردەممدا بوو، پێ دەکەنی، بەڵام نەک وەک کەسێک کە گەمەکەی بردبێتەوە، بگرە وەک ئەوەی بڵێی لە خۆشەویستییەوە بێ بۆ من! متمانە بەخۆبوونێکی بەهێز، بەڕادەیەک خۆشمی دەترساند، سەرتاپای جەستەمی داگرتبوو. پێ دەچوو بەنهێنی چاوەڕێی هاتنی ئەو ساتەم کردبێ، چونکە دەستبەجێ هەستی کۆیلەی تەمبەڵ و غوڵامی تاوانبار باڵی بەسەرمدا کێشا. بەدەم پێچانەوەی بوخچەکەم، لەبری ئەوەی نەفرەت لە خۆجە بکەم، کەچی خۆم بە سووک دەهاتە بەرچاو. هەر ئەویش لەجێی من قەرزەکانی کابرای ماسیگری دایەوە. دوو کەسی دابووە تەک خۆی و بە بەلەمی جووتسەوڵ هاتبوون، بەخێرایی گەڕاینەوە. بەرلەوەی تاریکی دابێ، گەیشتینەوە ماڵ. تاسەی بۆنی ماڵەکەم کردبوو. ئاوێنەکەش لە دیوارەکە هێندرابووە خوارێ.

بەیانیی ڕۆژی دواتر، خۆجە منی لەبەردەم خۆیدا دانا و گوتی: "تاوانەکەت زۆر قورسە، نەک تەنیا لەبەرئەوەی هەڵهاتووی، بگرە بەهۆی ئەوەی جێگازی مەگەزت لێ بووە بە برینی پەتا و منت بەتەنیا لە پێخەوی مردندا بەجێ هێشتووە. بەڵام ئێستا کاتی ئەوە نییە." گێڕایەوە: سوڵتان هەفتەیەک لەمەوبەر دواجار ناردوویەتی بەدوایدا و لێی پرسیوە ئەم پەتایە کەی دەبڕێتەوە، ئایا چەند کەسی تر ڕاپێچی مەرگ دەکات و ژیانی خۆی لە مەترسیدایە یاخۆ نا؟ خۆجە زۆر دەپەشۆکێ و لەبەرئەوەی پێشوەخت خۆی ئامادە نەکردووە، وەڵامی ناڕوونی داوەتەوە، داوای مۆڵەتی کردووە بۆ ئەوەی لە ئەستێرەکان بپرسێ. بە دڵی خۆشەوە گەڕاوەتەوە بۆ ماڵ. نەیتوانیوە بگاتە ئەنجامێک بۆ ئاراستەکردنی خەمەکانی سوڵتان. بۆیە بڕیاری دابوو من بگێڕێتەوە.

هەر زوو بە گیرسانەوەی منی لە دوورگەکە زانیبوو. پاش هەڵهاتنی من تووشی لەرزوتا بووە. دوای سێ ڕۆژ کەوتبووە منەکردنم، لەڕێی ماسیگرەکانەوە شوێن پێمی هەڵگرتبوو. لەگەڵ شلکردنەوەی دەمی کیسەی پارەکانیدا، ماسیگرەکە پێی گوتبوو منی بۆ دوورگەی هەیبەلی بردووە. خۆجە لەبەرئەوەی زانیبووی جگە لە دوورگەکان ناتوانم بۆ هیچ شوێنێکی تر ڕابکەم، لە سەرەتاوە نەکەوتبووە دوام. کاتێک گوتی ئەو پێوەندییەی لەگەڵ سوڵتاندا دایناوە، گرینگترین هەلی ژیانیەتی، من بۆچوونەکەیم بۆی سەلماند. ڕاشکاوانەش گوتی پێویستی بە زانیارییەکانی من هەیە.

بێ دواکەوتن دەستمان کرد بەکار. خۆجەش سووربوونی جۆرە کەسانێکی پێوە دیار بوو کە دەیانزانی چییان دەوێت. ئەم سووربوونەم پێشتر هێندە لەودا بەدی نەکردبوو، مایەی خۆشحاڵیم بوو. کاتێک زانیمان ڕۆژی داهاتوو جارێکی تر بانگ دەکرێتەوە، بڕیارمان دا کات بەفیڕۆ نەدەین. دەستبەجێ لەسەر بنەمایەک ڕێک کەوتین: زیاد لە پێویست زانیاری نادەین، بەڵام ئەوەی دەیدەین، پێویستە یەکسەر بیسەلمێنین. ئەو سووربوونەی کە من پێم خۆش بوو، دەستبەجێ خۆجەی هێنابووە سەر ئەو باوەڕەی "فاڵ گرتنەوە جۆرێکە لە لێبووکی، بەڵام دەکرێ بە جوانی بەکار بهێندرێ بۆ دانانی کاریگەری بەسەر گەمژەکانەوە." بە خۆجەم گوت ئەم پەتایە کارەساتێکە تەنیا دەکرێ بەگرتنەبەری ڕێوشوێنی تەندروستی پێشی لێ بگیرێ. دیاربوو ئەویش بەدەم گوێگرتنەوە لە قسەکانم ڕاستیی بۆچوونەکەی منی دەسەلماند. ئەویش وەک من، نکووڵیی نەدەکرد لە پێوەندیی خوا بە پەتاکەوە، بەڵام ئەم پێوەندییە ناڕاستەوخۆ بوو، بۆیە ئێمە دەمانتوانی قۆڵی لێ هەڵماڵین و شتێک لە دژی کارەساتەکە بکەین و ئەمەش هیچی لە شکۆی خوا کەم نەدەکردەوە. ئەی مەگەر حەزرەتی عومەر لە پێناوی پاراستنی سوپاکەیدا ئەبو عوبەیدەی لە سوریاوە بۆ مەدینە بانگ نەکردبووەوە؟ خۆجە داوای لە سوڵتان کرد بەمەبەستی خۆپاراستن لە پەتاکە، پێوەندیی خۆی لەگەڵ ئەوانی تردا بۆ نزمترین ئاست دابەزێنێ. ئەوەشمان بە خەیاڵدا هات ترسی مردن بخەینە دڵی سوڵتانەوە تاکو ناچاری بکەین بڕیار لەسەر وەرگرتنی ڕێوشوێنەکان بدات. بەڵام ئەمە جێی مەترسی بوو، چونکە سوڵتان ئەوەندە بەتەنیا نەدەمایەوە بتواندرێ بە پیاهەڵدانێکی شاعیرانەی مردن بترسێندرێ. خۆ ئەگەر تەنانەت بکەوتایەتە ژێر کاریگەریی ڕەوانبێژییەکەی خۆجەشەوە، ئەوا ئاپۆڕەیەکی لەبلەبان و بوودەڵەی بەدەورەوە بوو کە دەیانتوانی ترسەکەی گەورەتر بکەنەوە و بەسەریدا زاڵ بن. دواتر، ئەو گەمژە بێ چاووڕووانە هەموو کاتێک دەیانتوانی تۆمەتی بێ ئاینی بدەنە پاڵ خۆجە. بۆ زاڵبوون بەسەر ئەو کۆسپەدا، بە پشتبەستن بە زانیارییە ئەدەبییەکانی من، چیرۆکێکمان هۆندەوە.

ئەو شتەی خۆجەی چاوترسێن کردبوو، یەکلاییکردنەوەی زانینی کاتی بەسەرچوونی پەتاکە بوو. من هەستم دەکرد پێویستە کار لەسەر ژمارەی ڕۆژانەی

مردووان بکەین. کاتێک ئەمەم بە خۆجە گوت، زۆر کاری تێ نەکرد، بڕیاری دا بۆ بەدەستهێنانی ژمارەی مردووان داوای کۆمەک لە سوڵتان بکات، بەڵام پێویست بوو ڕووی ئەم داوایە بە دەمامکی چیرۆکێکی تر داپۆشرێ. هێندە بڕوام بە بیرکاری نەبوو، بەڵام چ بکەین، دەست و قۆڵمان بەسترابوو.

سەرلەبەیانیی ڕۆژی دوایی ئەو چوو بۆ کۆشک و منیش بۆ ناو شار و بۆ ناو جەرگەی پەتاکە. دیسان وەک پێشوو لە پەتاکە دەترسام، بەڵام تەوژمی جووڵە و ژیان و ویستی بەدەستخستنی جیهان، ئەگەر بۆ ماوەیەکیش بێ، دابووی لە کەللەم. ڕۆژێکی بادار و فێنکی هاوین بوو. بەدەم گەڕانەوە بەناو مردوواندا دەسووڕامەوە. بیرم کەوتەوە ماوەی ساڵانێکە هێندەی ئێستا تامەزرۆی ژیان نەبووم. خۆم دەکرد بە حەوشی مزگەوتەکاندا، ژمارەی دارەبازەکانم لەسەر کاغەزێک تۆمار دەکرد. پاشان، بە کۆڵاناندا دەگەڕام و دەکۆشام ڕایەڵەی پێوەندی لە نێوان بینراوەکانم و ژمارەی مردوواندا دابنێم: هێندە ئاسان نەبوو بتوانرێ واتایەک بە هەموو ماڵ و مرۆڤ و ئاپۆڕەی خەڵک و دڵخۆشی و غەم و شادییەکان بدرێ. سەرباری ئەوەش، نیگام بە ئاشکرا دەکەوتە سەر وردەکارییەکان، ژیانی خەڵکانی تر، بەختەوەری و بێچارەیی و بێخەمیی ئەو مرۆڤانەی وەک خزم و کەسوکار لە ماڵەکانی خۆیاندا دەژیان.

لە ناو ئاپۆڕەی مردووان و زیندوواندا سڕ بووبووم. لای نیوەڕۆ ڕووم لە گالاتا کرد لەوبەری ئاو. بە قاوەخانەی کرێکارانی دەوروبەری کارخانەی دروستکردنی کەشتیدا سووڕامەوە. بەدزییەوە سەبیلێکم کێشا. هەر تەنیا بەمەبەستی تێگەیشتن، لە خواردنگەیەک شۆربایەکم خوارد. چوومە بازاڕ و دوکانەکان. دەمویست هەموو شت لە مێشکمدا تۆمار بکەم، تا بتوانم بە ئەنجامێک بگەم. لەگەڵ ئاوابوونی ڕۆژدا، شەکەت و ماندوو گەڕامەوە بۆ ماڵ. گوێم ڕاگرت بۆ خۆجە کە لە کۆشکەوە گەڕابووەوە.

کارەکان، وەک نەخشەمان بۆ کێشابوون، چووبوونە پێش. ئەو چیرۆکەی خۆمان هۆندبوومانەوە، کاری لە ناخی سوڵتان کردبوو. باوەڕی هێنابوو پەتاکە وەک ئیبلیس شێوەی مرۆڤ وەردەگرێ و لەخشتەی دەبات. دەستووری دابوو مۆڵەت بەهیچ نامۆیەک نەدرێ سەر بە کۆشکدا بکات و دەروازەکان خرابوونە ژێر چاودێریی

توندەوە. کاتێک پرسیاری کات و چۆنیەتیی بەسەرچوونی پەتاکەی کردبوو، خۆجە زمانێکی ئەوتۆی بەکارهێنابوو، بەجۆرێک سوڵتان بەترسەوە گوتبووی توانیویەتی ئیزرائیل بهێنێتە بەرچاوی خۆی کە بەسەرخۆشی بەشاردا دەسووڕێتەوە، هەرکەسێ دەبینێ، قۆڵی دەگرێت و بەرەو لای خۆی بەکێشی دەکات. خۆجە دەستبەجێ و بە پەشۆکانەوە هەڵەکەی ڕاست کردبووەوە: "ئەوە ئیزرائیل نییە، بگرە ئیبلیسە کە مرۆڤ دەخاتە سەر ڕێی مردن. سەرخۆشیش نییە، زۆر فێڵبازە." وەک پێشتر نەخشەمان بۆ کێشابوو، خۆجە پێویستبوونی شەڕی لە دژی ئیبلیس ڕوون کردبووەوە. بە سوڵتانی گوتبوو بۆ ئەوەی تێ بگەین پەتاکە کەی لە کۆڵی شار دەبێتەوە، پێویستە بزانین بەکوێدا دەسووڕێتەوە. هەرچەندە هەندێ لە دەست و پێوەندەکانی سوڵتان بەرەنگاربوونەوەی پەتاکەیان بەواتەی دەستخستنە کاری خوا دانابوو، بەڵام ئەو گوێی پێیان نەدابوو. پاشان لە بارەی ئاژەڵەکانیەوە پرسیاری کردبوو. پرسیبووی داخۆ ئیبلیس دەتوانێ باز، هەڵۆ، شێر و مەیموونەکانی تووشی پەتاکە بکات؟ خۆجەش دەمودەست گوتبووی: "ئیبلیس لە بەرگی مرۆڤدا بۆ مرۆڤ و لە بەرگی مشکیشدا بۆ ئاژەڵان دێ." سوڵتان دەستووری دابوو لە شارێکی دوورەوە کە پەتاکە پێی نەگەیشتبێ، پێنج سەد پشیلە بهێنن و خۆجەش چەند پیاوی دەوێ، بیدرێتێ.

ئەو دوازدە پیاوەی خرابوونە ژێر فەرمانی ئێمەوە، دەستبەجێ بەهەر چوار لای ئەستەنبوڵدا دابەشمان کردن. کۆڵان بە کۆڵان و گەڕەک بە گەڕەک دەسووڕانەوە و ئەوەی دەیانبینی لەگەڵ ژمارەی مردوواندا بە ئێمەیان ڕادەگەیاند. نەخشەیەکی گەورەی ئەستەنبوڵمان، کە من بە ڕاستکردنەوەوە لە کتێبی تر وەرم گرتبوو، لەسەر مێزەکە ڕاخستبوو. شەوانە، بەترس و شادمانییەوە شوێنی بڵاوبوونەوەی پەتاکەمان لەسەر نەخشەکە دیاری دەکرد و ئەو قسانەمان دادەڕشت کە دەبوو بۆ سوڵتانی بکەین.

دەسپێک زۆر گەشبین نەبووین. پەتاکە وەک ئیبلیسێکی تەڵەکەباز نا، بگرە جۆری سەرسەرییەکی بێ ئامانج بەشاردا دەسووڕایەوە. ڕۆژێک لە ئاکسەرای گیانی چل کەسی دەکێشا، پاشان ئەوێی بەجێ دەهێشت و ڕۆژێکی تر دەگەیشتە فاتیح. بۆمان

ڕوون دەبووەوە کە لە کەناری ئەوبەری ئاو بە تۆپخانە و جیهانگیردا دەسووڕێتەوە. ڕۆژی دواتر سەیرمان دەکرد زۆر بەکەمی لەو ناوەی داوە و ڕووی لە زەیرەک کردووە، گەیشتووەتە گەڕەکی ئێمە کە بەسەر کەنداوی زێڕیندا دەڕوانێ و ژیانی لە بیست کەس سەندووەتەوە. نەماندەتوانی هیچ ئەنجامێک لە ژمارەی مردووانەوە بەدەست بخەین. ڕۆژێک پێنج سەد کەس دەمردن، ڕۆژی دواتر سەد. کاتێکی زۆر تێپەڕی تا تێگەیشتین کەوا پێویستە بزانین پەتاکە سەرەتا کوێ دەگرێتەوە و ڕوو لە کام لا دەکات، نەک لە کوێ قوربانییەکانی دەکوژێ. سوڵتان دیسان دەیناردەوە بەدوای خۆجەدا. دوای بیرکردنەوە و ڕامان، گوتمان دەبێ بە سوڵتان بگوترێ پەتاکە لە فرۆشگە قەرەباڵغەکان و لەو بازاڕانەی خەڵکی قۆڵی یەکتری تێدا دەبڕن و لەو چایخانانەی کە خەڵکی تیایاندا لە پەنای یەکترەوە دادەنیشن، تەشەنە دەکات. خۆجە ڕۆیشت و ئێوارە گەڕایەوە.

شتەکانی بۆ سوڵتان گێڕابووەوە. ئەویش گوتبووی "چ بکەین؟" خۆجە گوتبووی با بەخورتی هاتوچۆی بازاڕەکان و ناو شار سنوودار بکرێ. بێگومان لەوچە و زماندرێژەکانی دەوروبەری سوڵتان هەموویان لەدژی دەرکەوتبوون: "شار چۆن بەخێو دەکرێ؟ ئەگەر بازرگانی ڕابگیرێ، ژیان ڕادەوەستێ، ئەگەر بەرگوێی خەڵک بکەوێ پەتاکە لە شێوەی مرۆڤدا دەسووڕێتەوە، زراویان دەتۆقێ و وا دەزانن قیامەت ڕابووە و لغاو توند دەکەنەوە؛ پاشانیش، هیچ کەسێک ناخوازێت بخزێنرێتە گەڕەکێکەوە کە ئیبلیسی پەتای تێدا بگەڕێ. یاخیبوون دەقەومێ." خۆجە گوتی: "مافی خۆیانە." لەو کاتەدا گەمژەیەک پرسیبووی جا لەکوێ پیاوی پێویست بۆ چاودێریکردنی ئەو هەموو خەڵکە پەیدا دەبێ؟ سوڵتان بەم قسەیە پەست بووبوو و هەمووانی بەوە ترساندبوو ئەگەر هەرکەسێک گومان لە هێزی سوڵتان بکات، سزا دەدرێ. بەو توڕەبوونەشەوە دەستووری دابوو پێشنیازەکانی خۆجە جێبەجێ بکرێ، بەڵام ڕاوێژکردنی بە دەوروبەرەکەشی لە بیر نەکردبوو. گەورەی ئەستێرەناسان سدقی ئەفەندی لەبەرئەوەی ددانی لە خۆجە جیڕ دەکردەوە، دابووی بەبەر گوێی سوڵتاندا کە خۆجە هێشتا ڕای نەگەیاندووە پەتاکە کەی ئەستەنبوڵ بەجێ دەهێڵێ. خۆجە لە ترسی ئەوەی نەبادا سوڵتان هەق بدات بە سدقی ئەفەندی، گوتبووی لە

هاتنی داهاتوویدا خشتەی کات لەگەڵ خۆی دەهێنێ.

نەخشەی سەر مێزەکەمان پڕ کردبوو لە نیشانە و ژمارە، بەڵام چەندی دەمانکرد و دەکۆشاین نەدەگەیشتینە ئەو ئەنجامەی داخۆ پەتاکە بە چ لۆجیکێک بەشاردا دەسووڕێتەوە. لە هەمان کاتدا سوڵتان قەدەغەی سەپاند و لە سێ ڕۆژ زیاتریش درێژەی کێشا. یەنیچەرەکان دەروازەی بازاڕ و شەقامە سەرەکییەکانی شار و لەنگەرگاکانی بەلەمیان خستە ژێر چاودێری و دەستیان بە لێپرسینەوە کرد و دەیانپرسی: "کێی! بۆ کوێ دەچی؟ بۆچی دەڕۆی؟" ڕێبواره ترساو و سەرسوڕماوەکان و ئەوانەی بێ ئامانج دەسووڕانەوە، دەنێردرانە ماڵەوە بۆ ئەوەی پەتاکە فریویان نەدات. ئەو کاتەی زانیمان ڕەوتی ژیان لە قەپاڵی چارشی و ئونکاپانی سست بووەتەوە، ئێمە ئەو ژمارەی مردووانەی لە مانگێکدا کۆمان کردبووەوە، لە سەر کاغەز نووسیمان و بە دیوارەوە هەڵمانواسی و بیرمان دەکردەوە. بەبۆچوونی خۆجە، چاوەڕێکردنمان بۆ ئەوەی بزانین پەتاکە بە چ لۆجیکێک دەسووڕێتەوە، کات بەفیڕۆدان بوو. ئەو پێی وابوو پێویستە بۆ پاراستنی کەللەی سەرمان چەند شتێک بهۆنینەوە و دڵی سوڵتانی پێ خۆش بکەین.

شێوازی مۆڵەتی نووسراویش لەو سەروبەندەدا هاتە ئاراوە. سەرگەورەی یەنیچەرەکان بەمەبەستی ڕانەگرتنی بازرگانی و دابینکردنی خۆراکی پێویست بۆ شار، بەپێویستی زانیبوو مۆڵەتی نووسراو دابەش بکرێ. لەو کاتەدا کە بیستمان کابرا لەو ڕێیەوە دراوێکی زۆری دەست کەوتووە و وردە بازرگانەکانیش بۆ خۆدزینەوە لە بەخشینی باج و سەرانە خەریکی خۆسازدانن بۆ یاخیبوون، من بۆ یەکەمجار هەستم بەهەبوونی جۆرێک لە لۆجیک لە ژمارەی مردوواندا کرد. لە کاتێکدا خۆجە باسی دەست تێکەڵکردنی باشوەزیر کوپرولوی لەگەڵ بازرگاناندا دەگێڕایەوە، من بۆچوونی خۆمم پێ گوت و هەوڵم دا بیهێنمە سەر ئەو باوەڕەی پەتاکە هێدی هێدی خۆی لە گەڕەکەکانی قەراغ شار و کۆڵانە هەژارنشینەکان دەکێشێتەوە.

قسەکانم زۆر نەچوونە ئەقڵییەوە، بەڵام کاری ئامادەکردنی خشتەی کاتی بە من سپارد. خۆجە گوتی چیرۆکێکی نووسیوە کە جگە لە دڵخۆشکردنی سوڵتان، دوای

خوێندنەوەی، کەس ناتوانێ هیچ ئەنجامێکی لێوە دەربهێنێ. لە کاتێکی تردا پرسی: "ئایا مرۆڤ دەتوانێ بەسەرهاتێک بهۆنێتەوە کە جگە لە چێژی خوێندنەوە یان گوێگرتن، هیچ ئەنجام و واتەیەکی تری نەبێ؟" منیش لە وەڵامدا گوتم: "شتێکی وەک مۆسیقا؟" خۆجە سەری سوڕما. پاشان بیرمان کردەوە باشترین چیرۆک ئەوەیە سەرەتاکەی وەک ئەفسانە سادە و منداڵانە بێ، ناوەڕاستەکەی وەک خەونی ترسناک ترسێنەر بێ و کۆتاییەکەشی وەک چیرۆکی ئەڤین و دڵداری تاڵ و پڕ لە ئازار بێ. شەوی بەر لە چوونی خۆجە بۆ کۆشکی سوڵتان، شادمانانە چەنەمان لێ دەدا و بەوپەڕی تواناوە کارمان دەکرد. لە ژوورەکەی ئەولاوە خۆشنووسی چەپەوانەی دۆستمان دانیشتبوو و خەریکی نووسینەوەی بەشەکانی سەرەتای ئەو چیرۆکە بوو کە هێشتا خۆجە بە ئەنجامی نەگەیاندبوو. من لە دەمەوبەیانیدا و لە میانەی ژمارە سنووردارەکانی بەردەستم و ئەو هاوکێشانەوە کە چەند ڕۆژێک بوو سەرقاڵی دانانیان بووم، گەیشتمە ئەو ئەنجامەی کە پەتاکە دواین قوربانییەکانی خۆی لە بازاڕەکان هەڵدەگرێ و دوای بیست ڕۆژی تر شار بەجێ دەهێڵێ. خۆجە نەیپرسی بۆ گەیشتن بەم ئەنجامە پشتم بەچ بەستووە، ئەوەندە نەبێ گوتی ڕۆژی ڕزگاربوونمان دوورە. داوای کرد جارێکی تر خشتەی کاتەکە بەگوێرەی دوو هەفتە دابڕێژمەوە و ماوەکەش بە ژمارەی تر بشارمەوە. هێندە گەشبین نەبووم، بەڵام داخوازەکەیم بەجێ هێنا. خۆجە هەر لەوێ چەند ڕستەیەکی خشتەی کاتەکەی ڕاست کردەوە و دای بەدەست خۆشنووسەکەوە کە لەو کاتەدا کاری خۆی تەواو کردبوو. داوای لە منیش کرد وێنەی هەندێ لە بەیتەکان بکێشم. بەپەلە بەرگێکی شین و بە نەخش و نیگاری بۆ لێکۆڵینەوەکە دابوو بە دروستکردن. کاتێک لای نیوەڕۆ هەڵی گرت و ڕۆیشت، بێ کەیف و بێزار بوو و ترس لە ڕووی نیشتبوو. بە منی گوت هێندەی متمانەی بە ماسیگرە دەنووک درێژەکان و گا باڵدارەکان و مێرووله سوورەکان و مەیموونە قسەکەرەکانی ناو لێکۆڵینەوەکە هەیە، هێندە باوەڕی بە خشتەی کاتەکە نییە.

ئێوارە کە گەڕایەوە، زۆر خرۆشابوو. خرۆشانەکەی، بەدرێژایی ئەو سێ هەفتەیە کە توانی تیایدا ڕاستیی فاڵەکانی بە سوڵتان بداتە قبووڵکردن، بەردەوام بوو.

دەسپێک دەیگوت: "هەموو شتێک شیاوە." ڕۆژی یەکەم هیچ ئومێدێکی نەبوو، چونکە کاتێک سوڵتان چیرۆکەکەی بە غوڵامێکی لاو و دەنگخۆش دابوو بە خوێندنەوەدا، بزە کەوتبووە سەر لێوی چەند کەسێکی ناو ئاپۆڕەکەی دەروبەری. بەڵام دیار بوو بە زۆر لە خۆکردنەوە ئەو ڕەفتارەیان نواندبوو تا خۆجە ڕیسوا بکەن و لە بەرچاوی سوڵتانی بخەن. بەڵام سوڵتان ئەوانی بێدەنگ کردبوو و جنێوی پێیان دابوو. لە خۆجەشی پرسیبوو پشتی بە چ بەڵگەیەک بەستووە بۆ کۆتایی هاتنی پەتاکە لەماوەی دوو هەفتەدا. خۆجەش گوتبووی سەرجەمی شتەکان لەو چیرۆکەدایە کە هەموو کەسێک لێی تێ ناگات. پاشان بۆ ئەوەی خۆی لای سوڵتان شیرین بکات، خۆشەویستیی خۆی بۆ ئەو پشیلە ڕەنگاوڕەنگانە نیشان دابوو کە بە کەشتی لە ترابزۆنەوە هێندرابوون و نەک تەنیا حەوشەکانی ناوەوە، بگرە بە کون و کەلەبەری ژوورەکانی کۆشکدا بڵاوکرابوونەوە.

لە گەڕانەوەی ڕۆژی دووەمیدا، گوتی کۆشک بەسەر دوو بەرەدا دابەش بووە: دەستەیەک کە گەورەی ئەستێرەناسان سدقی ئەفەندیشیان لەگەڵدا بوو، داوای هەڵگرتنی هەموو ڕێوشوێنە لە بەرچاو گیراوەکانی ناو شاریان کردووە. ئەوانی تریش لەگەڵ خۆجەدا گوتبوویان: "با شار هەناسە وەرنەگرێ، بۆ ئەوەی ئەو ئیبلیسی پەتایەش کە بە شاردا دەسووڕێتەوە، نەتوانێ هەناسە بدات." من ڕۆژ بە ڕۆژ سەیری دابەزینی ژمارەی مردووانم دەکرد و ئومێدێکم لا پەیدا دەبوو، بەڵام خۆجە هێشتا لە جۆشی خۆی نەکەوتبوو. دەگوترا دەستەی یەکەم لەگەڵ کوپرولودا ڕێک کەوتوون و دەستیان کردووە بە خۆسازدان بۆ ڕاپەڕین. ئامانجیشیان ڕێگرتن لە پەتاکە نەبوو، بگرە لەکۆڵکردنەوەی دوژمانیان بوو.

لە کۆتاییی هەفتەی یەکەمدا ژمارەی مردووان بەشێوەیەکی بەرچاو کەمی کردبوو، بەڵام هەمان کات لێکدانەوەکانی من دەریان خستبوو پەتاکە دوای هەفتەیەکی تر نابڕێتەوە. داوام لە خۆجە دەکرد بەپێی ئەو گۆڕانکارییانە ڕەفتار بکات کە من لە خشتەی کاتەکەدا دەیانکەم، بەڵام ئەو ئیدی ئومێدی پەیدا کردبوو. بە جۆشەوە باسی ئەوەی گێڕایەوە کە قسە و قسەڵۆک دەربارەی باشوەزیر کۆتاییی پێ نایەت، بۆیە دژبەران وایان بڵاو کردووەتەوە کە کوپرولو لەگەڵ ئەواندایە. سوڵتانیش کە

بەتەواوی لەبەرامبەر ئەو پیلانگێڕی و فێڵ و تەڵەکەیەدا بێچارە مابوو، لای پشیلەکان بەدوای ئاسوودەییی دەروونیدا دەگەڕا.

دوای تێپەڕینی دوو هەفتە، شار لە پەتاکە زیاتر، نوقمی ڕێوشوێنە لە بەرچاو گیراوەکان بووبوو. ڕۆژ لەدوای ڕۆژ کەمتر مرۆڤ دەمردن، بەڵام تەنیا ئەوانەی وەک ئێمە لە کارەکە ئاگادار بوون، بەمەیان دەزانی. قسە و قسەڵۆک لەبارەی سەرهەڵدانی برسیەتی پەیدا بووبوو. ئەستەنبوڵ لە شارێکی چۆڵکراوی ترسناک دەچوو. من لەبەرئەوەی نەمدەتوانی لە گەڕەکی خۆمان بچمە دەرەوە، خۆجە بۆمی دەگێڕایەوە: مرۆڤ هەست بە بێچارەییی خەڵکانی پشت هەموو ئەو پەنجەرە و دەرگا داخراوانەی حەوشەکان و زۆرانەی ئەوان لەگەڵ پەتاکە و چاوەڕوانییان بۆ شتێکی تری دەرەوەی پەتا و مردن دەکات. لە کۆشکیشدا هەست بەم چاوەڕوانییە دەکرا، هەر کاتێک فنجانێک بکەوتایەتە خوارەوە، یاخۆ کەسێک بە دەنگێکی بەرز بکۆکیبایە، ئاپۆڕەی لەوچە و زماندرێژان زراویان دەتۆقی و بە فسکەفسک لە نێوان خۆیان دەدوان و دەیانگوت با بزانین سوڵتان ئەمڕۆ دەستووری چی دەدات. بەڵام ئەوانیش وەک کەسانی بێچارە دەیانگوت با شتێک بقەومێ، سا هەر شتێک بێ و ئیدی دەپەشۆکان. خۆجەش دەکەوتە ژێر کاریگەریی شڵەژانی ئەوانەوە. هەوڵی دابوو لە سوڵتان بگەیەنێ پێشبینییەکەی ڕاست دەرچووە و پەتاکە هێدی هێدی پاشەکشە دەکات، بەڵام نەیتوانیبوو زۆر کاری تێ بکات. لە ئاکامدا ناچار بووبوو جارێکی تر باسی ئاژەڵەکانی بۆ بکاتەوە.

دوای دوو ڕۆژ لە ئەنجامی ئامارێک کە لە مزگەوتەکاندا کرابوو، بۆی دەرکەوتبوو پەتاکە بەڕاستی پاشەکشەی کردووە، بەڵام شادمانیی خۆجە لەو ڕۆژی هەینییەدا تەنیا لەو هەواڵەوە سەرچاوەی نەگرتبوو: دەستەیەکی بچووکی بازرگانانی ئومێد لێبڕاو، ڕێگاکانیان گرتووە و لەگەڵ یەنیچەرەکاندا کەوتوونەتە شەڕ. دەستەیەکی تر لەو یەنیچەرانەی لە ڕێوشوێنە لە بەرچاو گیراوەکان بێزار بووبوون، یەک دوو پێشنوێژی دەبەنگی مزگەوتەکانی کۆڵان و کۆمەڵێک سەرسەریی سەوداسەری دزی و تاڵان و بڕێک بێکار و نەداریان بەلای خۆیاندا ڕاکێشابوو و گوتبوویان پەتاکە کاری خوایە و نابێ دەستی تێ وەربدرێ، بەڵام ئاژاوەکە بەرلەوەی پەرە بسێنێ، لەجێدا

دەستی بەسەردا گیرابووو. پاش وەرگرتنی فەتوای شێخول ئیسلامیش، بیست کەس بەداردا کرابوون. لەوانەشە بۆ ئەوە بووبێ ڕووداوەکان لە خۆیان گەورەتر نیشان بدرێن. خۆجە زۆر لە خۆی ڕازی بوو.

ئێوارەی ڕۆژی دواتر خۆجە سەرکەوتنی خۆی ڕاگەیاند. ئیدی کەس لە کۆشک نەیدەوێرا خۆی لە قەرەی باسی هەڵگرتنی ڕێوشوێنە لەبەرچاو گیراوەکان بدات. سەرگەورەی یەنیچەرەکان بۆ کۆشک بانگ کراوە، ئەویش قامکی خستووەتە سەر ئەو کەسانەی ناو کۆشک کە پشتیوانی لە یاخیبووان دەکەن. سوڵتان بەمە زۆر توڕە بووە، ئەو دەستەیە کە بە دوژمنایەتیکردنی خۆیان چەندین ڕۆژ تاڵاویان بە قورگی خۆجەدا کردبوو، وەک بەچکە سوێسکە بڵاوەیان لێ کردبوو. کوپرولویش کە ناوەناوە دەگوترا لەگەڵ یاخیبووواندایە، دەگوترێ ئێستا بڕیارە بەتوندی بەرەنگاریان ببێتەوە. خۆجە بەدڵخۆشییەوە گوتی کە خۆیشی لەم لایەنەوە کاریگەریی بەسەر سوڵتانەوە هەبووە. ئەوانەی کە بەرپەرچی یاخیبووانیان دەدایەوە، بۆ قایلکردنی سوڵتان، باسی پاشەکشەکردنی پەتاکەیان بۆ دەکرد. ئەم قسەیەش ڕاست بوو. سوڵتان چەند وشەیەکی پیاهەڵدانی بە خۆجەدا گوتبوو کە پێشتر هەرگیز بە زمانیدا نەهاتبوو. بەمەبەستی ئەوەی ئەو مەیموونانەی نیشان بدات کە لە ئەفریقاوە بۆی هاتبوو، ئەوی بۆ لای قەفەسەکان بردبوو. بەدەم سەیرکردنی مەیموونەکانەوە کە بە قرێژی و بێ ئابڕوویی خۆیان هێڵنجیان بە خۆجە دابوو، سوڵتان پرسیبووی داخۆ دەکرێ وەک تووتی فێری قسە بکرێن یاخۆ نا؟ پاشان ڕووی لەوانەی دەوروبەری کردبوو و گوتبووی خوازیارە لەمەودوا خۆجە زیاتر لەپەنای خۆیەوە ببینێ و گوتبووی ئەو خشتەی کاتەی ئەو ئامادەی کردووە، ڕاست دەرچووە.

دوای مانگێک و لە ڕۆژی هەینیدا خۆجە بوو بە گەورەی ئەستێرەناسان. بگرە لەوەش زیاتر: کاتێک سوڵتان بەنیازی بەشداربوون لە نوێژی هەینی بۆ مزگەوتی ئەیاسۆفیا دەچوو، خۆجە چەند هەنگاوێک لەدوای ئەوەوە ڕێی دەکرد. ئەو ڕۆژە نوێژەکە بەمەبەستی سوپاس و دەربڕینی پێزانین لەپای برانەوەی پەتاکە بەبەشداریی هەموو خەڵکی شار دەخوێندرا. ڕێوشوێنە لەبەرچاو گیراوەکان هەڵگیرابوون. منیش لە ناو ئەو ئاپۆڕە پڕ لە هات و هاوارەدا بووم کە سوپاسی خوا

و سولّتانیان دەکرد. کاتێک سولّتان بەسواری ئەسپەکەیەوە بەلاماندا تێ پەڕی، هەموو ئەوانەی دەوروبەرم بەدەم قیرە و هاوارەوە لە هۆشی خۆیان چوون و پاڵنان بۆ پێش و پاشەوە دەستی پێ کرد. ئاپۆڕەکە شەپۆلی دەدا، یەنیچەرەکان پاڵیان پێمانەوە نا بۆ دواوە. کەوتمە ناو قەرەباڵەغییەکەوە کە پێش من خۆیان بە دارێکەوە گرتبووەوە. کاتێک ئاپۆڕەکەم دایە بەر ئەنیشک و خۆم هاویشتەوە پێشەوە، نیگام لە نیگای خۆجە چەقی کە چوار پێنج هەنگاو لەولای منەوە بە دڵخۆشی و لەخۆباییبوونەوە ڕێی دەکرد. وەک ئەوەی نەمناسێ، نیگای لەسەرم هەڵگرت. لەو هەرا ترسناکەدا لەپڕ جۆشێکی بوودەڵانە دای گرتم و باوەڕم کرد خۆجە لەو ساتەدا منی نەبینیووە. بۆیە بەتەواوی هێزەوە قیراندم و بانگم کرد، دەمویست لە ئامادەبوونم لەم شوێنەدا ئاگادار بێ. وام دەزانی ئەگەر بمبینێ، لە ناو ئەم ئاپۆڕەیە ڕزگارم دەکات و منیش دەتوانم لە کەژاوەی کامەرانی خاوەن هێز و سەرکەوتووانددا بەشداری بکەم! بەلام ئەمەم بەمەبەستی وەرگرتنی بەشی خۆم لە سەرکەوتن یاخۆ بۆ وەرگرتنی نرخی کارەکانم نەبوو، بگرە هەستێکی تەواو جیاواز لە هەناومدا بوو. دەبووایە من لەوێ بوومایە، چونکە من خۆجە خۆی بووم! کتومت وەک ئەوەی لە خەونە ترسناکەکاندا کە پەیتا پەیتا دەمبینی، لە خۆم جیابووبوومەوە و خۆم لە دەرەوەی خۆمدا دەمبینی. لەبەرئەوەشی دەمتوانی خۆم لە دەرەوە ببینم، کەواتە من کەسێکی تر بووم. مەبەستم نەبوو بزانم ئەو کەسە کێیە کە من چوومەتە پێستیەوە، دەمویست خۆم بەو کەسە بگەیەنم کە بە بەردەممدا تێ پەڕی و منی نەناسیەوە و بەترسەوە بۆمی ڕوانی. بەلام سەربازێکی ئاژەڵ ئاسا بەهەموو هێزی خۆیەوە پاڵێکی پێمەوە نا و منی گەڕاندەوە دوواوە بۆ ناو ئاپۆڕەکە.

## 8

خۆجە، لە هەفتەکانی پاش بڕانەوەی پەتاکە هەر بەوەندە نەگیرسایەوە کە کرابوو بە گەورەی ئەستێرەناسان، بگرە پێوەندییەکی توندوتۆڵی زیاتر لەوەی ئێمە چەند ساڵێک بەئومێدەوە چاوەڕوانی بووین، لەگەڵ سوڵتان بنیات نابوو. دوای سەرهەڵدانە سنووردار و بەئاکام نەگەیشتووەکە، باشوەزیر لە دایکی سوڵتانی گەیاندبوو کاتی ئەوە هاتووە کوڕەکەی لە دەمامکدارانی دەوروبەری ڕزگار بکرێ. بازرگانان و یەنیچەرەکانیش ئاپۆڕەی لەوچە و چەنەبازانی دەوری سوڵتانیان بە لێپرسراوی کارەساتەکان دەزانی و دەیانگوت ئەوانە بە قسەی قۆڕ و پڕوپووچ سوڵتانیان بەڕێی خراپدا بردووە. بەوجۆرە، دەستە و تاقمی سدقی ئەفەندیی گەورەی ئەستێرەناسانی پێشوو، کە دەگوترا دەستیان لە پیلانەکەدا هەبووە، بە دوورخستنەوە و گواستنەوەیان بۆ کاری تر، لە کۆشک دەرکران و کارەکانیان کەوتە ئەستۆی خۆجە.

ئیدی خۆجە هەر ڕۆژەی دەچووە یەکێک لەو کۆشکانەی کە سوڵتان وچانی تێدا دەدا و ئەویش کاتێکی بۆ دەستنیشان کردبوو و لەتەکیدا دەدوا. دوای گەڕانەوەی بۆ ماڵەوە، بە جۆش و لەخۆباییبوونی بەرئەنجامی سەرکەوتنەوە بۆ منی دەگێڕایەوە: هەموو بەیانیانێک، خەونی شەوی ڕابردووی بۆ سوڵتان لێک دەدایەوە. ئەم ئەرکەی لە هەموو کارە پێ ڕاسپێردراوەکانی دی پێ خۆشتر بوو. بەیانیانێک، کاتێک سوڵتان بەخەمگینی دانی پێدا دەنێ کە شەوی ڕابردوو خەونی نەبینیووە، خۆجە پێشنیاز دەکات خەونی کەسێکی تر لێک بداتەوە. سوڵتانیش بەپەرۆشەوە پێشوازی لەم بیرۆکەیە دەکات. پاسەوانەکان دەمودەست دەکەونە گەڕان بەدوای یەکێکدا کە

خەونێکی باشی بینیبێ و کەسێک دەدۆزنەوە و دەیهێننە بەردەم سوڵتان. بەو جۆرە لێکدانەوەی خەون لە بەیانیاندا، بووبوو بە خوویەک نەدەکرا دەستی لێ هەڵبگیرێ. کاتەکانی تریش بە حەوشە و بەژێر سێبەری دارچنار و دارئەرخەوانی ناو باخچەکاندا پیاسەیان دەکرد. ناوەناوەش بە بەلەم دەچوونە تەنگەی بوسفۆر و لەبارەی ئاژەڵە خۆشەویستەکانی سوڵتان و ئاژەڵە خەیاڵکردەکانی ئێمەوە قسەیان دەکرد. بەڵام خۆجە جاروبار چەند بابەتێکی تریشی دەدا بەبەر گوێی سوڵتاندا و دواتریش بە جۆشەوە بۆ منیشی دەگێڕایەوە: هۆی ڕێژگە و ئاوەڕۆکانی بوسفۆر چین؟ چ شتێک لە ژیانی ڕێکوپێکی مێرووڵەدا هەیە کە شایەنی لێوە فێربوون و تێگەیشتن بێ؟ موگناتیس، دوای خوا، هێزی خۆی لە چ شتێکی تر وەردەگرێ؟ گرینگیی سوڕانەوەی ئەستێرەکان بەمجۆرە یاخۆ بەوجۆرە لە چیدایە؟ ئایا دەکرێ لە ژیانی گاوراندا شتێکی جیاوازتر لە گاوربوونیان بدۆزرێتەوە؟ ئایا دەتوانین چەکێک دروست بکەین ئەوانی پێ ڕابماڵین و قاویان بدەین؟ خۆجە دەیگوت سوڵتان بەسەرنجەوە گوێ بۆ ئەم بابەتانە دەگرێ. پاشان بە جۆشەوە دەچووە بەردەم مێزەکە، بەمەبەستی داڕشتنی نەخشەی ئەو چەکە، لەسەر کاغەزی ئەستوور و گرانبەها وێنەی تۆپی لوولەدرێژ و میکانیزمی تەقاندنی خۆبەخۆ و شێوەی چەکی ئەوتۆی دەکێشا کە وەک ئاژەڵی ئیبلیسی دەهاتنە بەرچاو. منیشی بۆ بەردەم مێزەکە بانگ دەکرد و داوای لێم دەکرد ببم بە گەواهیدەری تەوژمی ئەو خەیاڵانەی کە دەیگوت کاتی بەدیهاتنیان زۆر نزیک بووەتەوە.

منیش لە خۆمەوە دەمویست هاوبەشیی خەیاڵەکانی خۆجە بم. لەوانەشە لەو سۆنگەیەوە بووبێ هێشتا هۆشم لای ئەو ڕۆژانەی پەتاکە بوو کە هەلی پێکەوە ژیانی برایانەی ترسناکی بۆمان ڕەخساندبوو. گەرچی هەمووان بەبیانووی بەسەرچوونی پەتاکە پێکەوە دەچوونە مزگەوتی ئەیاسۆفیا و سوپاسبێژێری و نوێژیان دەکرد، بەڵام نەخۆشییەکە هێشتا بەتەواوی دەستی لە یەخەی شار بەرنەدابوو. بەیانیان، دوای ئەوەی خۆجە بە هەڵەداوان خۆی دەگەیاندە کۆشکی سوڵتان، من بەپەرۆشەوە بەشاردا دەسووڕامەوە، ژمارەی ئەو تەرمانەم تۆمار دەکرد کە لە مزگەوتی منارەکورتی گەڕەکەکان و لەو هۆڵی نوێژانەوە کە دیوارەکانیان قەوزەی گرتبوو،

دەهێندرانە دەرێ و بە غەریزەیەک، کە زۆر لە هۆکارەکەی نەدەگەیشتم، نەمدەویست نەخۆشییەکە بڕوات و شار و ئێمە بەجێ بهێڵێ.

لە کاتێکدا خۆجە لە بارەی کاریگەریی دانان لەسەر سوڵتان و سەرکەوتنی خۆیەوە دەدوا، من بۆم باس کرد کە نەخۆشییەکە هێشتا شاری بەجێ نەهێشتووە و بەهۆی هەڵگرتنی ڕێوشوێنە لە بەرچاو گیراوەکانەوە خەریکە دیسانەوە تاو دەسێنێ. ئەو بەدەم هەڵچوونەوە منی بێدەنگ دەکرد و دەیگوت گوایە ئێرەییم بە سەرکەوتنی ئەو بردووە. مافی خۆی بوو، چونکە بوونی ئەو بە گەورەی ئەستێرەناسان و بوونی بە کەسێک کە سوڵتان هەموو بەیانیانێک خەونەکانی خۆی بۆ دەگێڕێتەوە و گەیاندنی دەنگی بە سوڵتان دوور لە چاوی ئەو ئاپۆڕە بێ مێشکەی دەوروبەری، سەرکەوتنێکی گەورە بوو و شتگەلێک بوون کە پازدەساڵ بوو چاوەڕێی بەدیهاتنیان بووین. بەڵام بۆچی خۆجە بەشێوەیەک باسی ئەو شتانەی دەکرد وەک ئەوەی بەتەنیا سەرکەوتنی خۆی بێ؟ وا دیاربوو لە بیری چووبووەوە کە لە بەرچاو گرتنی ڕێوشوێنی دژ بە پەتاکە پێشنیازی من بووە و لە بیری نەمابوو من ئەو نەخشەی کاتەم داڕشت، کە سەرەڕای زۆر ڕاست دەرنەچوونیشی، وەک خۆی پەسەند کرا. ئەوەی منی زیاتریش بریندار دەکرد، تەنیا بیرهێنانەوەی چۆنیەتی ڕۆیشتنی من بوو بۆ دوورگەکە، نەک هاتنی پڕ لە پەشۆکانی خۆی بۆ دوورگەکە و بردنەوەی بە دەستوبردی من بۆ ماڵ.

لەوانەشە لەسەر ماف بووبێ. ڕەنگە ئەوەی کە من هەستم پێ دەکرد، ناوی ئێرەیی لێ بندرێ، بەڵام ئەمە هەستێکی برایانە بوو کە ئەو پەی پێ نەدەبرد. بۆ ئەوەی لەمە تێ بگات، بیرم هێنایەوە چۆن لە ڕۆژانی پێش پەتاکە، وەک دوو پیاوی زگورتی کە هەوڵدەدەن بێزاریی شەوانی تەنیایی لە بیر بکەن، لەمبەر و ئەوبەری مێزەکە دادەنیشتین؛ چۆن هەندێ جار ترس ئەو و ناوەناوەش منی دادەگرت و بەڵام زۆر شتیش لەو ترسە فێر بووین و تەنانەت کە لە دوورگەکەش بووم، تاسەی ئەو شەوانەم دەکرد. بەڵام ئەو، وەک کەسێکی بەشدارنەبوو لە گەمەیەک کە فرت و فێڵەکانی منی بەچاوی خۆی بینیبێ، بە سووک تێڕوانینەوە گوێی بۆ قسەکانم ڕادەگرت و هیچ ئومێد و بەڵێنێکی پێم نەدەدا بۆ گەڕانەوە بۆ ڕۆژانی برایەتیمان.

لە گەڕانی کۆڵان بە کۆڵانمدا ئیدی دەمبینی: سەربارى هەڵگرتنی ڕێوشوێنە لە بەرچاو گیراوەکان، وەک ئەوەی بمەوێ ئەوەی خۆجە ناوی لێ ناوە سەرکەوتن، نەخەمە سێبەرەوە، پەتاکە لەسەرخۆ لە شار دەکشایەوە. جاروبار لە خۆم دەپرسی گەلۆ ئەم هەستی تەنیایییە لەکوێوە دێ لە کاتێکدا وا ترسی ڕەشی مردن لەنێومان دەردەچێ و دەڕوات. جاروبار دەمویست لەگەڵ خۆجە ئەو بابەتانە بخەینە بەر باس، نەک خەونەکانی سوڵتان یان ئەو ڕاوێژ و پێشنیازانەی کە خۆجە بۆی دەکرد. لەمێژ بوو ئامادەبووم شانبەشانی ئەو و بە لەبەرچاو گرتنی ترسی مردنیشەوە بچمە بەردەم ئاوێنە ترسناکەکە کە لەو کاتەدا لە دیوارەکە هێنرابووە خوارەوە! بەڵام ماوەیەکی زۆر بوو خۆجە بە چاوی سووکەوە سەیری منی دەکرد، یان وا خۆی نیشان دەدا. لەوەش خراپتر، هەندێ جار پێم وابوو تەنانەت لەوەشدا تەمبەڵی دەنوێنێ.

جاروبار بەمەبەستی ئەوەی دووبارە بۆ ناو ژیانی کامەرانیی ڕابردوومان بەکێشی بکەمەوە، دەمگوت پێویستە ئیدی بچینەوە بەردەم مێزەکەمان. بەمەبەستی دەس پێشخەریکردن و بۆ ئەوەی ئەویش چاوم لێ بکات، دوو سێ جار پڕکردنەوەی کاغەزیشم تاقی کردەوە. بە پێوەنانەوە چەندین پەڕەم دەربارەی ترسی پەتاکە، خواستی ئەنجامدانی خراپەکاریی دەستچێنی پەتاکە و خراپەکارییە نیوەناچڵەکانم نووسی و بۆم خوێندەوە، بەڵام ئەو تەنانەت گوێیشی لێم ڕانەگرت. بەهێزێکەوە، کە ڕەنگە لە بێچارەییی منەوە وەری گرتبێ، نەک لە سەرکەوتنی خۆیەوە، بێ ئابڕووانە گوتی: "ئەو ڕۆژانەش دەمزانی سەرتاپای نووسینەکانت تووڕەهات نەبێ، هیچ شتێکی تر نییە. کاتی خۆی لە بێزاریی خۆمەوە ئەو گەمانەم دەکرد و دەمویست بزانم ئاکام بەچی دەگات. کەمێکیش بۆ تاقیکردنەوەی تۆم بوو. هەر ئەو ڕۆژەی کە واتزانی من پەتام گرتووە و هەڵهاتی، تێ گەیشتم چ ماڵێکی. تۆ تاوانباری! مرۆگەل دەبن بەدوو بەشەوە؛ ئەوانەی وەک منن، لەسەر مافن، ئەوانەی وەک تۆن، تاوانبارن."

وەڵامم نەدایەوە و هەوڵم دا قسەکانی وەک کەسێکی لەخۆبایی لە سەرکەوتندا، لێک بدەمەوە. گەرچی بیرەوەریم وەک جاران تیژ بوو و دەمزانی ئەگەر بەوردە ڕووداوەکانی ڕۆژ پەست بکرێم، ئامادەم تووڕەییی پێویست نیشان بدەم، بەڵام وەک

بڵێی نەمدەزانی بە بەرپەرچدانەوەی قسەکانی، کە لە ڕاستیدا مرۆڤی بۆ هێرشی پێچەوانە هان دەدا، ئاراستەی خۆجە بەرەو کوێ وەردەگێڕم و تا چ ڕادەیەک تەنگاوی دەکەم. هەر ئەو ڕۆژانەی لە دەستی ئەو هەڵهاتبووم و چووبوومە دوورگەی هەیبەلی، هەستم کردبوو ئامانجم ڕوون نییە. چ دەبوو ئەگەر بگەڕامایەوە بۆ ڤینیسیا؟ زۆر لەمێژ بوو بڕوام بەخۆم هێنابوو کە لەو پازدە ساڵەدا دایکم مردووە و دەزگیرانەکەشم شووی کردووە و کۆشێ منداڵی خستووەتەوە. نەمدەویست بیریان لێ بکەمەوە و بە تێپەڕبوونی کاتیش دەگمەنتر دەهاتنە خەونم. لەوەش خراپتر، ئیدی وەک سالانی دەسپێک لە خەونەکانمدا خۆم لە ڤینیسیا لە ناو کەسوکارمدا نەدەبینی، بگرە ئەوانم لێرە، لە ئەستەنبوڵ لە نێوان خۆماندا دەبینی. دەمزانی ئەگەر بگەڕێمەوە ڤینیسیا، ناتوانم سەرلەنوێ دەست بە ژیانێک بکەمەوە کە لە نیوەدا دەستم لێ هەڵگرتبوو. خۆ ئەگەر هەر پێویستیش بێ، ئەوا لە نووکەوە دەست بە ژیانێکی تر دەکەم. ئەوەی لێ دەرچێ کە سەردەمانێک بیرم دەکردەوە یەک دوو کتێب دەربارەی تورک و سالانی کۆیلایەتیم بنووسم، ئیدی هیچ شتێکی تر لەو ژیانەی ترم نەبوو بمجووڵێنێ.

جاروبار خەیاڵم دەچوو بۆ ئەوەی خۆجە پەی بەم بێ نیشتمانی و بێ ئامانجییەی من بردبێ و هەستی بە لاوازیم کردبێ، بۆیە بەچاوی سووک سەیرم دەکات. هەندێ جاریش گومانم هەبوو تەنانەت هەستیشی بەو شتانە کردبێ. هەموو ڕۆژێ، بەو چیرۆکانەی بۆ سوڵتان دەگێڕایەوە و بە خەیاڵی ئەو چەکە لە ئەقڵ بەدەرەی کە دەیگوت دڵنیایە لەوەی دەتوانێ کاریگەریی لەسەر دادەنێ و بە سەرکەوتنی خۆیشی، هێندە مەست بوو، بەڕادەیەک دەتوانم بڵێم تەنانەت بەشێوازی بیرکردنەوەی منی هەر نەدەزانی. هەستم دەکرد بەئێرەیی پێبردنەوە سەیری ئەو بەخۆ شادبوونەی خۆجەم دەکرد. خۆشم دەویست، ئەو جۆشە دەستکردەی کە لە سەرکەوتنە پێوەنراوەکەی وەری دەگرت و پرۆژە لەبن نەهاتووەکانیم خۆش دەویست. کاتێک دەیگوت سوڵتان دەخاتە ناو لەپی دەستیەوە، من شەیدای ئەو نیگایەی دەبووم کە لە ناو لەپی خۆی دەبری. ئەگەرچی خۆشم ئامادە نەبووم دان بەمجۆرە بیرکردنەوانەدا بنێم، بەڵام کاتێک چاودێریی هاتوچۆ و هەڵسوکەوتی ڕۆژانەی ئەوم دەکرد، وام

هەست دەکرد چاودێریی خۆم دەکەم. مرۆڤ جاروبار لە هەڵسوکەوتی منداڵێک یاخۆ گەنجێکدا، منداڵی یان لاویەتیی خۆی دەبینێ و بە خۆشەویستی و پەرۆشەوە چاودێریی دەکات. ترس و پەرۆشم ئەوە بوو کە بەردەوام وام بە خەیاڵدا دەهات مەچەکم بگرێ و پێم بڵێ "من بووم بە تۆ." کاتێک ڕۆژانی ڕابردووم دەخستەوە بیری، ئەو بێدەنگی دەکردم. یان باسی ئەوەی دەکرد ئەو ڕۆژە چی بە سوڵتان گوتووە تا بیخاتە سەر کەڵکەڵەی چەکە لە ئەقڵ بەدەرەکە، یاخۆ بەوردی باسی ئەوەی دەگێڕایەوە کە سەرلەبەیانیی ئەو ڕۆژە بەدەم لێکدانەوەی خەونەوە، چۆن کاریگەریی لەسەر سوڵتان داناوە.

ئارەزووم بوو منیش بڕوا بە تیشکی ئەو سەرکەوتنانەی بکەم کە ئەو لە گێرانەوەیاندا هەنگوینی بەسەردا دەڕژاندن. جاری وا هەبوو جڵەوی خەیاڵم لە دەست دەدا و بە شادمانییەوە باوەڕم بەخۆم دەهێنا چووبێتمە جێی ئەو. لەو ساتانەدا، ئەویش و خۆشم زیاتر خۆش دەویست و گێژوویژ و بەدەمی داچەقاوەوە لە قسەکانیدا ون دەبووم و وامدەزانی بەجۆرێک باس لە ڕۆژانی جوانی داهاتوو دەکات، وەک ئەوەی ئامانجی هاوبەشی هەردووکمان بێ.

بەوجۆرە، هەر کاتێک ئەو خەونەکانی سوڵتانی لێک دەدایەوە، منیش بەشدار دەبووم! خۆجە بڕیاری دابوو سوڵتانی بیست و یەک ساڵە هان بدات جڵەوی دەسەڵاتی خۆی قایمتر بکات. بەو شێوەیە کەوتە لێکدانەوەی خەونەکانی: بەدبەختیی ئەو ئەسپە تەنیایانەی کە بەردەوام لە خەونی سوڵتاندا چوارناڵەیان دەکرد، لەبەر بێ خاوەنییان بوو؛ ئەو گورگانەی بە کەڵبەی تیژیان پەلاماری قورگی دوژمنانی خۆیان دەدا، شادمان بوون، چونکە خۆیان بەکاری خۆیان ڕادەگەیشتن؛ پیرەژنانی ژار بەگریانەوە و کچانی کوێر و ئەو دارانەی لە بارانی تاریکیدا بەخێرایی گەڵایان دەوەری، هانایان بۆ سوڵتان دەهێنا؛ جاڵجاڵۆکەی پیرۆز و بازە بەخۆنازەکانیش نیشانەی فەزیلەتی تەنیایین. ئێمە دەمانویست سوڵتان، دوای گرتنە دەستی دەسەڵاتی تەواو، ئاوڕێک لە زانستەکەمان بداتەوە. بۆ ئەو مەبەستە، تەنانەت پەنامان بۆ مێردەزمە و خەونی ترسناکیش برد. وەک زۆربەی سەوداسەرانی ڕاو، لە شەوانی درێژ و وەڕەسکەری ڕاودا، سوڵتان بە خەیاڵ خۆی نێچیر بوو و ڕاو دەکرا.

بەترسی لە دەستدانی تەختەوە، لە خەونیدا خۆی بە منداڵی دەبینی کە لەسەر تەخت دانیشتووە. لە لێکدانەوەی ئەو خەونەیدا، خۆجە دەیگوت بەردەوام بەلاوی دەمێنێتەوە، بەڵام بۆ ڕزگاربوون لە داوی دوژمنانی بەردەوام نەخەوتوومان، پێویستە چەکێکی بەهێزتر لە چەکەکانی ئەوان دروست بکەین. کاتێک سوڵتان لە خەونیدا دەیبینی وا دوو لەتی کەرێک، کە سوڵتان موڕادی باپیری بۆ نیشاندانی هێزی بازوو، بە شمشێر کردوویەتی بە دوو لەتەوە، بەدەم ڕاکردنەوە لەیەک دوور دەکەونەوە؛ یاخۆ دایکی باوکی دەبینی، ئەو پیرەژنەی سوڵتان کۆسەمی پێ دەڵێن، وا ڕاست بووەتەوە و ڕووتوقووت هاتووە بۆ خنکاندنی ئەم و دایکی؛ یان لە شوێن چنارەکانی مەیدانی ڕمبازی، داری هەنجیر ڕوواوە و دارەکان لەبری هەنجیر تەرمی خوێنینیان گرتووە؛ یاخۆ دەستەیەک پیاوخراپ، کە ڕووخساریان لە ڕووخساری ئەم دەچێ، بەدوایەوەن بۆ ئەوەی بیگرن و توورەکەکانی دەستیان بکەنە سەری و بیخنکێنن؛ یاخۆ سوپایەکی کیسەڵ کە لە ئۆسکودارەوە دەچوونە دەریاوە، بای بەتینیش مۆمەکانی سەر پشتیانی نەدەکوژاندەوە و بە ئاگرەوە ڕوویان لە کۆشک دەکرد، ئێمە هەستمان دەکرد ئەو کەسانەی کە دەیانگوت سوڵتان کارەکانی دەوڵەتی فەرامۆش کردووە و جگە لە ڕاو و ئاژەڵ، هیچ شتێکی تری لەسەردا نییە، زۆر ناهەقن. ئەم خەونانەش، کە من بە پشوودرێژی و کەیفەوە دەمپۆلاندن و لە دەفتەرێکدا تۆمارم دەکردن، هەوڵمان دەدا لە بەرژەوەندیی زانست و ئەو چەکە لە ئەقڵ بەدەرەدا، کە پێویست بوو دروستی بکەین، لێکی بدەینەوە.

بەبۆچوونی خۆجە، هێدی هێدی کاریگەریمان لەسەر سوڵتان دادەنا، بەڵام من چیدی باوەڕم بە سەرکەوتن نەمابوو. دوای ئەو شەوانەی کە بە خەیاڵی خۆی بەڵێنی لە سوڵتان وەردەگرت بۆ بنیادنانی ڕوانگەخانە یان خانەی زانست، یاخۆ بۆ دروستکردنی چەکێکی نوێ، چەندین مانگ تێ دەپەڕی، بێ ئەوەی بتوانێ تەنانەت بۆ جارێکیش بەدەربەستەوە لەسەر ئەو بابەتانە لەگەڵ سوڵتاندا بدوێ. کاتێک کۆپرولو ساڵێک دوای پەتاکە کۆچی دوایی کرد، خۆجە دیسان بیانووی کەوتەوە دەست بۆ ئەوەی ئومێدی لا زیندوو بێتەوە. سوڵتان لەبەر سڵکردنەوەی لە هێز و کەسایەتیی کۆپرولو، خۆی لە جێبەجێکردنی نەخشەکانی ناو سەری دەدزیەوە. ئێستا باشوەزیر

مردووه و بەو پێیەی کوڕەکەی، کە لە بەهێزیدا بە باوکی ناگات، جێگای دەگرێتەوە، نۆرەی چاوەڕێکردنی بڕیاری بوێرانەی سوڵتان هاتبوو.

سێ ساڵی دواترمان لە چاوەڕوانیی ئەو بڕیارە بوێرانەیەدا بەسەر برد. بێ جووڵەییی سوڵتانی تیاماو لە نێوان خەون و ڕاودا، چی دی بۆ من مایەی سەرسوڕمان نەبوو. ئەوەی بەلای منەوە سەیر بوو، خۆجە هێشتا ئومێدی خۆی بە سوڵتانەوە گرێ دەدا. من بەدرێژاییی ئەو ساڵانە چاوەڕێی ئەو ڕۆژەم دەکرد ئومێدی لێ ببڕێ و وەک منی لێ بێ! ئیدی وەک جاران باسی ئەو شتەی نەدەکرد کە خۆی ناوی سەرکەوتنی لێ نابوو. ئەگەرچی جۆشی چەند مانگێکی دوای پەتاکەی نەمابوو، بەڵام هێشتا ئەو خەیاڵەی لە سەردا بوو ڕۆژێک سوڵتان، بەو شتەی پێی دەگوت پرۆژەی گەورە، قایل بکات. هەرجارە بیانوویەکی دەدۆزیەوە و دەیگوت: "ئەگەر سوڵتان یەکسەر دوای ئەو ئاگرە گەورەیەی ئەستەنبوڵی کردە قەرەبرووت، پارە بۆ پرۆژە گەورەکان تەرخان بکات، ئەوا هەل دەکەوێتە دەستی ئەو دوژمنانەی دەیانەوێ براکەی بهێننە سەر تەخت. سوڵتان ئێستا هیچ شتێک ناکات، چونکە سوپا لە شەڕی مەجەرستانە." ساڵی دوایش لەبەرئەوەی لە دژی ئەڵمانیا کەوتبووینە شەڕەوە، چاوەڕێمان دەکرد. دواتر کاروباری بنیاتنانی مزگەوتی والیدە لە ئارادابوو، کە پوولێکی زۆری بۆ تەرخان کرابوو و خۆجەش ناوبەناو لەگەڵ دایە سوڵتان خەدیجە تورهان و سوڵتاندا بەسەری دەکردەوە. پاشانیش ڕاووشکاری لەبن نەهاتوو هەبوو، کە من بەشداریم تێدا نەدەکرد. من بەدەم چاوەڕوانیکردنی گەڕانەوەی خۆجەوە لە ڕاو، هەوڵم دەدا پەیڕەوی لە ئامۆژگارییەکانی بکەم، بەدوای بیرۆکەی درەوشاوەدا بۆ ئەو شتانە دەگەڕام کە ئەو بە "پرۆژەی گەورە" یان "زانست" ناوی دەبرد و تەمبەڵانە و بەدەم خەوەنووچکێوە لاپەڕەی کتێبەکانم هەڵدەدایەوە.

ئەم خەیاڵی پرۆژانە، کە ئەگەر ڕاستیش دەرچوونایە، ئەنجامەکەی بەلای منەوە گرینگ نەبوو، چی دی مایەی دڵخۆشی نەبوو بۆ من. خۆجەش هێندەی من دەیزانی ئەو شتانەی لە ساڵانی سەرەتای یەکترناسینماندا لە بارەی زانستەکانی گەردووونناسی و جوگرافیا و سروشتەوە بیرمان لێ دەکردەوە، ئەنجامێکی بەرجەستەی نەبوو. سەعات و ئامێر و مۆدێلەکان ماوەیەکی درێژ بوو لە بیر کرابوون

و ژەنگیـان هەڵهێنابوو. هەموو شـتێکمـان دواخسـتبوو بـۆ ڕۆژێک، کە تیـایدا ئەو شـتەی ئـەو بە"زانست" ناوی دەبرد، دەخسـتە قۆناغی جـێبـەجێکردنەوە. ئەوەی بۆ ڕزگـاربوونمان لە کـارەسـاتی چاوەڕوانکراو لەبەر دەسـتـمـاندا بوو، زیاتر خـەیاڵی پرۆژەیەک بوو، نەک پرۆژەکە خۆی. بۆ باوەڕ هێنان بەو خەیاڵە بێرەنگانەی کە بەهیچ جۆرێک منیـان قـایل نەدەکرد و بەمـەبەسـتی ئەوەی لەگەڵ خۆجـەدا بم، دەکۆشـام لە ڕوانگەی ئـەوەوە سـەیری ئەو لاپەڕانە بکەم کـە جـاروبار هەڵم دەدانەوە و هـەوڵیـشـم دەدا خـۆم بخـەمـە جـێی ئەو. لە کـاتی گەڕانەوەیدا لە ڕاو، مـن خـۆم وا نیـشـان دەدا، ڕاسـتیـیـەکی نوێم لەم بابەت یاخـۆ لەو بابـەتەدا، کە بۆ خـۆپێـوە خەریککردن بۆ منـی بەجێ هێشـتبوو، دۆزیبێتەوە و وام دەنواند کەوا دەتوانین لەسـەر ئەو بنەمـایە هـەموو شـتێک بگۆڕین. کـاتێک دەمـگوت: "کشـان و خزانـی دەریا پێـوەندیی بە گـەرمـای ئەو جـۆگـەلانەوە هـەیە کـە دەرِێژنە ناوی"، یـان: "پەتا لـەرێی گـەردیلەکـانی نـاو هەواوە دەگوازرێتەوە، هـەوا بگۆڕێ، ئەویش دەڕوات و دوور دەکەوێتەوە"، یان: "لە دەسـتـمـان دێ چەکێکی گەورە دروست بکەین و بە لوولەی درێژی و پێـچکەکـانی ژێری هـەمـوو کەسـێکی پێ ڕاو بنێین"، یان: "زەوی بەدەوری ڕۆژدا دەسوڕێتەوە و ڕۆژیش بەدەوری مـانگدا"، خۆجـە بەدەم گۆڕینی کەلوپەلی تۆزاویی ڕاوەوە هـەمان وەڵامـی دەدایـەوە کە منی بە خـۆشـەویسـتیـیـەوە دەهێنایە پێکەنین: "جـا خـۆ ئەو گەمژانەی ئێمـە تەنانەت پەی بەو ڕاستییەش نابەن!"

پاشـان بەجۆرێک هـەڵدەچـوو، کە شـەپۆڵی تووڕەییی ئەو منیشـی دەدایە بەر. باسـی لە تورەهاتیـیـەکانـی ڕاو دەکرد و دەیگوت سـوڵـتان چەندین سـەعات بەسـەر پشـتی ئەسـپـەکـەیەوە دوای بەرازێکی سـەر لێـشـێـواو دەکـەوێ، یان فـرمـێسـک بۆ ئەو کەروێشکانە دەڕێژێ کە تاژییەکانی دەیگرن. بێ ویستی خۆی دانی پێدا دەنا کە ئەو قسانـەی بەدرێژاییی ڕاو بۆ سـوڵتانی دەکات، دەچێتـە ئەم گوێیەی و لەو گوێیـەیەوە دێتە دەرێ. پەیتـا پەیتا بە نەفرەتەوە دووپاتی دەکردەوە: "ئەم بێ ئەقڵانە کەی پەی بە ڕاسـتـیـیـەکـان دەبەن؟ ئایا یەکتـر دۆزینەوەی ئەو هـەمـوو گەمژەیە ڕێک کـەوتە، یان ناچاری؟ بۆچی هێندە گەمژەن؟"

بەوجـۆرە، هێدی هێدی تێ گەیشت ئەو شتـەی بە "زانست" ناوی دەبات، پێویستـە

ئەمجار لە سەرەتاوە بۆ تێگەیشتن لە ناواخنی مێشکی ئەوان دەستی پێ بکاتەوە، بەهۆی بیرکەوتنەوەی ئەو ڕۆژە خۆشانەی کە لە دەوری مێزێک دادەنیشتین و نەفرەتمان لەیەکدی دەکرد، منیش هەوای خۆهاویشتنە ناو ئەو "زانستە" لە کەللەمی دا، بەڵام دوای یەکەم تاقیکردنەوە بۆمان دەرکەوت ئیدی کار وەک جاران ناڕوات.

جارێکیان، لەبەرئەوەی نەمدەزانی چۆن و لەبەرچی تەنگاوی بکەم و بیخزێنمە گۆشەوە، کردم و کۆشام دەسەڵاتم بەسەریدا نەشکا. لەوەش گرینگتر، هەستم دەکرد ئازار و تێشکشکانەکانی ئەو، دەرد و شکستی خۆم بن. جارێک، ئەگەرچی خۆشم باوەڕم پێی نەبوو، بە نموونەی پێوەنراوەوە گەمژەییی ئەوانەی ئێرەم هێنایەوە بیری و دام بەبەر گوێیدا کە ئەویش هێندەی ئەوان ناچارە مل بۆ دۆڕاندن کەچ بکات و پاشان کەوتمە چاودێریکردنی: بەتوندی وەڵامی دایەوە و گوتی: "سەرنەکەوتن ناچاری نییە، ئەگەر پێش ئەوان بکەوین و خۆمان بدەینە ئەم کارە، بۆ نموونە، ئەگەر پرۆژەی چەکەکە بەدی بهێنین، ئەوا دەتوانین ڕێڕەوی شەپۆلی ئەو ڕووبارەی دەکۆشێ بۆ دواوە بمانگێڕێتەوە، بە ئارەزووی خۆمان بگۆڕین." گەرچی لەمەڕ پرۆژەکانەوە نا، بگرە وەک ئەوەی لە ساتەکانی بێ ئومێدیدا دەیکرد، بە گوتنی "پرۆژەکانمان" لەبری "پرۆژەکانم"، منیشی دڵخۆش دەکرد، بەڵام کەوتبووە بەر ترسی دۆڕانێکی چاوەڕوانکراو. بە منداڵێکی بێکەسم دەچوواند، ئەو تووڕەیی و غەمگینییەیم خۆش دەویست کە ساڵانی سەرەتای کۆلایەتیی خۆمی بیر دەخستمەوە. منیش دەمویست وەک ئەوم لێ بێ. کاتێک بەمسەر و بەوسەری ژوورەکەدا دەهات و دەچوو، یان سەیری کۆڵانە قرێژ و قوڕاوییەکەی ناو تاریکی و ژێر بارانی دەکرد، یاخۆ، وەک ئەوەی بەدوای سەرەداوی ئومێدێکی نوێدا بگەڕێ، بۆ فانۆسی کز و پرتەپرتکەری یەک دوو ماڵی قەراغ کەنداوی زێڕینی دەڕوانی، بۆ ساتێک وای بۆ دەچووم ئەوەی بەدەم ئازارەوە بە ژوورەکەدا دێ و دەڕوا، خۆجە نییە، بگرە گەنجیەتیی خۆمە. هەستم دەکرد ئەو کەسە خۆمم کە ماوەیەکە سەری هەڵگرتووە و منی بەجێ هێشتووە. منی خەواڵوو لە گۆشەیەکدا خۆزگەم دەخواست خۆجە بم، بۆ ئەوەی سەرلەنوێ جۆشی ونبووم بدۆزمەوە.

چیدی وزەی بەرگەگرتنی ئەو دڵەڕاوکێ و پەشۆکانە بێ کۆتایی و خۆ

دووبارەکەرەوەیەشم تێدا نەمابوو. لەدوای بوونی خۆجە بە گەورەی ئەستێرەناسان، ڕووبەری زەوییەکانی لە گەبزە زیادی کردبوو و ڕێژەی داهاتیشمان چووبووە سەرێ. جگە لە دەمەتەقێ لەگەڵ سوڵتان و کات بەسەربردن لە تەکیدا، پێویستی بەهیچ کارێکی تر نەبوو. جاروبار دەچووینە گەبزە بۆ بەسەرکردنەوەی ئاشە تێکشکاوەکان و ئەو گوندانەی کە سەگی زەبەلاحی شوانەکانیان بەر لە هەموو کەسێکی تر بە پیرمانەوە دەهاتن. چاومان بە داهاتەکاندا دەگێڕا و هەوڵمان دەدا لەڕێی بەراوردکردنی تۆمارەکانەوە تێ بگەین چاودێر تا چ ڕادەیەک فێڵی لێمان کردووە. جاربەجار بە پێکەنینەوە و زۆر جاری تریش بە بێزارییەوە لێکۆڵینەوەی بەکەیف و سەفامان بۆ سوڵتان دەنووسی. لەوانە بترازێ، هی چی دیمان نەدەکرد. ئەگەر بەزۆری منیش نەبوایە، لەوانە بوو خۆجە نەیەتەوە سەر ڕێی ئەو جیهانەی کە کاتێکی خۆشمان تێدا بەسەر دەبرد و لە ئاکامیشدا لەگەڵ ژنە بۆنخۆشەکانی ناویدا دەنووستین.

ئەوەی زیاتر کەللەیی کردبوو، هێرش بۆ سەر ئەڵمانیا و دوورگەی کریت بوو، بەجۆرێک ئەستەنبوڵ بێ سوپا و بێ سوڵتان مابووەوە. سوڵتانیش بە ئامۆژگاریی دایکی خۆی نەدەکرد و جارێکی تر هەرچی چەنەباز و لەوچە و مەخسەرە و لاساییکەرەوەکەی لە کۆشک وەدەرنراو هەیە لە دەوری خۆی کۆکردبووەوە. خۆجە خۆی لەو سەختەکارانە، کە بە نەفرەتەوە ڕقی لێیان بوو، دوور دەگرت و سوور بوو لەسەر ئەوەی بۆ پاراستنی بالادەستیی خۆی، نەچێتە ناویانەوە، بەڵام لە ئاکامی پێ داگرتنی سوڵتانەوە، ناچار بووبوو یەک دوو جار لەگەڵیاندا بدوێ و گوێ لەو بابەتانە ڕابگرێ کە ئەوان تاوتوێیان دەکرد. لەو کۆبوونەوانەدا، کە پرسیاری لە جۆری: "ئایا ئاژەڵان ڕۆحیان هەیە، کامیان هەیەتی، کامیان دەچێتە بەهەشت و کامیان دەچێتە دۆزەخ؟ ئایا گوێچەکەماسی مێیە یان نێرە؟ ئایا ئەو ڕۆژەی بەیانیان هەڵدێ، ڕۆژێکی نوێیە یان هەمان ئەو ڕۆژە کۆنەیە کە ئێواران ئاوا دەبێ، لە ڕێگای پشتەوە دەسوڕێتەوە و سەرلەبەیانی لەولاوە هەڵدێتەوە؟"ی تێدا دەخرایە بەرباس، خۆجە ئومێدی بە داهاتوو نەدەما و دەیگوت ئەگەر شتێک نەکەین، ئەوا بەمزووانە سوڵتانمان لە کیس دەچێ.

لەبەرئەوەی بە پرۆژەکانی "ئێمە" و بە داهاتووی "ئێمە" دەهاتە گۆ، بە شادمانییەوە

تێکەڵ بە گفتوگۆکان دەبووم. جارێکیان، بۆ تێگەیشتن لەوەی چی لە مێشکی سوڵتاندایە، هەرچی دەفتەری ئەو چەندە ساڵەی منە و خەون و بیرەوەرییەکانمی بەو ناوەدا پەرش و بڵاو کردەوە. هەروەک چۆن کەسێک بخوازێ کەلوپەلی ڕژاوی کشاوەکانی دۆلابێک بخاتەوە سەریەک، هەوڵمان دا نەخشەی ئەقڵی سوڵتان بکێشین. ئەنجام بەهیچ جۆرێک ئومێدوەر نەبوو: ئەگەرچی خۆجە هێشتا دەیتوانی لەمەڕ ئەو چەکە لە ئەقڵ بەدەرەی چاوەڕێ بووین قوتارمان بکات، یان لە بارەی پێداویستیی هەرچی زووتر چارەسەرکردنی نهێنییەکانی ناو ئەقڵمانەوە بدوێ، بەڵام چی دی بەجۆرێک هەڵسوکەوتی نەدەکرد وەک ئەوەی بێ ئاگا بێ لەو کارەساتەی بەڕێوەیە. چەندین مانگ تا ڕادەی شەویلگە شل بوون لەو بارەیەوە قسەمان کرد.

ئایا وا لە کارەساتەکە گەیشتبووین کە ئیمپراتۆریەت وڵاتەکانی ژێر قەڵەمڕەوی خۆی یەک لەدوای یەک دەدۆڕێنێ؟ نەخشەکانمان بەسەر مێزەکەدا بڵاو دەکردەوە و بە غەمبارییەوە ئەو وڵات و چیا و ڕووبارانەمان دەستنیشان دەکرد کە چاوەڕێمان دەکرد بەر لەوانی تر لە دەستیان بدەین. یاخۆ کارەسات و ڕووخان بەواتەی گۆڕانی مرۆڤ و باوەڕیانە بێ ئەوەی خۆیان هەستی پێ بکەن؟ وامان دەهێنایە بەرچاوی خۆمان بەیانییەک هەر دانیشتوویەکی ئەستەنبوڵ وەک مرۆڤێکی تر لە جێگای گەرمدا لە خەو هۆشیار دەبێتەوە. نازانێ چۆن جلەکانی بپۆشێ و بێ ئاگایە لەوەی منارەی مزگەوت بەکەڵکی چی دێ. لەوانەشە کارەسات بەواتەی بینینی باڵادەستیی ئەوانی تر و هەوڵدان بێ بۆ لاساییکردنەوەیان. ئەوسا داوای لێم دەکرد بڕگەیەک لە ژیانی ڤینیسیام بگێڕمەوە. پاشان، بە خەیاڵ کڵاومان دەکردە سەری هەندێ لە ناسیاوانی ئێرە و پانتۆڵمان لە پێیان دەکرد و بیرەوەرییەکانی منمان پێیان دەژیاندەوە.

وەک دوا چارە بۆ ڕزگاربوون لەم خەیاڵانە، کە لە دانانیاندا کات زۆر بەخێرایی تێ دەپەڕی، بڕیارمان دا بۆ سوڵتانی بەرز بکەینەوە. بەخۆمان دەگوت دیمەنەکانی ئەم کارەساتە، کە سەرجەمیان بە ڕەنگی خەیاڵ نەخشێندرابوون، لەوانەیە سوڵتان بهەژێنێ.

بەوجۆرە و بەدرێژاییی شەوانی کپ و تاریک، کتێبێکمان پڕ کردەوە. کتێبێک کە

خەیاڵاتی ئەو کارەسات و تێکشکانەی لێ دەچۆڕا کە چەندین مانگ بوو بە غەمگینی و بە جۆشێکی بێ ئومێدەوە دەمانهۆنییەوە. لاپەڕەکانی کتێبەکەمان پڕ کرد لە باسی هەژارانی سەردانەواندوو، ڕێگاوبانی قوڕاوی؛ باڵەخانەی نیوەناچڵ؛ کۆڵانی تاریک و سەمەرە؛ نزای ئەوانەی بۆ گەڕانەوەی هەموو شتێک بۆ دۆخی کۆن دەکڕووزانەوە و لە پاڕانەوەکانی خۆیان تێ نەدەگەیشتن؛ دایکانی دەردەدار و باوکانی بەلەنگاز؛ ئەو نامرادانەی تەمەنیان پێ ڕا نەدەگەیشت کار و نووسینی وڵاتانی ترمان بۆ بگوازنەوە؛ ئامێرە لە کارکەوتووەکان؛ ئەو بەساڵاچووانەی کە گریان بۆ ڕۆژانی جوان و بابردوو چاویانی کز کردبوو؛ سەگی کۆڵانەکان کە تەنیا ئێسک و پێستیان پێوە مابوو؛ گوندنشینانی بێ زەویوزار؛ ئەو بێکارانەی بەدەستی خاڵی بە شاردا دەسووڕانەوە؛ موسڵمانی نەخوێندەوار و پانتۆڵ لەپێ و هەموو ئەو شەڕانەی کە بە تێکشکان کۆتاییان هاتووە. بەشێکی تری کتێبەکەمان بە بیرەوەرییە کاڵەوەبووەکانی من پڕ کردەوە: یەک دوو دیمەنی ڕەنگینی پێکهاتوو لە سەردەمی ژیانم لەگەڵ دایک و باوک و خوشک و براکانمدا لە ڤینیسیا و لە چەند ڕووداوێکی شاد و دەرزبەخشی ساڵانی خوێندنم. مەبەستمان بوو لە سوڵتان بگەیەنین ئەوانی تر کە چاوەڕێ دەکرێ بەسەرماندا سەربکەون، بەوشێوەیە دەژین و ئێمەش پێویستە بەر لەوان بکەوینە خۆ و وا و وا بکەین! لە بەشی کۆتاییی کتێبەکەشدا، کە خۆشنووسی چەپەوانەمان نووسیبوویەوە، شیعرێکی سەروادار هەبوو کە دەکرا بە دەروازەیەک بۆ نهێنیی ئەو مەتەڵانەی ناو سەرمان دابندرێ کە خۆجە بەردەوام پێی خۆش بوو وەک دۆڵابێکی پڕ لە کەلوپەل وێنای بکات. هەوای ناسک و تەمومژی ئەم شیعرە، کە دەتوانم بە پڕ لە شکۆ و بێدەنگ ناوی ببەم، بە غەمگینییەوە کۆتاییی بە یەکێک لە باشترینی ئەو کتێب و لێکۆڵینەوانە دەهێنا کە پێکەوە لەگەڵ خۆجەدا دەماننووسی.

پاش مانگێک لە ڕادەستکردنی کتێبەکە بە سوڵتان، خۆجە فەرمانی دەستبەکاربوونی بۆ دروستکردنی چەکە لە ئەقڵ بەدەرەکەی لێ وەرگرت. سەرمان لێ شێوابوو، چەندی کردمان و کۆشاین نەماتوانی بگەینە ئاکامی ئەوەی داخۆ لەو سەرکەوتنەماندا تا چ ڕادەیەک قەرزاری ئەو کتێبە بووین.

9

کاتێک سوڵتان گوتی: "ئا دەی ئەو چەکە لە ئەقڵ بەدەرەی کە دوژمنانمان پەرێشان دەکات، دروست بکە با بیبینین"، ڕەنگە مەبەستی تاقیکردنەوەی خۆجە بووبێ، یان خەونێکی هەبووە و لە خۆجەی شاردبووەوە، یاخۆ مەبەستی بوو نیشانی دایکە دەسەڵاتدارەکەی و شازادەکانی بدات کەوا ئەو زماندرێژانەی لە دەوری کۆبوونەتەوە، بە کەڵکی شتێک دێن. یاخۆ لەوانەیە وای بۆ چووبێ خۆجە دەتوانێ لەدوای پەتاکە پەرجوویەکی تریش بخولێنێ، یان لەوانەیە بەڕاستیش کەوتبێتە ژێر کاریگەریی دیمەنەکانی ئەو کارەساتانەی کە کتێبەکەمان پێ کردبووەوە. ڕەنگە لە کارەساتیش زیاتر، شپرزەی ئەوە بووبێ کە دوای چەند تێکشکانێکی سەربازی، وەک دەترسا، ئەوانەی دەیانەوێ براکەی بهێننە سەر تەخت، ئەم لە تەخت دابگرن. بەدەم بیرکردنەوە و بە سەرسوڕمانەوە پارەوپوولی زۆروزەوەندەی داهاتی ئەو گوند و خان و باخی زەیتوونانەمان دەژمارد، کە سوڵتان لەپێناوی دروستکردنی چەکەکەدا بۆ ئێمە تەرخانی کردبوو.

لە ئاکامدا خۆجە گوتی ئەوە تەنیا واقوڕماویی خۆمانە کە پێویستە سەرمان لێ سوڕ بمێنێ: "ئایا هەموو ئەو چیرۆکانەی سالانێک بوو بۆ سوڵتانی دەگێڕایەوە و گشت ئەو کتێب و لێکۆڵینەوانەی بۆمان نووسیبوو، ناڕاست بوون تا گومان بکەین لەوەی بڕوای پێیان نەکردووە؟" لەوەش زیاتر: سوڵتان کەوتبووە سەر کەڵکەڵەی زانینی شتەکانی ناو تاریکاییی مێشکمان. خۆجە بە جۆشەوە لە منی دەپرسی: "مەگەر ئەمە ئەو سەرکەوتنە نییە کە سالانێکی درێژ بوو چاوەڕێمان دەکرد؟"

وابوو. سەرباری ئەوەش، بگرە بە دابەشکردنی سەرکەوتن لە نێوان هەردووکماندا دەستمان بە کار کرد. منیش، لەبەرئەوەی هێندەی ئەو پەرۆشی ئەنجامی کارەکە نەبووم، شادمان بووم. شەش ساڵی دوای ئەوە کە بۆ پێشخستنی چەکەکە تەرخانمان کرد، ترسناکترین ساڵەکانی ژیانمان بوون. نەک بەهۆی کارکردنمانەوە بە بارووت، بگرە لەبەر هێنانی ئێرەیی دوژمنمانمان بەسەر خۆماندا، چونکە هەمووان ئۆقرەیان لێ برابوو و چاوەڕێی سەرکەتن یان تێکشکانی ئێمەیان دەکرد و خۆشمان بە ترسەوە چاوەڕێی هەمان شتمان دەکرد. لە مەترسیدا بووین.

سەرەتا لەسەر مێز کارمان کرد و بەدەم بە فیرۆدانی کاتەوە زستانێکمان بەڕێ کرد. لێوانلێو بووین لە ورە و زەوق، بەڵام بیرۆکەی چەکەکە و داڵغە لێدان بەوەوە نەبێ کە چۆن لە بەرەنگاربوونەوەی دوژمندا بەکاری دێنین و جگە لەو وردەکارییە نارِوون و بێ ڕەنگانەی کە لە خەیاڵماندا هەبوون، هیچ شتێکی ترمان لە دەستدا نەبوو. دواتر، بڕیارمان دا لە هەوای کراوەدا بە بارووت کار بکەین. کتومت وەک ئەو هەفتانەی کە پێکەوە نمایشی فیشەکمان ئامادە کرد، ئێمە دەچووینە ژێر سێبەری دارە بەرزەکان و پیاوەکانمان ئەو تێکەڵانەیان گڕ دەدا کە ڕەچەتەکانی لە لایەن ئێمەوە ئامادە کرابوو. لەهەر چوار لای ئەستەنبوڵەوە خەڵکی فزوولی دەهاتن بۆ ئەوەی سەیری ئەو دووکەڵە ڕەنگاوڕەنگانە بکەن کە لە ئاکامی گرمەی جۆراوجۆرەوە بە ئاسماندا بەرز دەبووەوە. دواترێ، ئەو چیمەنەی ئێمە تۆپمان لێ لە قاڵب دەگرت و لوولەی درێژ و نیشانەکانمان لێ دانابوو و چادرمان لێ هەڵدابوو، بەهۆی ئاپۆڕەی کەسانی فزوولییەوە بوو بە شوێنی جەژن گێڕان. ڕۆژێکی کۆتاییی هاوین و بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو، سوڵتان خۆیمان لێ پەیدا بوو.

نمایشێکمان بۆی کرد، زەوی و ئاسمانمان لەراندەوە. دانەدانەی ئەو قەوان و گوللانەی کە بۆ تێکەڵەی باش داگیراوی بارووت ئامادەمان کردبوون، تۆپە نوێیەکان و نەخشەی ئەو لوولە درێژانەی هێشتا لە قاڵبمان نەگرتبوون و ڕەشنووسی میکانیزمی خۆبەخۆ تەقاندنمان نیشانی سوڵتان دا. لەوانی دی زیاتر، بایەخی بە من دا. سەرەتا، خۆجە ویستی من لە سوڵتان دوور ڕابگرێ، بەڵام سوڵتان پێی سەیر بووە کە لەگەڵ سەرەتای نمایشەکەدا منیش هێندەی خۆجە فەرمانم داوە و

پیاوەکان ئەوەندەی پرسیان بەو کردووە، هێندەش بە منیان کردووە.

کاتێک دوای پازدە ساڵ بۆ جاری دووەم چوومەوە بەردەم سوڵتان، بەجۆرێک سەیری کرد، وەک ئەوەی پێشتر منی ناسیبێ و ئێستا بۆی نەبرێتەوە سەریەک کە کێم، کتومت وەک کەسێکی چاوبەستراوە کە تامی میوەیەکی کردبێ و هەوڵ بدا بزانێ لە چ جۆرێکە. دامێنی کەواکەیم ماچ کرد. کاتێک زانی بیست ساڵە لێرەم و هێشتا نەبووم بە موسڵمان، هیچ هەڵنەچوو. داڵغەی لە شتێکی تر دابوو: گوتی: "کەواتە بیست ساڵ؟ شتێکی سەیرە!". پاشان ئەو پرسیارەی لێم کرد: "تۆ ئەو شتانە فێری ئەو دەکەی؟" بەڵام ئەم پرسیارەی بۆ زانینی وەڵامی من نەپرسی. لە چادرە شرەکەمان، کە بۆنی باروت و گۆگردی لێ دەهات، چووبووە دەرێ و ڕووەو ئەسپە سپی و جوانەکەی هەنگاوی دەنا. لەناکاو ڕاوەستا، ڕێک لەو کاتەدا ئاوڕی دایەوە بۆ دواوە و ئێمەی بینی کە هاوشانی یەکتر ڕاوەستابووین. وەک ئەوەی یەکێک لە پەرجووە بێ وێنەکانی خوا کە بۆ شکاندنی شکۆی ڕەگەزی مرۆگەل و نیشاندانی توڕەهاتییان دەینوێنێ، یان کورتە بالایەکی بێ کەموکوڕی یاخۆ دوو برای دووانەی کتومت لەیەکچووی بینیبێ، بزەیەک کەوتە سەر لێوی.

شەو بیرم لە سوڵتان کردەوە، بەڵام نەک بەوجۆرەی خۆجە ئارەزووی دەکرد. ئەو هێشتا بە نەفرەتەوە باسی دەکرد، بەڵام من تێ گەیشتبووم ناتوانم ڕقم لێی بێ و بە چاوی سووک تێی بڕوانم. من دڵم چووبووە ئارامی و سالاری و خوێنشیرینی و ئەو ڕەفتارەی وەک منداڵێکی نازدار هەرچی بە خەیاڵدا بهاتایە، دەری دەبڕی. منیش دەمویست وەک ئەو وابم، یان ببم بە دۆستی وی. دوای بڕانەوەی تۆفانی هەڵچوونی خۆجە، لە پێخەوەکەمدا بەدەم هەوڵدانەوە بۆ خەوتن، بیرم دەکردەوە: سوڵتان کەسێک نییە شایەنی ئەوە بێ لە پاشملە باسی بکرێ، دەمویست هەموو شتێکی بۆ بدرکێنم. بەڵام نەمدەزانی ئەو شتانە چین؟

تومەز بایەخ پێدانەکەم یەکسەرە نەبووە. ڕۆژێک خۆجە بە نارەزای دڵ گوتی سبەینێ سوڵتان لەگەڵ ئەو چاوەڕێی هاتنی منیش دەکات. منیش لەتەکیدا ڕۆیشتم. ڕۆژێک بوو لە ڕۆژە جوانەکانی پایزێکی درەنگ کە بۆنی دەریا و قەوزەی لێ دەهات. تەواوی سەرلەبەیانیمان لە باخێکی گەورەدا، کە گەڵای سووری وەریو دای پۆشیبوو

و لە دەوری حەوزێکی گوڵڕەنگی ژێر دارئەرخەوان و چناردا بەسەر برد. سوڵتان ویستی باسی ئەو بۆقانە بکەین کە حەوزەکەیان پڕ کردبوو لە ژیان. خۆجە رووی نەدایێ، ئەوەندە نەبێ یەک دوو قسەی بێ خەیاڵ و بێ ڕەنگی کرد. ئەم ڕەفتارەی خۆجە، کە منی تووشی سەرسوڕمان کرد، بەلای سوڵتانەوە مایەی بایەخ پێدان نەبوو. زیاتر گرینگیی بە من دا.

بەو جۆرە، بە دووردرێژی باسی میکانیزمی بازدانی بۆق و سووڕی خوێنی و دڵی، کە تا ماوەیەکی درێژ دوای دەرهێنانی لە جەستەی، لە لێدان ناکەوێ و ئەو مێش و مەگەزانەم کرد کە بۆق دەیانخوات. بۆ ئەوەی خولی پێگەیشتنی هێلکەیەکی ناو حەوزەکە تا ئەو کاتەی دەبێتە بۆق باشتر ڕوون بکەمەوە، داوای قەڵەم و کاغەزم کرد. لە قوتوویەکی زیوینی بە یاقوت نەخشێنراودا دەستەیەک قەڵەمی قامیش هێندرا. سوڵتان زۆر سەرنجی ئەو نیگارانەی دەدا کە من دەمکێشا. بەخۆشییەوە گوێی بۆ ئەو چیرۆکی بۆقانە ڕاگرت کە لە خەیاڵمدا مابووەوە و بۆم گێڕایەوە. کاتێک نۆرە هاتە سەر چیرۆکی ئەو شازادەیەی کە بۆقێک ماچ دەکات، سوڵتان بۆلاندی و چارەی دا بەیەکدا. هیچیش لەو نەوجەوانە گەمژەیە نەدەچوو، کە بەردەوام خۆجە باسی دەکرد. زیاتر لە پێگەیشتوویەکی ئاوەزیاو دەچوو، کە دەیویست ڕۆژی خۆی بە زانست و هونەر دەست پێ بکات. لە کۆتاییی ئەو چەند ساتە جوانەدا، کە خۆجە بە چارەیەکی گرانەوە بەسەری برد، سوڵتان بەدەم سەیرکردنی نیگاری بۆقەکانەوە، کە بەدەستییەوە گرتبوو، بە منی گوت: "من هەر لە زووەوە گومانم کردبوو کە تۆ چیرۆکەکانی بۆ دەئافرێنی. کەواتە هەر خۆتیش نیگارەکان دەکێشی!" پاشان لە بارەی بۆقی سمێڵدارەوە پرسیاری لێم کرد.

پێوەندیم لەگەڵ سوڵتان ئا بەوجۆرە دەستی پێ کرد. ئیدی هەموو جارێک منیش لەتەک خۆجەدا بۆ کۆشک دەچووم. ڕۆژانی سەرەتا، خۆجە زیاتر بێدەنگ دەبوو و بەزۆری هەر من و سوڵتان قسەمان دەکرد. کاتێک لەگەڵ سوڵتاندا لەبارەی خەون و نیگەرانی و ڕابردوو و داهاتووی دەدواین، بیرم لەوە دەکردەوە ئەم پیاوە قسەخۆش و ئاوەزیاوەی بەرامبەرم بە چ پێوانەیەک بەو سوڵتانە بچوێنم کە ساڵانێک بوو خۆجە بۆ منی باس دەکرد. لە میانەی پرسیارە وەستکارانەکانی و فرت و فێڵە

بچووکەکانیـەوە تێ دەگەیشـتم سـوڵتـان بە پشـتبـەسـتن بەو کتێبـانەی پێشکەشی کـراوە، بەپەرۆش بـوو بزانێ خـۆجـە تا چ ڕادەیەک خـۆجـەیە و تا چ ڕادەیەک منە. منیش تا چ ڕادەیەک منم و تا چ ڕادەیەکیش خۆجەم. خۆجەش لەو کاتەدا سەرقاڵی ئەو تۆپ و لوولە درێژانە بوو کە بۆ لە قاڵب گرتن ئامادەی کردبوون و هیچ گوێی بەم پەرۆشییانەی سوڵتان نەدەدا و بە شتی پڕوپووچی دەزانی.

شـەش مـانگ دوای دەسـتبـەکاربوونمان لە تۆپـەکان، هەواڵ بە خـۆجە گەیشت کە سـەرداری تۆپخـانە، لەبـەرئەوەی لووتمـان لە کـاری ئەو ژەنـدووە، بە قـینـدا چووە و داوای کردووە یان پۆسـتەکـەی لێ وەربگرنەوە، یاخـۆ ئێمـەی شـێت، کە دەمـانەوێ بەبیـانووی داهێنانی شتێکی نوێوە شکۆی تۆپخانە بخـەینە ژێر پێوە، لە ئەسـتەنبوڵ شـار بەدەر بکرێین. ئەم هەڵوێسـتە خـۆجـەی زۆر نیگەران کـرد، بەڵام هیـچیش خۆی مـاندوو نەکرد بۆ دۆزینەوەی ڕێگایەک بـۆ لەیەکگەیشـتن لەگـەڵ سـەرداری تۆپخـانەدا، کە پێ دەچوو ئامادە بێ بۆ ڕێککەوتن. دوای مانگێکیش، کە سوڵتـان دەسـتووری دا بۆ پەرەپێـدانی چەک، کـەڵک لـە ئامـێـری تری جگە لـە تۆپ وەربگرین، خـۆجـە هیچ بەسـەر خۆیدا نەهێنا. ئیدی هەردووکمان دەمـانزانی ئەو تۆپ و لوولانەی کە تازە لە قاڵبـمان گرتبوون، جیـاوازییەکی ئەتۆیان لەگەڵ ئەو کۆنانەدا نەبوو کە چەندین ساڵ بوو بەکار دەهێنران.

بەوجـۆرە و بەبۆچـوونی خـۆجە، پێمـان نابـووە قـۆنـاغێکی نوێ کـە دەبوو هەمـوو شـتێک لە نـووکەوە ڕێک بخـەینەوە و خـەیاڵ بئـافرێنین. بـەڵام من لەبەرئەوەی ئاشنای هەڵچـوون و خـەیاڵەکانـی بووبووم، شـتـی نوێ بـۆ من لەو نێـوەندەدا تەنیـا ناسـینی سـوڵتـان بوو. ئەویش بەناسـینی ئێمـە دڵخـۆش بوو. وەک باوکێکی بەسـەرنج کە دوو برای بەشـەڕهاتوو لەسـەر تێکەڵکردنی گولله شـووشـەکانیـان لەیەک جیا دەکاتەوە و پێـیـان دەڵێ: "ئـەمـە هی تـۆیە و ئەوەش هی تـۆیە"، سـوڵتـانیش چاودێریی قـسـە و هەڵسـوکەوتەکانی ئێمەی دەکرد و لە یەکدیمانی جیا دەکردەوە. ئەم چاودێریکردنە، کە هەندێ جار منداڵانە و جاروبـاریش زیرەکانە دەهاتە بەرچاوم، منی نیگەران کرد. خەریک بووم بڕوا بکەم کەوا کەسایەتیی من بێ ئاگاداریی خۆم، لێم جیابووەتەوە و ئاوێتـەی کـەسـایەتیی خـۆجـە بووە. کـەسـایەتیی خـۆجـەش بەهەمـان شـێـوە لەو

جیابووەتەوە و لەگەڵ کەسایەتیی مندا یەکی گرتووە. سوڵتانیش زۆر بە باشی لەم ئافراندنە خەیاڵییە تێ گەیشتبوو و ئێمەی لە خۆمان باشتر دەناسی.

لە کاتی لێکدانەوەی خەونەکانیدا، یان لە باسکردنی چەکەکەدا، کە تا ئەو کاتە تەنیا لە خەیاڵماندا بوونی هەبوو، سوڵتان لەپڕ ڕادەوەستا، ڕووی لە یەکێکمان دەکرد و دەیگوت: "نەخێر، ئەمە بیرۆکەی تۆ نییە، هی ئەوە." جاروباریش جووڵەمانی لەیەک جیا دەکردەوە: "ئێستا تۆ وەک ئەو دەڕوانی. وەک خۆت بڕوانە!" کاتێکیش من بە سەرسوڕمانەوە بزەیەکم بۆ دەکرد، ئەو دەیگوت: "ئاوا دروستە، ئافەرین. ئەرێ ئێوە هیچ سەیری خۆتان کردووە لە ئاوێنەدا؟" لێمانی دەپرسی داخۆ هەریەکەمان لە بەردەم ئاوێنەدا تا چەندە دەتوانێ خۆی بێ و خۆی ڕابگرێ. جارێکیان دەستووری دا هەموو ئەو لێکۆڵینەوە و کتێبی ئاژەڵان و ساڵنامانە بهێنن کە ساڵانێک بوو بۆمان دەنووسی و بۆمان دەنارد. بەدەم هەڵدانەوە و خوێندنەوەی لاپەڕەکانەوە گوتی: "کوێی کتێبەکان کێ نووسیویەتی و کوێیشی کامتان خۆی خستووەتە شوێنی ئەوی تر و بە خەیاڵی خۆیدا هێناوە؟" بەڵام ئەوەی خۆجەی کەللەییی کرد و منیشی خستە ژێر جادووی خۆیەوە و سەرم لێ سوڕما، ئەو لاساییکەرەوەیە بوو کە سوڵتان لە ئامادەبوونی ئێمەدا بانگی کرد.

ئەو کابرایە نە ڕووی و نە جەستەی بە ئێمە نەدەچوو. بالاکورت و قەڵەو بوو. جلوبەرگیشی جۆرێکی تر بوو، بەڵام کاتێک دەستی بە قسە کرد، من ترسم لێ نیشت: کتومت وەک ئەوەی دەدوێ، ئەو نەبێ، خۆجە بێ. جۆری ئەو، وەک ئەوەی نهێنییەک بە گوێی سوڵتاندا بچرپێنێ، خۆی لێ نزیک دەخستەوە. جۆری ئەو، بە نواندنی ڕەفتارێکی ورد و بەدەم بیرکردنەوەوە دەچووە سەر وردەکارییەکان و تۆنی دەنگی خۆی گران دەکرد. کتومت وەک ئەو دەکەوتە بەر جۆش و خرۆشی وتەکانی خۆی و بۆ قایلکردنی کەسی بەرامبەر تا هەناسەی لێ دەبڕا، بەخێرایی دەست و قۆڵی بەکار دەهێنا. بەڵام کابرا کە لە قسەکردندا تۆنی دەنگی خۆجەی وەرگرتبوو، باسی ئەستێرەکان یان پرۆژەی چەکە لە ئەقڵ بەدەرەکەی نەدەگێڕایەوە، بگرە ناوی خواردنەکانی چێشتخانەی کۆشک و ناوی ئەو کاری و بەهاراتانەی دەهێنا کە بۆ لێنانیان پێویست بوون. سوڵتان پێ دەکەنی، ڕووی خۆجە تاریک داگەڕابوو،

لاساییکەرەوەکەش بە ژماردنی یەک بە یەکی وێستگاکانی نێوان ئەستەنبوڵ و حەڵەب درێژەی بە گێڕانەوەکەی خۆی دا. پاشان سوڵتان داوای لە لاساییکەرەوەکە کرد دەمەلاسکەی من بکاتەوە. ئەو کابرایە کە بە سەرسوڕماوی و بە دەمی داچەقیوەوە سەیری منی دەکرد، هەر کتومت خۆم بووم: بوودەڵەیەکم لێ دەرچووبوو. کاتێک سوڵتان داوای لێ کرد لاسایی کەسێک بکاتەوە کە نیوەی خۆجە بێ و نیوەی من بم، من وەک جادووم لێ کرابێ، وابووم: بەدەم سەیرکردنی جووڵەکانی کابراوە، منیش وەک سوڵتان لە ناخەوە دەمویست بڵێم: "ئەوە منم و ئەویشیان خۆجەیە"، بەڵام لاساییکەرەوەکە بەدەست ئاماژەی بۆمان دەکرد و خۆی ئەو ئەرکەی ڕادەپەڕاند. سوڵتان دوای ئەوەی دەستووری دا و کابرای نارده دەرەوە، فەرمانی دا بە قووڵی بیر لەو شتە بکەینەوە.

ئەرێ ئەم قسەیە چ واتەیەکی دەگەیاند؟ ئێوارە بە خۆجەم گوت سوڵتان زۆر لەو کەسە ژیرترە کە چەندین ساڵە تۆ بۆم باس دەکەی و پێم گوت سوڵتان ئێستا بۆخۆی بەو ئاراستەیەدا دەڕوا کە تۆ دەتویست بیهێنیتە سەری، کەچی ئەو دیسان هەڵچوو و دەمی کەفی کرد. ئەمجارەیان مافم دایێ، چونکە هونەری لاساییکەرەوەکە شتێک نەبوو بەرگەی بگیرێ. خۆجە گوتی لەمەودوا ئەگەر زۆری لێ نەکەن، پێ نانێتە ناو کۆشک و سەرای سوڵتانەوە. ئێستا لە کاتێکدا کە دوای چەندین ساڵ چاوەڕوانیکردن ئەم هەلەی دەست کەوتبوو، چی دی نیازی نەبوو بچێتە ناو ئەو گەمژانە و خۆی پەرێشان بکات. لەبەرئەوەی من خولیاکانی سوڵتانم دەزانی و بە هۆش و ژیریش هێندەی دەمامکدارەکانم لە دەست دەهات، ئیدی پێویست بوو من لە جێی ئەو بۆ کۆشک بچم.

کاتێک بە سوڵتانم گوت خۆجە نەخۆشە، بڕوای پێم نەکرد. گوتی: "با بزانین! با بۆ چەکەکە کار بکات." بەوجۆرە ماوەی ئەو چوار ساڵەی کە خۆجە سەرقاڵی داڕشتنی نەخشەی چەکەکە و جێبەجێکردنی بوو، من دەچوومە کۆشک و سەراکان. ئەویش وەک جارانی من، لەگەڵ خەیاڵەکانی خۆیدا لە ماڵ دەمایەوە.

لەو ماوەی ئەو چوار ساڵەدا فێر بووم ژیان تەنیا برێتی نییە لە چاوەڕوانی، بگرە شتێکە دەتوانرێ چێژی لێ وەربگیرێ. ئەوانەی دەیانبینی سوڵتان هێندەی خۆجە

نرخ و بەهای منیش دەزانێ، منیان بۆ هەمـوو ڕێوڕەسم و ئاهەنگێک بانگ دەکـرد. ڕۆژێک کـچی وەزیر شـووی دەکـرد؛ ڕۆژێکی دی، منداڵێکی تری سـوڵتـان لەدایک دەبوو؛ دواتر کـوڕەکـانیـان سـونەت دەکـرد؛ ڕۆژی دواتر، بەبۆنەی وەرگـرتنەوەی قەڵایەک لە مەجەرستانییەکان ئاهەنگیان دەگێڕا؛ پاشان شازادە دەستی بە خوێندن دەکـرد. هێشـتـا ئەم بۆنانە کـۆتاییی پێ نەدەهات کـە ئاهەنگی ڕەمەزان و جـەژن دەهاتە پێشـەوە. لەو ئاهەنگانەدا، کـە هەندێکیـان چەند ڕۆژێکی دەخـایاند، هێندە گۆشـتی چەور و پڵاوم لووش دابوو و ئەوەندە شـێر و وشـترمرغ و بووکی دەریای لە شـەکر و فسـتق دروسـتکراوم ماشـیبـووەوە، لە ماوەیەکی کـورتدا قـەڵەو بووبووم. زۆربەی ڕۆژگاری خـۆم تا وزەم تێدا دەما، سەیری بەزمی ڕۆژم دەکرد: یەکتر هێنان و بردنی زۆرانبـازانی خۆ چەورکردوو؛ سەمای ئەو تەنافبازانەی کە پەتیان لە نێوان منارەکاندا هەڵدەواسی و بەخـۆیان و دارەکانی دەستـیانەوە بەسـەریدا دەپەڕینەوە، یان بە ددان ناڵی ئەسپیـان دەشکاند و چەقۆ و شـیشـیـان بە ئێرە و ئەوێی خـۆیاندا دەکرد؛ جادووگـەران کە مـار و کۆتر و مەیموونیـان لە جـبەکانیـان دەردەهێنا و لە چاوتروکاندنێکدا پەرداخـەکانی دەستـمـان و پارەکانـی گیرفـانمانیـان نەدەهێشت و گەمەی بووکەشووشـەی قەرەگوێز و هاجیڤات، کە من شەیدای جنێوەکانیان بووم. شـەوانە، ئەگەر نمایشی ئاگربـازی نەبووایە، لەگەڵ دۆستـە نوێکانمدا، کە زۆربەیانم لە هـەمـان ڕۆژدا دەناسی، دەچووینە یەکـێک لەو هەمـوو کـۆشک و سـەرایەی کـە خـەڵکەکـە ڕوویان تـێ دەکـرد. دوای چەندین سـەعـات مـەی و شـەراب خـواردنەوە و گوێگرتن لـە مـوزیک، پیـاڵەم لە پیـاڵە دەدا و لە سـەیرکردنی سـەماکـارانی شـۆخ کـە لاسـاییی ئـاسکی نووسـتـوویان دەکـردەوە و کـوڕانی جـوانپـۆش کـە بـەدەم ڕۆیشـتن بەسـەر ئاوەوە گـەمـەیان دەکـرد و لە گـوێگرتـن لە گـۆرانبـێـژان کـە بە دەنگی پڕ لە بۆکرووزیان، گۆرانیی پڕ لە واتا و نەغمەجاڕیان دەچڕی، چێژم وەردەگرت.

پەیتـا پەیتـاش دەچووم بۆ بارەگـای بـاڵیـۆزان کـە زۆر پـەرۆشـیـان بووم. دوای سـەیرکردنی سـەمـایەکی باڵێ، کە تیـایدا کچـان و کوڕانی شـۆخ بەیەکدا دەهـاتن و دەچوون، یان دوای گـوێگرتن لە نوێتـرین چریکەی تیـپـێکی مـوزیکی لە ڤینیـسـیـاوە هـاتوو، چێژم لە نـاوبانگی خـۆم وەردەگرت، کە تا دەهـات زیاتـر دەنگی دەدایەوە. ئەو

ئەوروپاییيانەی لە باڵیۆزخانەکان کۆدەبوونەوە، پرسیاری ئەو ڕووداوە ترسناکانەیان دەکرد کە بەسەرم هاتبوو. بەپەرۆش بوون بزانن چەند ئازارم چەشتووە و چۆن خۆم ڕاگرتووە و چۆن هێشتا بەرگە دەگرم. من ئەوەم لێیان دەشاردەوە کە هەموو ژیانم لە نێوان چوار دیواردا بەدەم خەوەنووتێکێ و نووسینەوەی کتێبی بێ واتاوە گوزەراندووە. کتومت وەک ئەوەی لەگەڵ سوڵتان دەمکرد، بۆ ئەمانیش کە خوازیاری ئاشنابوون بەم وڵاتە سەیرە بوون، چەندین بەسەرهاتی خەیاڵی و لە ئەقڵ بەدەرەم بۆیان دەگێڕایەوە. نەک بەتەنیا ئەو کچە لاوانەی کە دەهاتن بۆ ئەوەی بەر لە شووکردن باوکانیان ببینن، یان ژنانی باڵیۆزان کە چاوبڕکێیان لەگەڵمدا دەکرد، بگرە هەموو باڵیۆزانی بەشان و شەوکەت و بنووسان بە سەرسامییەوە گوێیان دەگرت بۆ چیرۆکی خوێناویی ئاین و دڕندەیی و فێڵ و تەڵەکەبازیی عەشق و حەرەمسەرا کە هەر هەمووی زادەی خەیاڵی خۆم بوو. ئەگەر هەر زۆریشیان بۆم بهێنایە، یەک دوو نهێنیی دەوڵەتم، کە هەر لەوێدا لە خەیاڵی خۆمدا دەمئافراندن، بە گوێیاندا دەچرپاند و چەند خوویەکی سەیرم دەدایە پاڵ سوڵتان، کە پێشتر کەس پێی نەزانیبێ. ئەو کاتانەی ئەوان داوای زانیاریی زیاتریان دەکرد، من چێژم لەوە دەبینی بەرگێکی نهێنی لە خۆمەوە بئاڵێنم. وەک کەسێک خۆم نیشان دەدا کە ناتوانێ هەموو شتێک بدرکێنێ و قوڕوقوپم دەکرد. خۆم دەخستە دۆخێکی بێدەنگیی ئەوتۆوە، بەجۆرێک هێندەی تر ئەو بوودەڵانەی تووشی ماخۆلان دەکرد کە خۆجە دەیویست بیانکات بە پێشەنگ بۆ ئێمە. بەڵام دەمزانی لە نێوان خۆیاندا بەچرپە باس لە پێوەندیی من بە پرۆژەی نهێنی و گەورەی زانستییەوە و بە بیرۆکەی چەکێکی نادیارەوە، کە پارەوپوڵێکی زۆری تێ دەچێ، دەکەن.

کاتێک ئێواران دوای بینینی ئەو هەموو لەش و لارە جوانە و مەستبوون بە جۆرەکانی خواردنەوە، لە کۆشک و سەراکانەوە بۆ ماڵەوە دەگەڕامەوە، دەمبینی وا خۆجە بەدیار هەمان مێزەوە دانیشتووە کە بیست ساڵی ڕەبەق بوو پێکەوە کارمان لەسەری دەکرد. گوڕێکی ئەوتۆی کاری بەخۆی بەخشیبوو، کە پێشتر لەودا بەدیم نەکردبوو. سەر مێزەکە پڕ بوو لە دەستنووسی ئاڵۆز و بزرکاو و لێکۆڵینەوە و نیگاری سەیری ئەوتۆ، کە من هیچ لە واتایان تێ نەدەگەیشتم. داوای لێم دەکرد ئەو

ڕۆژە چیم کردووە و چیم دیوە، بۆی بگێڕمەوە. دوای کەمێک ڕقی لە هەموو ئەو بەزم و ئاهەنگانە هەڵدەستا و بەکاری بێ ئابڕوو و بێ ئەقڵی دادەنا و قسەی پێم دەبڕی و بەدەم قسەکردن لەمەڕ "ئێمە" و "ئەوانەوە"، دەستی دەکرد بە گێڕانەوەی پرۆژە و نەخشەکانی خۆی.

جارێکی تریش بایدایەوە و دەیگوت هەموو شتەکان پێوەندیی بە ناواخنی مێشکمانەوە هەیە و دەیگوت سەرلەبەری پرۆژەکەی لەسەر ئەو بنەمایە داڕشتووە. لەبەر سەرقاڵیی خۆی، زۆر بە شپرزەیی باسی هاوشێوەی دۆلابێکی پڕ لە وردەواڵە و شتی تێکەڵ و پێکەڵی دەکرد کە بەلای ئێمەوە واتەی ناواخنی مێشکی دەگەیاند. بەڵام شتێک کە بۆ من مایەی حاڵی نەبوون بوو، داخۆ چۆن دەتوانێ ئەو چەکەی کە هەموو ئومێدی خۆی و ئومێدی ئێمەی لەسەر بنیات نراوە، بەرجەستە دەکات! پێم وابوو نە کەسێکی تر و نە خۆیشی، وەک هەندێ جار لە خەیاڵی خۆمدا لێکم دەدایەوە، سەر لەم پرسە دەرناکات. کەچی ئەو دەیگوت ڕۆژێک دێ کەسێک مێشکمان بکاتەوە و هەموو بیرۆکە و خولیاکانی ناویان پشتڕاست بکاتەوە. خۆجە دەیگوت کاتێک لە ڕۆژانی پەتاکەدا بەجووتە دەچووینە بەردەم ئاوێنە، ئەو پەی بە ڕاستییەکی زۆر گەورە بردووە و بیرۆکەی چەکەکەش لەو ڕاستییەوە سەرچاوەی گرتووە! من کەوتبوومە ژێر کاریگەریی وتە پڕ لە جۆشەکانی ئەو، گەرچی نەشمتوانیبوو بەتەواوی لێیان تێ بگەم. دواترێ بە نووکی پەنجە گرژبووەکانی، لەسەر کاغەزەکان بیچمێکی سەیر و ناڕوونی نیشانم دا.

ئەو بیچمە، کە لە هەر نیشاندانێکدا دەمبینی تۆزێک گەشەی کردووە، وەک ئەوە وابوو شتێک بهێنێتەوە بیری من. کاتێک سەیری پەڵەی ڕەشی نیگارەکەم کرد، کە دەتوانم بە "ئیبلیسی" ئاماژەی بۆ بکەم، بۆ ساتێک پێم وابوو دەستبەجێ دەتوانم بڵێم ئەو شتەی دەیبینم لە چی دەچێ، بەڵام وەک ئەوەی جادووم لێ کرابێ، لەپڕ نقەم لە خۆم بڕی، چونکە دەترسام هۆشم بەزمێکم پێ بگێڕێ. بەدرێژاییی ئەو چوار ساڵە بەردەوام ئەو بیچمەم دەبینی، کە ئێستا وردەکارییەکانی بەنێوان کاغەزەکاندا پەرت و بڵاو بووەتەوە، هەرجارەی کەمێک پەرەی دەسەند و لە ئەنجامدا و دوای لووشدانی ڕەنجی مرۆڤ و هەموو ئەو پارانەی بە ساڵان بۆی کرابووەوە، خەریک بوو

بەرجەستە دەبوو. جاری وا هەبوو لەلای خۆمەوە بیچمەکەم بە شتێک دەچوواند کە جاروبار لە ژیانی ڕۆژانەدا، هەندێ جار لە خەونەکانماندا، یاخۆ لە ساڵانی ڕابردوودا، کە بیرەوەرییەکانی خۆمان بۆ یەکتر دەگێڕایەوە، بینیبێتم. یان لە شتێک دەچوو کە پێشتر باسمان کردبێ، بەڵام نەمدەتوانی هیچ هەنگاوێکی تر بنێم بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو شتانەی بە مێشکمدا ڕادەبووردن. سەرم بۆ ناڕوونیی بیرەکانم دانەواند و لە ختوخۆڕایی چاوەڕێ بووم چەکەکە خۆی نهێنیی خۆیم بۆ ئاشکرا بکات. چوار ساڵ دواتر، پەڵە ڕەشەکە، ئەو دیمەنە ترسناکە، ئەو داهێنانە سەیرەی کە هێندەی مزگەوتێک گەورە بوو و هەموو ئەستەنبوڵ باسیان دەکرد، لە کاتێکدا بەبۆچوونی خۆجە چەکێکی ڕاستەقینەی لێ دەرچووبوو، هەرکەس لای خۆیەوە بە شتێکی دەچوواند. منیش لەو وردەکارییانەدا نقوم بووبووم کە خۆجە لە ڕابردوودا لەبارەی سەرکەوتنی چەکەکە لە داهاتوودا بۆ منی باس دەکرد.

ئەو دەمانەی دەچوومە کۆشک، وەک کەسێک هەوڵ بدات خەونێکی بیر بکەوێتەوە کە مێشکی لە کەللەڕەقیی خۆی بخوازێ لە بیری بکات، هەوڵم دەدا هەموو ئەو وردەکارییە بریقەدار و ترسناکانە بۆ سوڵتان دووبارە بکەمەوە و باسی ئەو پێچکە، چەرخ، قوبە، باروت و ئامێری بەرزکردنەوانەی بۆ بکەم کە مەگەر هەر خوا بزانێ خۆجە چەند جار بۆ منی دووبارە کردبووەوە. وشەکان، دەربڕینی من نەبوون، لە قسەکانیشمدا هەست بە گەرمیی وتە ئاگرینەکانی خۆجە نەدەکرا، بەڵام سەرباری ئەوەش دەمبینی کاریگەری بەسەر سوڵتانەوە دادەنێ. گەشانەوەی ئومێدی ئەو پیاوە ئاوەزدارە بە بڕێک قسەی بێسەروبەرە و بەو نەشئەی سەرکەوتن و شیعری ڕزگاربوونەی خۆجە، کە ئەرکی من ئەوە بوو تەنیا بە پێوەنانەوە بۆی بگێڕمەوە، ئومێدی بە منیش دەبەخشی. سوڵتان گوتی ئەو خۆجەیەی لەماڵەوەیە، تۆی. من ئیدی لەم گەمە ژیرانەیەی ئەو، کە هۆشمی بەتەواوی تێک دابوو، ڕاهاتبووم. کاتێک منی دەخستە جێی خۆجە، من پێم وابوو هیچ تێ نەگەم باشترە، چونکە دوای کەمێک دەیگوت تۆ خۆجەت فێری هەموو شتەکان کردووە. دەیگوت ئەم شل و خاوەی ئێستا تۆ نیت، ئەوەی خۆی فێری هەموو شتەکان کردووە، لەمێژە چووەتە پێستی ئەوەوە! من زیاتر پێم خۆش بوو بچینە سەر باسی ئاهەنگەکانی هەمان ڕۆژ، ئاژەڵ،

داوەت و داوەتکاری، یان نمایشی خاوەنکاران کە لەو کاتەدا تەدارەکی بۆ ساز دەدرا. دواتر سوڵتان گوتی: هەموو کەسێک دەزانێ کە تۆ لە پشت پرۆژەی ئەم چەکەوەیت.

ئەوەی هەرە زیاد منی دەترساند، ئا ئەمە بوو. چەندین ساڵ بوو خۆجە لە چاوان ون بووبوو. دەکرێ بگوترێ بەیەکجاری لە بیر کرابوو. ئەوەی لە کۆشک و سەرا و ناو شار و لەتەنیشت سوڵتانەوە دەبیندرا، هەر من بووم. ئیدی وای لێ هاتبوو ئێرەییان پێم دەبرد! نەک بەهۆی ئەوەی داهاتی ئەو هەموو گوند و باخی زەیتوون و خانە بۆ پرژەی چەکێکی نادیار تەرخان کرابوو و هەموو ڕۆژێک قسە و قسەڵۆکی زیاتری لەبارەوە دەکرا، یاخۆ من هێندە لە سوڵتانەوە نزیک بووم، بگرە ئێمە لە ڕێی ئەم چەکەوە لووتمان لە کاری ئەوانی ترەوە دەژەنی و بەهۆی ئەوەشی من گاور بووم، ددانیان لێم چیڕ دەکردەوە. کاتێک چی دی نەمدەتوانی خۆم لە ئاست بوختانەکانیاندا کەڕ بکەم، نیگەرانی و خەمەکانی خۆم هەم بۆ خۆجە و هەم بۆ سوڵتان دەگواستەوە.

بەڵام زۆر گوێیان پێم نەدەدا. خۆجە تا تەوقی سەر نوقمی پرۆژەکەی بووبوو! وەک بەسالاچوویەک کە تاسەی تافی لاوی دەکات، منیش تاسەی هەڵچوونەکەی ئەوم کردبوو. لەو چەند مانگەی دووایدا لەبەرەوە وردەکاریی زیاتری دەخستە سەر پەڵە ڕەش و نادیارەکەی سەر کاغەزەکان و گەشەی پێ دەکرد و وەک من لێی ترسابووم، شتە سەمەرەکە گەیشتە قۆناغی لە قاڵب گرتن و پارەوپوولێکی بێ ئەژماری خەرج کرد و پۆڵای ئەستووری ئەوتۆی لە قاڵب دا کە هیچ گوللەیەکی پێوە نەدەچوو. هیچ گوێشی لەو قسە خراپانە نەدەگرت کە من بۆم دەگێڕایەوە. تەنیا بایەخی بە بارەگای باڵیۆزانی بیانی دەدا کە ئەو شتانەی تێدا دەگوترا و دەیپرسی: "ئەو باڵیۆزانە چۆن مرۆگەلێکن، مێشکیان چۆن کار دەکات، ئایا هیچ بیرۆکەیەکیان لەبارەی ئەم چەکەوە هەیە؟" لە هەمووشی گرینگتر: "بۆچی سوڵتان بە هیچ جۆرێک بیر لەوە ناکاتەوە بۆ نوێنەرایەتیکردنی بەردەوامی دەوڵەت باڵیۆز ڕەوانەی ئەو وڵاتانە بکات؟" هەستم دەکرد خۆی ئارەزووی لەو ئەرکە هەیە و خوازیارە لەدەست گەمژەکانی ئێرە ڕزگاری بێ. بەڵام تەنانەت لەو ڕۆژانەشدا کە لە بەرجەستەکردنی نەخشەکانیدا ئاستەنگی

دەهاتە ڕێی و قاڵبەکانی درزیان تێ دەکەوت، یاخۆ لەبەر ترسی پیا ڕانەگەیشتنی پارە تووشی بێ ئومێدی دەبوو، بە ڕاشکاوی ئەم ئارەزووەی خۆی دەرنەدەبڕی. تەنیا یەک دوو جـار نـەبێ لـە دەمی دەرچـوو و گـوتی دەیەوێ پێـوەندی لـەگـەڵ زانایـانی "ئەوان"دا دابنێ. پێی وابوو لەوانەیە ئەوان لە ڕاستییەکانی ناو مێشکیێ ئێمە بگەن. دەیویست لەگەڵ زانایانی ڤینیسیایی، فلاندەرستانی یان زانایانی هەر وڵاتێکی تر کە لەو ساتەدا بە خەیاڵیدا بهاتبایە، نامە بگۆڕێتەوە. لەبەر خۆیەوە دەیپرسی: "تۆ بڵێی باشترینی ئەوان کێ بێ، لە کوێ دەژین، چۆن نامەیان لەگەڵدا دەگۆڕدرێتەوە؟" لە منی دەپرسی دەکـرێ ئەم پرسـیـارانە ڕووبەڕووی باڵیـۆزەکـان بکەمـەوە؟ لەو ڕۆژانەی کۆتاییدا کە خووم دابووە ئاهەنگ و ڕابواردن و زۆر خۆم لە قەرەی چەکەکە نەدەدا کە لە قۆناغی بەرجەستەبووندا بوو، من ئەو تکایەم لە بیر کرد، ئەو تکایەی کە ڕەشبینیی لێ دەچۆڕا و دوژمنانی شادمان دەکرد.

سوڵتانیش خۆی لە ئاست قسە و قسەڵۆکی دوژمنانمان کەڕ کردبوو. لەو ڕۆژانەدا کە خۆجە لە پیاوی ئازا دەگەڕا بۆ تاقیکردنەوەی چەکەکە بچنە ناو تۆپەڵی پۆڵای ترسناکەوە و لە ناو ژەنگ و بۆنی ئاسنی قوڕگ سوتێندا چەرخەکان هەڵسوڕێنن، من گازندەم لە دەست واتەواتەکان کرد، بەڵام سوڵتان هیچ گوێی بە قسەکانم نەدا. وەک بەردەوام قسەکانی خۆجەی بە من دووبارە کردەوە. متمانەی پێ هەبوو، لە هەموو شتێک ڕازی بوو و هیچ پەشیمان نەبوو لەوەی کە پشتی پێ بەستووە. لەپای هەموو ئەمانەش سوپاسی منی دەکرد. بێگومان لە هەمان سۆنگەوە: چونکە من خۆجەم فێری هەموو شتێک کردووە. ئەویش وەک خۆجە باسی لە ناوەڕۆکی مێشکمان دەکرد. هاوتەریب لەگەڵ ئەو بایەخ پێدانەدا، بابەتێکی تر دەهاتە کایەوە. کتومت چۆن خۆجە سەردەمانێک لە منی دەپرسی، سوڵتانیش پرسیاری ئەوەی دەکرد داخۆ لەوێ، لەو وڵاتانە، لە وڵاتی پێشووی من، خەڵک چۆن دەژین؟

بە کوڵ خەیاڵم بۆی دەگێڕایەوە. بەهۆی پەیتا پەیتا دووبارەکردنەوەیان، ئەمڕۆ بڕوام بە زۆربەی ئەو خەیاڵانە هەیە. بەڵام ئەوەی بۆم نابڕێتەوە سەریەک ئەوەیە داخۆ خەیاڵەکانم ئەو شتانەن کە لە گەنجایەتیمدا بەسەرمدا هاتبوو، یاخۆ ئەو بەسەرهاتە خەیاڵکردانەن کە لە هەر دانیشتنێکم لەبەردەم مێزەکەمدا بۆ نووسینەوەی کتێبەکەم

بە خەیاڵمدا هاتبوو و بە نووکی پێنووسەکەم تۆمارم کردبوو؟ هەندێ جار لە جێدا یەک دوو درۆی شیرینم بۆ دەهات و دەمخستە سەر چیرۆکەکانم. برێک چیرۆکیشم هەبوو کە لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا گەشەم پێیان کردبوو. بەردەوام ئەوەم دووپات دەکردەوە کە خەڵکی ئەوێ کوژەکەی زۆر بە جلوبەرگەکانیانەوە هەیە، چونکە سوڵتان زۆری حەز لەم چیرۆکە دەکرد. چیرۆکی ئەوتۆشم دەگێڕایەوە، کە نەمدەزانی داخۆ ڕووداوەکانی بەشێکن لە بیرەوەرییەکانم، یاخۆ زادەی خەیاڵی خۆمن؟ بەڵام یەک دوو ڕاستیش هەبوو کە بەدرێژایی بیست و پێنج ساڵ فەرامۆشم نەکردبوو: ئەو بابەتانەی کە لە کاتی خواردنی نانی بەیانیان لەژێر دار مازووەکاندا لەگەڵ دایکم و باوکم و خوشک و براکانمدا لە بارەیانەوە دەدواین! سوڵتان کەمترین بایەخی بەو بابەتانە دەدا. جارێک بە منی گوت لە ڕاستیدا هەموو جۆرەکانی ژیان هاوشێوەی یەکترن. نازانم لەبەرچی بوو، بەڵام ئەم قسەیە منی ترساند. دەربڕینێکی ئیبلیسیی ئەوتۆ کەوتە سەر ڕووی سوڵتان، کە پێشتر پێوەم نەبینیبوو. دەمویست واتەی ئەو قسەیەی لێ بپرسم. پاشان بە ترسەوە سەیری ڕوویم کرد و لە ناخەوە دەمویست بڵێم "من منم". پێم وابوو ئەگەر ئەو قسە قۆڕەی پێ بڵێم، ئەوا دەمتوانی گەمەی هەموو ئەو فیتنەبازانەی کە بەمەبەستی کردنی من بە کەسێکی تر خەریکی فێڵ و تەڵەکەبازین و گەمەکانی خۆجە و سوڵتان پوچەڵ بکەمەوە و خۆم وەک خۆم بە ئاسوودەیی درێژە بە ژیان بدەم. کەچی جۆری ئەوانەی لە ترسی ئەوەی نەبادا ئاسوودەییی خۆیان بخەنە مەترسییەوە، خۆیان لە هەموو جۆرە وتەیەکی ناڕوون بەدوور دەگرن، بە ترسەوە بێدەنگ بووم. ئەمە لە بەهاردا بوو، لەو ڕۆژانەی خۆجە لە کاری دروستکردنی چەکەکە بووبووە، بەڵام نەیتوانیبوو پیاوی پێویست بۆ بەگەڕخستنی کۆ بکاتەوە. بەتەواوی سەرمان سوڕما کاتێک دوای ماوەیەکی کورت بیستمان سوڵتان بەخۆی و بە سوپاوە بۆ جەنگ بەرەو پۆڵۆنیا بەڕێ کەوتووە. بۆچی چەکە دوژمن تەفروتوناکەرەکەمانی بۆ جەنگ نەبردبوو؟ بۆچی منی لەگەڵ خۆیدا نەبردبوو، ئایا چی دی متمانەی پێمان نەمابوو؟ ئێمەش وەک هەموو ئەوانەی لە ئەستەنبوڵ مابوونەوە، باوەڕمان وابوو سوڵتان بۆ ڕاو چووبێ نەک بۆ شەڕ. خۆجە خۆشحاڵ بوو بەوەی ساڵێکی تریش کاتی کەوتبووە دەست. منیش هیچ کار و

ڕابواردنێکم بۆ نەمابووەوە. پێکەوە بۆ چەکەکە دەستبەکار بووین.

ڕەنجی زۆرمان کێشا بۆ دۆزینەوەی پیاو بۆ بەکارخستنی چەکەکە، بەڵام کەس خۆی لە قەرەی چوونە ناو ئامێرەکەمان نەدەدا کە زۆر ترسناک خۆی دەنواند و کەس نەیدەزانی چییە. خۆجە دەیگوت پارەیەکی زۆر دەدات. دەلاڵمان خستە ناو شار. پیاوانی خۆمان بەردایە دەوروبەری کارخانەی دروستکردنی کەشتی و تۆپخانە و لە ناو بێکاری ناو چایخانەکان و سەرسەری و سەربەگۆبەندەکاندا بەدوای پیاودا دەگەڕاین. زۆربەی ئەوانەی دەماندۆزینەوە، گەرچی دەسپێک پێیان بە جەرگی خۆیاندا دەنا و دەچوونە ناو ئەو تۆپەڵە ئاسنەوە، پاش ماوەیەک لە گەرمای ئەو مەگەزە سەمەرەیەدا قرچەقرچ دەپیشان و خۆیان لەبەرامبەر سووڕاندنی چەرخەکاندا بۆ ڕانەدەگیرا و هەڵدەهاتن. لە کۆتاییی هاویندا، ئەو کاتەی توانیمان ئامێرەکە بخەینە جووڵە، هەموو ئەو دراوەی بەدرێژاییی ئەو ساڵانە بۆ ئەم کارە پاشەکەوت کرابوو، تەواو بوو. چەکەکەمان، لە نێوان نیگای پڕ لە ترسی کەسانی بەپەرۆش و گاڵەگاڵی سەرکەوتندا، لەسەرخۆ جووڵاند. بە لارەلار چەند تۆپێکی نا بە قەلایەکی خەیاڵییەوە و دوای ئەوە لە جووڵە کەوت. هاتنی پارە لە گوند و لە باخەکانی زەیتوونەوە درێژەی هەبوو، بەڵام خۆجە بەبیانووی ئەوەی خەرجییان زۆر دەبێ، بڵاوەی بەو دەستە پیاوانە کرد کە پاش ماندووبوونێکی زۆر پێکەوەمان نابوون.

زستان بەدەم چاوەڕێکردنەوە بەسەرچوو. سوڵتان دوای گەڕانەوەی لە شەڕ، لە ئەدرنە، کە شوێنێکی زۆر شیرین بوو لەبەر دڵی، بارەگای خست. تاک و تەنیا بووین، کەس نەبوو لەدوومان بگەڕێ و هەواڵمان بپرسێ. بێ کار و بێ دەسەڵات بووین، چونکە کەسێک نەبوو بەیانیان بچینە کۆشکەکەی و بە گێڕانەوەی چیرۆک و بەسەرهات شادی بخەینە دڵی و کەسێک نەبوو من شەوانە لە کۆشک و سەراکانیدا ڕابوێرم. من هەوڵم دەدا کاتی خۆم بە وەرگرتنی دەرزی عوود و بە کێشانی نیگارێکی خۆم لە لایەن نیگارکێشێکی لە ڤینیسیاوەهاتوو بەسەر ببەم. خۆجە ناوبەناو دەچوو بۆ قوولەدیبی بۆ بینینی چەکەکە کە لەوێ پاسەوانێکی بەدیاریەوە دانابوو. ئەوەش نەبێ بڵێی شتێکی بۆ ئێرە و ئەوێی چەکەکە زیاد نەکردبێ، بەڵام

بەزوویی لەوەش بێزار بوو. لە شەوانی دوایین زستانی هاوبەشماندا باسی چەکەکە و ئەرکەکانی بۆم نەکرد. جۆرێک لە مەلوولی باڵی بەسەردا کێشابوو، نەک لەبەرئەوەی خولیا و سەودای خۆی لە دەست دابوو، نەخێر، بگرە لەبەرئەوەی من نەمتوانیبوو جۆشی ئەو بورووژێنم.

شـــەوانە زۆربەی کـــاتمان بەدەم چاوەڕێکردنەوە بەســـەر دەبرد، چاوەڕێی خامۆشبوونەوەی با یان بڕانەوەی بەفرمان دەکرد. چاوەڕێی دوایین هاتنی بۆزافرۆش و کوژانەوەی ئاگری ناو سۆپاکە و بە خەڵووزبوونیمان دەکرد. چاوەڕێی کوژانەوەی دوایین فانۆسی پرتەپرتکەری بەری ئەوبەری کەنداوی زێڕین و هاتنی خەوی زڕاومان و بانگی بەیانیمان دەکرد. لە یەکێک لە شەوانی ئەو زستانەدا کە بەدەگمەن تیایدا دەدواین و بەزۆری داڵغەمان لێ دەدا، خۆجە لەپڕ بە منی گوت کە زۆر گۆڕاوم و ئیدی بووم بە کەسێکی تەواو جیاواز. ئاگر لە جەستەم بەربوو، پشتم ئارەقەی دەردا. ویستم وەڵامی بدەمەوە و پێی بڵێم ناهەقی و من وەک جاران وام و بەیەک دەچین. خوازیار بووم پێی بڵێم پێویستە وەک لە ڕابردوودا دەیکرد، ئێستاش بایەخم پێ بدا و شتی زۆرمان هەیە قسەی لە بارەوە بکەین، بەڵام ئەو ڕاستی دەکرد. چاوم لە نیگارەکەی خۆم بڕیبوو کە بەیانیی ئەو ڕۆژە لای نیگارکێشەکە هێنابوومەوە و بە دیواری ژوورەکـــەدا هەڵم واســـیـبـــوو: گـۆڕابـووم، لە ئاکـامی خـــواردنی زۆری میوانداریییەوە قەڵەو بووبووم، غەبغەبەم شۆڕ بووبووەوە و ماسولکەکانم سست و جووڵەم گران بووبوو. لە هەمووشی خراپتر، ڕووم بەیەکجاری گۆڕابوو. بەهۆی خواردنەوە و ماچی زۆرەوە لە بانگهێشتکردنەکاندا، جۆرێک لە بێ ئابڕوویی لە قەراغی لێوم نیشتبوو. چاوەکانم لەبەر بێخەوییان مۆر هەڵگەڕابوون. جۆری ئەو گەمژە ڕازییانەی لە ژیان و دنیا و خۆیان، جۆرێک لە ئاسوودەیی لە نیگامدا بەدی دەکرا، بەڵام دەمزانی کە لە دۆخی نوێی خۆم ڕازیم: بێدەنگ بووم.

دواتر، تا ئەو کاتەی زانیمان کە سوڵتان ئێمەی بە چەکەکەوە بۆ شەڕ بۆ ئەدرنە بانگ کردووە، من هەمان خەونم دەبینی: لە ڤینیسیا لە ئاهەنگێکی دەمامکداراندا بووین کە ئاهەنگە تێکەڵ و پێکەڵەکانی ئەستەمبوڵ دەهێنایەوە بیری مرۆڤ. کاتێک ژنان دەمامکی "ژنە دۆست"یان لە ڕووی خۆیان دادەگرت، دایکم و دەزگیرانەکەم لە

ناو ئـاپۆڕەکـەدا دەبینی و ئومـێـدەوار دەبووم. منیش، بۆ ئەوەی ئیـدی بمناسـنەوە، دەمـامکەکـەی خـۆم لا دەبرد، بـەڵام ئەوان تێ نـەدەگـەیشتن لـەوەی کـە من منم. بە دەمامکەکانی دەستیان، کە لە لاستیکەکانیـەوە بە دەستیـانەوە گرتبوو، کەسێکی تریان لە پشتمـەوە نیشانم دەدا . کاتێک ئاوڕم دەدایەوە، دەمبینی ئەو کەسە خۆجەیە و ئەویش دەزانێ من کێم. ئەو پیاوەی کە خۆجە بوو و من بەمەبەستی ناسینەوەم بە ئومێدەوە لێی نزیک دەکەوتمەوە، بێ ئەوەی شتێکم پێ بڵێ، دەمامکەکەی دادەگرت و لە ژێریدا ڕووی گەنجایەتیم، کە منی بە هەستی خۆ بەتاوانبار زانین دەترساند و لە خەومی ڕادەچڵەکاند، دەردەکەوت.

# 10

سـەرەتای هـاوین، هەر ئەوەندەی زانیـمـان سـولّتـان لە ئەدرنە چاوەڕێی خـۆمـان و چەکەکە دەکات، خۆجە کەوتە خۆ. من ئەو کاتە زانیم هەمـوو شتێکی ئامادە کردووە و بەدرێژاییی زستانیش لەگەڵ دەستەی چەکەکەدا، کە پێشتر بڵاوەی پێیان کردبوو، هەر لە پێوەندیدا بـووە. دوای سێ ڕۆژ بۆ گەشت ئامادە بووین. خۆجە، وەک ئەوەی بۆ خـانوویەکی تر بگوازینەوە، شـەوی بەر لە دوایـن ڕۆژی پێش گـەشـتـەکـەی بەدەم گەڕان و هەڵدانـەوەی کتێبـە کۆن و بەرگ دڕاوەکان و لێکۆڵینەوە نیوەناچڵـەکان و ڕەشنـووسـە زەردهـەڵگەڕاوەکـان و کـەلوپەلی نـاو مـاڵـەکـەوە بەسـەر برد. زەنگی ژەنگرتووی سەعاتی نوێژەکەی خستەوە کار، تۆزی سەر ئامێرەکانی گەردووونناسیی پاک کردەوە. تا دەمەوبەیانی خۆی لە ناو کتێب و پرۆژەی ئەو ئامێرانەی ئامادەمان کردبوون و ڕەشنووسەکانی ئامادەکراوی بیست و پێنج ساڵی ڕابردوومـاندا بـەسەر برد. لەگـەڵ هەڵهـاتنی تیـشکی ڕۆژدا بینیم وا خـەریکی هەڵدانەوەی لاپەڕە دڕاو و زەردهەڵگەڕاوەکانـی ئەو دەفـتـەرەیە کە مـن تێـبـینـیـەکـانی تـاقیـکردنەوەی یەکـەم نمایشی فیشـەکبازیی خۆمانم تێدا تۆمار کردبوو. بە دوودڵییەوە لێمی پرسی: ئایا پێویست دەکات ئەمـانە لەگەڵ خـۆمـاندا ببـەین؟ کاتێک بینی بێدەنگ ڕاوەستـاوم و سـەیری دەکەم، هەڵچوو و دەفتەرەکەی دەستی فڕێدایە سوچێکەوە.

بەڵام سـەربـاری ئەوەش لە گەشـتـەکـەمـان بۆ ئەدرنە، کە دە ڕۆژی خـایاند، گەرچی بەڕادەی ســاڵانـی ڕابردووش نـەبووبێ، زۆر لـە یەکــەوە نـزیک بووین. بەر لـەهـەمــوو شتێک خـۆجە بەئومێد بوو. چەکەکەمان، کە بەدەم جیڕەجیڕ و تەقوتۆقـەوە لەسـەرخۆ

کەوتبووە ڕێ و بە سەمەرە، مەگەز، ئیبلیس، کیسەڵی قەڵغاندار، هەستاری پێدار، ئاسنی ڕەش، زەبەلاح، مەنجەڵی تایەدار، دێو، چاو لە ناو سەر، دڕندە، بەراز سیفەت، کوڕی ڕەش و سەمەرەی ڕوو لە ئاسمان ناودەبرا، بەو ئەندازەیەی خۆجە دەیویست، تەماشاکەرانی تووشی سەرسوڕمان کردبوو و لەوەش خێراتر دەچووە پێش، کە پێشبینی دەکرا. خۆجە شاگەشکە دەبوو بەبینینی فزولییەکانی گوندەکانی دەوروبەر کە لەمبەر و ئەوبەری ڕێگا ڕادەوەستان و بە جۆشەوە سەیری ئامێرەکەیان دەکرد و لە ترسان نەیاندەوێرا دەستی لێ بدەن. شەوانە، دوای ئەوەی پیاوەکانمان دوای ڕۆژێکی شەکەت و وزە پڕووکێن لە چادرەکاندا خەوێکی قورس دەیبردنەوە، لە تاریکاییی شەودا کە جاروبار زیکەی مێش و مەگەز دەیشڵەقاند، خۆجە باسی ئەو کارەساتەی دەکرد کە زەبەلاحەکەمان بەسەر دوژمنانیدا دێنێ. ئەگەرچی هەمان جۆشی جارانی نەمابوو و وەک ئەوەی بزانێ دەوروبەری سوڵتان و سوپا کاردانەوەیان لەبەرامبەر چەکەکە چۆن دەبێ و لە سیستەمی هێرشی سوپادا چ شوێنێکی بۆ دیاری دەکرێ، بەڵام هێشتا دەیتوانی بە ئاسوودەیی و بەوپەڕی متمانە بەخۆبوونەوە باس لە "دواین هەل" و گۆڕینی ڕەوتی ڕووبار بەو ئاراستەیەدا کە خۆمان دەمانەوێ، بکات. لە هەمووشی گرینگتر، دەیتوانی بەهەمان جۆشی جارانەوە باس لە "ئەوان و ئێمە" بکات.

چەکەکە بە نمایشێک چووە ئەدرنەوە، کە سوڵتان و چەند چاپلوسێکی بێکەڵکی دەوروبەری نەبێ، کەسی تر بەڕووی خۆشەوە پێشوازیی لێ نەکرد. سوڵتان جۆری ئەوەی پێشوازی لە دۆستێکی دێرینی بکات، بەخێرهاتنی خۆجەی کرد. باسی لە ئەگەری شەڕێک دەکرد، بەڵام زۆر هەست بە خۆسازدان و پەشۆکان نەدەکرا. ئیدی دەستیان کرد بە بەسەربردنی ڕۆژ پێکەوە. منیش تێکەڵ بە ئەوان دەبووم. کاتێک سواری ئەسپەکانیان دەبوون و بۆ بیستنی جریوەی مەل ڕوویان لە ناو دارستانە تاریکەکان دەکرد؛ لەهەردوو ئاوی تونجا و مەریچ سواری بەلەم دەبوون و سەیری بۆقیان دەکرد؛ ئەو لەقلەقانەیان دەلاواندەوە کە دوای شەڕ لەگەڵ داڵەکاندا بە برینداری دەکەوتنە باخچەی مزگەوتی سەلیمییەوە و کاتێک دەچوون بۆ پشکنینی چەکەکە بەمەبەستی سەرلەنوێ بینینی لایەنە باشەکانی، من بەردەوام لەتەکیاندا

بووم. بەڵام بە ئازارەوە هەستم پێ دەکرد کە ناتوانم لە گفتوگۆکانیاندا بەشداری بکەم و هیچ شتێکم نەبوو لە ناخەوە بۆیان باس بکەم بۆ ئەوەی ئەوانیش بە بایەخەوە گوێم لێ بگرن. لەوانەیە ئێرەییم بە نزیکیی نێوانیان بردبێ. بەڵام دەمزانی ئیدی توانای بەرگە گرتنم نەماوە. خۆجە هێشتا هەمان شیعری دەخوێندەوە: باسی سەرکەوتن، باڵادەستیی ئەوانی تر، پێویستیی خۆڕاپسکاندن و هەڵمەت بردن، داهاتوو و شتەکانی ناو مێشکمانی دەکرد و ئیدی من سەرم سوڕمابوو لە فریوخواردنی سوڵتان بەو چیرۆکە خەیاڵکردانە.

لە ناوەڕاستی هاوین و لەو کاتەی بەچڕی باس لە شەڕ دەکرا، ڕۆژێک خۆجە گوتی کەوا پێویستی بە کەسێکی بەهێز و بازووداره و منی لەگەڵ خۆیدا برد. بەپەلە و هەنگاوی خێرا بەناو ئەدرنەدا ڕۆیشتین. بەنێوان گەڕەکی قەرەج و جووەکان و چەند کۆڵانێکی ڕەنگ خۆڵەمێشیدا، کە پێشتر لەتاو بێزاریی خۆم سەرم پێیاندا کردبوو و بەناو خانووی لەیەکچووی موسڵمانە هەژارەکاندا تێ پەڕین. کاتێک هەستم کرد خانووە بە لاولاو داپۆشراوەکانی لای چەپم کەوتوونەتە لای ڕاستەوە، تێ گەیشتم کە لە هەمان گەڕەکدا دەخولێینەوە. پرسیم و ئەویش لە وەڵامدا گووتی: "ئێمە واین لە گەڕەکی فیلدامی". خۆجە لەپڕ لە دەرگای ماڵێکی دا. منداڵێکی چاوسەوزی دەوروبەری هەشتساڵان دەرگای کردەوە. خۆجە پێی گوت: "شێر، شێر.. چەند شێرێک لە کۆشکی سوڵتان هەڵهاتوون. ئێمە بۆیان دەگەڕێین." پاڵێکی بە منداڵەکەوە نا و چووە ژوورەوە، منیش دوای کەوتم. ژوورەوەی ماڵەکە بۆنی تۆز و تەختە و سابوونی لێ دەهات. بەپەلە بەسەر نەردەوانێکی نیوەتاریک و داڕزاودا سەرکەوتینە سەرەوە و گەیشتینە داڵانێک. خۆجە دەستی کرد بەکردنەوەی ئەو دەرگایانەی دەهاتنە پێشی. لە ژووری یەکەمدا پیاوێکی بەساڵاچووی پەرێشان دەمی بێ ددانی خۆی داچەقاندبوو و نووستبوو. دوو منداڵی دەم بەخەندە کە بەمەبەستی پرسینی شتێک ڕیشی کابرایان ڕادەکێشا، بە بینینی کردنەوەی دەرگاکە ترسان. خۆجە ئەو دەرگایەی داخست و یەکێکی تری کردەوە. لە ژوورەکەدا کۆمەڵێک لێفە و قوماشی لێفە هەبوو. ئەو منداڵەی دەرگای حەوشی لێمان کردبووەوە، پێش دەرگای سێهەمی گرت و گوتی: "ئێرە شێری لێ نییە، دایکم و پوورمی لێیە." بەڵام خۆجە

گوێی بەقسەی منداڵەکە نەدا و پاڵێکی بە دەرگاکەوە نا. دوو ژن پشتیان لە ئێمە کردبوو و لەبەر تیشکێکی لاوازدا نوێژیان دەکرد. لە ژووری چوارەمدا کابرایەک هەبوو خەریکی لێفە دوورین بوو. بەهۆی ئەوەی بێ ڕیش بوو، زۆر بە من دەچوو. کاتێک خۆجەی بینی، هەستایە سەرپێ و گوتی: "بۆچی هاتی ئەی سەرشێتی سەرگەردان، چیت لێمان گەرەکە؟" خۆجە گوتی: "سەمرا لە کوێیە؟" کابرا گوتی: "دە ساڵ لەمەوبەر چووە ئەستەنبوڵ. بە پەتاکە مرد. ئەی تۆ بۆ نەتتوانی بتۆپی؟" خۆجە، بێ ئەوەی وشەی لەدەم بێتە دەر، لە نەردەوانەکان هاتە خوارێ و لە ماڵەکە چووە دەرێ. لەو دەمەیدا دوای ئەو کەوتبووم، لە دوامەوە گوێم لە هاواری منداڵێک و دەنگی ژنێک بوو کە وەڵامی دایەوە: "دایە، شێر هاتووە!" "نەخێر، ئەوە مات و براکەی بوون!"

سەرلەبەیانییەکی زووی دوای دوو هەفتە چوومەوە هەمان جێگا. ڕەنگە لەبەرئەوە بووبێ کە چەندی کردم و کۆشام ڕووداوەکەم بۆ لە بیر نەکرا، یاخۆ لەبەرئەوەی کە خۆم بۆ ژیانی نوێ و بۆ ئەو کتێبە ئامادە دەکرد کە ئێستا ئێوە بەدان بەخۆداگرتنەوە دەیخوێننەوە. بەهۆی ئەوەی ڕووناکی سەری لێم شێواند، دەسپێک کۆڵان و ماڵەکەم بۆ نەدۆزرایەوە، کاتێکیش دۆزیمەوە، ویستم قەدبرێکی بۆ بکەم و سەرێک لە تیمارخانەی مزگەوتی بایەزید بدەم کە پێشتر ئاراستەکەیم دەستنیشان کردبوو. پێ دەچێ بۆچوونەکەم هەڵە بووبێ، چونکە سەرەتا ڕێگەی کورتی ژێر سێبەری سپیندارەکانم بۆ نەدۆزرایەوە، ئەو ڕێگایەی کە دەگاتەوە پردەکە و کاتی خۆی خۆجە و ئەوان پیایدا ڕۆیشتوون. کاتێکیش دۆزیمەوە، لە قەراغ ڕێگای ژێر سێبەری سپیندارەکاندا ڕووبارێک نەبوو مرۆڤ لە کەناری دابنیشێ و بەدەم سەیریکردنی ئاوەکەیەوە حەلوا بخوات. لە تیمارخانەکەش هیچ کامێک لەو شتانەم بەدی نەکرد کە پێشتر لە بارەیانەوە دوابووین. قوڕاوی نەبوو، پاک و خاوێن بوو، بەڵام نە دەنگی ئاو دەبسیترا و نە شووشەی ڕەنگاوڕەنگ دەبیندرا. کاتێک نەخۆشێکی بە زنجیر شەتەکدراوم بینی، خۆم پێ ڕانەگیرا و پرسیارم لە پزیشکەکە کرد. لە وەڵامدا گوتی: "عاشق بووە، شێت بووە، جۆری هەر شتێکی دی، خۆی لێ بووە بە کەسێکی تر." ویستی زیاتری لەسەر بڕوات، من گوێم ڕانەگرت و دوور کەوتمەوە.

بڕیاری شەڕ کە پێمان وابوو چی دی ڕاناگەیەنرێ، بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو لە ڕۆژێکی کۆتاییی هاویندا ڕاگەیەنرا. پۆلۆنەکان لە توانایاندا نەمابوو خۆیان لەبەرامبەر تێکشکانی ساڵی ڕابردوو و ئەو هەموو باجەی کەوتبووە سەریان، ڕابگرن. بۆیە هەواڵیان ناردبوو و گوتبوویان: "وەرن بە نووکی شمشێر باج و سەرانەی خۆتان وەربگرن." ڕۆژانی دواتر خۆجە لە تووڕەییدا سوور هەڵگەڕابوو. لە کاتێکدا تەدارەک بۆ ڕەوتی سوپا ساز دەکرا، کەس بیری لە جێگایەک بۆ چەکەکە نەدەکردەوە. کەس نەیدەویست لە کاتی شەڕ ئەم تۆپەڵە ئاسنە ڕەشە لە تەنیشت خۆیەوە ببینێ. کەسیش چاوەڕێ نەبوو هیچ ماریفەتێک لەم قازانە زەبەلاحە بوەشێتەوە. لە هەمووشی خراپتر: بە مایەی شوومی و نەگبەتییان دەزانی! کاتێک خۆجە ڕۆژێک بەر لە بەڕێکەوتنی سوپا پێشبینیی خۆی لە بارەی شەڕەوە بەیان کردبوو، نەیارەکانمان بە ئاشکرا گوتبوویان ئەم چەکە هێندەی مسۆگەرکردنی سەرکەوتن، نەفرەتیشی بەدواوەیە. واشی بۆ دەچوون زیاتر لە خۆجە، من لە پشت ئەو نەفرەتەوە بم و کاتێکیش خۆجە ئەم شتانەی گێڕایەوە، من ترسم لێ نیشت. سوڵتان ڕای گەیاندبوو کە متمانەی بە خۆجە و بە چەکەکە هەیە و بۆ ئەوەی پێش لە دروستبوونی دەمەقاڵێ بگرێ، گوتبووی لە کاتی شەڕدا چەکەکە سەر بە خۆی و بە هێزەکانی ژێر دەستی خۆی دەبێ. سەرەتای مانگی ئەیلوول، ڕۆژێکی گەرم لە ئەدرنە دەرچووین. هەمووان پێیان وابوو کات درەنگە بۆ بەڕێکەوتن بەرەو شەڕ، بەڵام زۆر قسە لەو بارەیەوە نەدەکرا: لە سەروبەندی دەرچوونماندا من تازە تێ دەگەیشتم سەربازەکان هێندەی لە دوژمن دەترسن، بگرە هەندێ جار زیاتریش، لە نەگبەتی دەترسن و بەدەم ترس لە نەگبەتییەوە شەڕ دەکەن. ڕۆژی یەکەم لە پێشوەچوونمان بەرەو باکور، بە چەندین گوندی خاوێن و دەوڵەمەنددا تێ پەڕین و بەسەر پردگەلێکدا پەڕینەوە، کە چەکەکەمان زەویی ژێریانی خستبووە لەرە. شەوەکەی، سەرمان سوڕما لەوەی کە لە چادری سوڵتانەوە بەدوامانـدا نێردرا. سوڵتانیش وەک سەربازەکانی، منداڵ بووبووەوە. ماخۆلان و جۆشی منداڵێکی تێدا بەدی دەکرا کە دەیویست دەست بە گەمەیەکی نوێ بکات. کتومت وەک سەربازەکانی بەدرێژاییی ڕۆژ داوای لە خۆجە کرد واتای ڕووداو و پێشهاتەکانی بۆ لێک بداتەوە: "هەوری

سووری بەردەم ڕۆژ بەر لە ئاوابوونی، بازە نزم فڕەکان، دووکەڵکێشی شکاوی ماڵی گوندێک و لەقلەقی سەرهەڵگرتوو بەرەو باشوور واتەی چی دەگەیەنن؟" بێگومان خۆجە واتەی هەموو پرسیارەکانی سوڵتانی بە ئەرێنی لێک دەدایەوە.

بەڵام کارمان کۆتاییی پێ نەهاتبوو. ئێمە هەردووکمان تازە بۆمان دەرکەوتبوو سوڵتان لە شەوانی دەرچوون بەرەو جەنگدا ئالوودەی بیستنی چیرۆکی ترسناک و پڕ لە پەرۆشە. خۆجە بەپشتبەستن بە شیعری ناو کتێبێکمان، کە ساڵانێک لەمەوبەر پێشکەش بە سوڵتانمان کردبوو و من لە هەموو کتێبەکانی تر زیاتر خۆشم دەویست، وێنەی دیمەنێکی تاریکی کێشا: دیمەنێکی دزێوی لێوانلێو لە کەسانی کوژراو، تێکشکانی خوێناوی، ناپاکی و پەرێشانی، بەڵام هێشتی تیشکی سەرکەوتن لە گۆشەیەکدا، کە نیگای پڕ لە ترسی سوڵتان بتوانێ بیبینێ، بدرەوشێتەوە. بۆ ئەوەی بیورووژێنین، دەبوو ئەقڵمان بخەینە کار و پێویست بوو بە زووترین کات هۆشیار بینەوە و دوای تێگەیشتن لە "ئەوانەی ئەوان و ئەوانەی ئێمە"، لە ئاستی زانینی ناواخنی مێشکمان و هەموو ئەو شتانەی تردا بین کە چەندین ساڵ بوو خۆجە بۆ منی دەگێڕایەوە و ئیدی من وام لێ هاتبوو دەمویست لە بیریان بکەم! ئەو بەسەرهاتە بێتامەی کە من ئەوەندەم بیستبوو لێی بێزار بووبووم، ڕەنگە وای بۆ چووبێ ئیدی سوڵتان پێی ڕاهاتووە و لەبەرئەوە هەموو شەوێک شتێکی تری بۆ تاریکی و دزێوی و سامناکییەکەی زیاد دەکرد. کەچی کاتێک باس دەهاتە سەر شتەکانی ناو مێشکمان، هەستم دەکرد سوڵتان بە زەوقەوە چێژ لە ترسان وەردەگرێ.

لە هەفتەی یەکەمی کشانی سوپادا، دەرچوون بۆ ڕاو دەستی پێ کرد. دەستەیەک کە تەنیا بۆ ئەو کارە لەگەڵ سوپا هاتبوون، لە پێشەوە دەڕۆیشتن. دوای پشکنینی ناوچەکە و هەڵبژاردنی شوێنی لەبار و وەگەڕخستنی گوندنشینان، سوڵتان و ئێمە و ڕاوچییەکان خۆمان لە ڕەوتی ڕیزەکانی سوپا دادەبڕی و ڕوومان لە بێشەڵانێکی بەناوبانگ بە ئاسک، قەدپاڵێکی دەوڵەمەند بە بەرازی کێوی، یان لە دارستانێکی پڕ لە ڕێوی و کەروێشک دەکرد. دوای گەشتە بچووک و پڕ لە کەیف و سەفاکانی ڕاو کە هەرجارە چەندین سەعاتی دەخایاند، وەک ئەوەی بە سەرکەوتوویی لە شەڕ

بگەڕێینەوە، بە تەنتەنەوە دەگەڕاینەوە ناو ڕیزی سەربازەکان. سوپا پێشوازیی لە سوڵتان دەکرد و ئێمەش ڕاستەوخۆ لە دواوەیەوە بووین. خۆجە بە هەڵچوون و نەفرەتەوە پێشوازیی لەم ڕێوڕەسمانە دەکرد، بەڵام من زۆرم حەز لێ بوو. ئێواران زیاتر پێم خۆش بوو پێکەوە لەگەڵ سوڵتان، لەبری ڕەوتی سوپا و دۆخی ئەو گوند و ناوچانەی سوپای پێدا تێ دەپەڕی، یاخۆ دوایین هەواڵەکانی گەیشتوو لە دوژمنەوە، باسی ڕاومان بکردایە. خۆجە ئەم چەنەبازییەی ئێمەی بە گەمژەیی و بوودەڵەیی دەزانی، لەبەرئەوە ڕقی لێمان هەستا و دەستی کرد بە گێڕانەوەی بەسەرهات و فاڵگرتنەوە و هەر شەوەش مشتێکی دەخستە سەر خەرمانی توندوتیژیی ئەو بەسەرهاتانەی دەیگێڕانەوە. منیش خەریک بووم وەک ئەوانەی دەوروبەر لەو چیرۆک و پەندانە زویر دەبووم کە پێوەندییان بە ناواخنی مێشکی خۆمانەوە هەبوو و خۆجە بەمەبەستی ترساندنی سوڵتان دەیگێڕانەوە.

بەڵام دەبوو لەوەش خراپتر ببینم! دیسان بۆ ڕاو دەرچووبووین. نزیکەی دە گوند چۆڵ کرابوون و خەڵکەکە بەناو دارستانەکەدا بڵاوەیان لێ کردبوو. لە تەنەکەیان دەدا و دەیانویست بە هەرا و قاووقیژ ڕووی بەراز و مامزەکان لەو گۆشەیە بکەن کە ئێمە بە ئەسپ و چەکەکانماوە لێی ڕاوەستابووین و چاوەڕێمان دەکرد، بەڵام تا نیوەڕۆ تووشمان بە تووشی هیچ ئاژەڵێکەوە نەبوو. بەمەبەستی ڕەواندنەوەی بێزاریمان، کە بەشێکی بەهۆی گەرمای نیوەڕۆوە بوو، سوڵتان داوای لە خۆجە کرد لەو بەسەرهاتانەی بۆ بگێڕێتەوە کە شەوانە ترس دەخاتە دڵیەوە. بەدەم بیستنی دەنگی لێدانی تەنەکەوە لە دوور، هێدی هێدی پێشوەچوونمان دەکرد تا گەیشتینە گوندێکی کرستیاننشین و وچانمان دا. خۆجە و سوڵتان بەدەست ئاماژەیان بۆ یەکێک لە ماڵە چۆڵکراوەکانی گوند کرد. لەو ساتەدا پیاوێکی بەساڵاچووی ڕیوەڵەم بینی کە سەری لە نێوان دەرگای ماڵەوەکەوە هێنابووە دەرێ. سوڵتان دەستووری دا و کابرایان هێنایە بەردەمی. پێش کەمێک لەمەڕ ناواخنی مێشکی "ئەوان" دوابوون، کاتێک هەستم بە پەرۆشیی سەر ڕوویان کرد و بینیم وا خۆجە لەڕێی وەرگێڕەوە پرسیار لە کابرای بەساڵاچوو دەکات، لە ترسی ئەو شتەی بە خەیاڵی خۆم بۆی چووبووم، لێیان نزیک کەوتمەوە.

خۆجە داوای لە کابرا دەکرد بێ بیرکردنەوە دەستبەجێ وەڵامی پرسیارەکانی ئەم بداتەوە: گەورەترین تاوان و مەزنترین خراپەکاری لە ژیانتدا کامەیە؟ کابرای گوندی، لەژێر لێوەوە بە زمانێکی سلاقیی خراپ دەدوا و وەرگێڕەکەش بۆمانی وەردەگێڕا: "بەسالاچوویەکی بێتاوان و بێگوناھ و بەلەنگازم." بەڵام خۆجە پێی لە کابرا کردبوو بە کەوشدا و داوای لێ دەکرد باسی خۆی بۆ بکات. کابرای پیرە کاتێک ھەستی کرد سوڵتانیش ھێندەی خۆجە پەرۆشی بیستنی ئەمە، دانی بە تاوانی خۆیدا نا: "بەڵێ، تاوانبارم، دەبوو منیش ئەمڕۆ لەگەڵ خەڵکی ئاواییدا لە ماڵ دەربچوومایە. دەبوو منیش لەگەڵ خوشک و برایانمدا بچوومایە بۆ ڕاو و بەدوای ئاژەڵدا ڕام بکردایە. بەڵام ناتوانم، بیانووم ھەیە و بەشی ھێندە تەندروست نیم لە گزنگی بەیانەوە تا ڕۆژئاوا بەناو دارستاندا ڕابکەم." بە دەست ئاماژەی بۆ دڵی دەکرد و داوای لێبووردنی دەکرد. خۆجە ھەڵچوو و نەڕاندی: "ئەوە نا، من پرسیاری تاوانە ڕاستەقینەکانم لێت کرد." بەڵام پێ نەدەچوو کابرای گوندی لە پرسیارەکە گەیشتبێ، گەرچی وەرگێڕەکە چەند جارێکیش بۆی دووبارە کردەوە. بە غەمەوە دەستی نابووە سەر دڵی و لەوێ ڕاوەستابوو. کابرای پیرەیان برد. دوای ئەوەی یەکێکی تریان ھێنا و ئەویش ھەمان شتی گوتەوە، خۆجە لە داخاندا سوور ھەڵگەڕا.
خۆجە بۆ ئەوەی ئەرکی کابرای دووەم ئاسان بکات، بێ ئەوەی ناوم بێنێ، گوناھ و تاوانەکانی منی بۆ گێڕایەوە، بۆ نموونە: گوناھەکانی سەردەمی منداڵیم، ئەو درۆیانەی بۆ خۆ زیاتر خۆشەویستکردنم لە خوشک و براکانم دەمکرد و گوناھە زایەندییەکانی سەردەمی زانکۆم. لەو کاتەدا من بە ڕق و شەرمەوە ڕۆژانی پەتاکەم بیرکەوتەوە، کە ئێستا لە کاتی نووسینەوەی ئەم کتێبەدا بەتاسەوە بیری دەکەم. گوندییەکی گەنج کە وەک دواین کەس ھێنرا، بە فسکە دانی پێدانا کە لە کاتی خۆشۆشتنی ژناندا لە نەواڵ، ئەم سەیریانی کردووە. خۆجە بەبیستنی ئەم دان پێدانانە کەمێک خاوبووەوە و گوتی: "بەڵێ، ئەوان ئاوان لەبەرامبەر گوناھەکانی خۆیاندا، ئامادەن ڕووبەڕووی خراپەکارییەکانیان ببنەوە. بەڵام ئیدی نۆرەی ئێمەیە بزانین چی لە سەرماندا ڕادەبووڕێ." ئەم قسانە و گەلێ شتی تریشی گوت. دەمویست بڕوا بەخۆم بھێنم کە قسەکانی کاریگەریی زۆریان لەسەر سوڵتان دانەناوە.

بەڵام سوڵتان پەرۆشتر بووبوو. دوو ڕۆژ دواتر و لە ڕاوێکی تردا کاتێک بەسواریی ئەسپەوە بەدوای ڕەوە ئاسکێکدا غارمان دەدا، چاوپۆشی لە دەست پێکردنەوەی هەمان بەزم کرد. ڕەنگە لەبەرئەوە بووبێ کە خۆی لەبەرامبەر پێداگرتنی خۆجەدا بۆ ڕانەگیرابێ، یاخۆ لێپرسینەوەکەی، زیاتر لەوەی من بۆی چووم، پێ خۆش بووبێ. ئیدی لە ڕووباری دانووب پەڕیبووینەوە و دیسان گەیشتبووینە گوندێکی کرستیاننشین کە بە زمانێکی بەڕەچەڵەک لاتینی دەدوان. گۆڕانکارییەکی ئەتۆش لەو پرسیارانەدا نەبوو کە خۆجە ئاراستەی خەڵکەکەی دەکرد. پرسیارەکانی، توندوتیژیی شەوانی پەتاکەی بیرم دەخستەوە کاتێک ناچارم کردبوو خراپەکارییەکانی خۆی تۆمار بکات. وەک دادوەرێکی نەناسراو پرسیاری لە گوندنشینان دەکرد، سوڵتانیش بە بێدەنگی پشتیوانیی لێ دەکرد و گوندنشینانیش لە ترسی سوڵتان وەڵامیان دەدایەوە. من سەرەتا نەمویست گوێ لە پرسیار و وەڵامەکان بگرم. بەشێوەیەکی سەیر ڕقم هەستابوو. لە خۆجە زیاتر، لە سوڵتان پەست بووبووم، لەبەرئەوەی چێژی لە گەمەکە وەردەگرت و نەیدەویست سنوورێکی بۆ دابنێ. بەڵام هێندەی پێ نەچوو و منیش کەوتمە بەر کاریگەریی ئەو پەرۆشییە دزێوەوە. باوەڕم بە خۆم هێنا کە بە گوێگرتن هیچ لە دەست نادەم و لێیان نزیک بوومەوە. گوناه و تاوانەکان کە بە زمانێکی شیرینتر بە گوێی من دەگێڕدرانەوە، زۆربەیان لە یەکدی دەچوون: درۆی سادە، فرتوفێڵی بچووک، یەک دوو نامەردایەتی، دوو سێ بێ وەفایی، هەرە زۆر، چەند دزییەکی بچووک.

ئێوارە خۆجە گوتی گوندنشینان هەموو شتێکیان نەگێڕاوەتەوە و ڕاستی دەشارنەوە. بە بۆچوونی خۆجە، من لە کاتی خۆیدا لە داننان بە تاوانەکانمدا زۆر پێشوەچوونم کردبوو. پێی وابوو دەبێ گوناهی زۆر قووڵ و ڕاستەقینەتریان هەبێ کە ئەوان لە ئێمە جیا دەکاتەوە. بۆ ئەوەی ڕاستییەکان بەدەست بخات و نیشانی بدات لە پێشدا "ئەوان" و دوایی "ئێمە" چۆنین، ئامادەبوو، ئەگەر پێویست بکات، سوڵتان لەخشتە ببات و هێز بەکار بهێنێ.

ڕۆژانی دواترمان بەدەم ئەم توندوتیژییە دزێوەوە بەسەر برد، کە تا دەهات زیادی دەکرد و بێ واتاتر دەبوو. دەسپێک هەموو شتێک سادە و ئاسایی بوون. ئەو ڕۆژانە

له کۆمەڵێک منداڵ دەچووین کە لە ناوەڕاستی گەمەی خۆیاندا یەک دوو گاڵتەی شیرین دەکەن. لێپرسینەوەکان لە ناوەڕاستی سەعاتە دووروودرێژەکانی ڕاودا ڕێک دەخرا و بۆ ئێمە وەک بەزم و ڕابواردنی بچووکی کاتی پشوودانی لێ هاتبوو. بەڵام دواتریش وەرگەڕایە سەر ڕێوڕەسمێک کە وزەی لەبەر خواست و ئۆقرە و هۆشمان بڕیبوو و لەبەر هۆیەکی نادیار نەماندەتوانی دەستی لێ هەڵبگرین. گوندنشینانێکم دەبینی کە لەبەر پرسیارەکان و نەزانینی هۆی هەڵچوونی خۆجە سەریان لێ شێوابوو و ئەگەر بەڕوونی بیانزانیایە چییان لێ داوا دەکرێ، لەوانەبوو بێنە گۆ و قسە بکەن. کەسانی بەساڵاچووی شەکەت و ددان لە دەمدا نەماوم دەبینی کە لە مەیدانی گوندەکاندا کۆ دەکرانەوە، پێش ئەوەی زمانیان تەتەڵە بکات و دان بە گوناهەکانیاندا، یاخۆ گوناهە ساختەکانیاندا بنێن، بە چاوی ئومێد لێبڕاوەوە بۆ هاوکاری لە دەوروبەر و لە ئێمە دەپاڕانەوە. دەستەی گەنجانم دەبینی کە لەبەرئەوەی دان پێدانان و گوناهەکانیان بە کەم دەبیندرا، دارکاری دەکران. لەو کاتەدا ڕەفتارێکی خۆجەم بیر کەوتەوە کاتێک دوای خوێندنەوەی ئەو شتانەی لەسەر مێزەکە دەینووسی، مستەکۆڵەیەکی بە پشتمدا کێشا و بە هەڵچوونەوە گوتی " تۆ، قوڕت بەسەر!" و چۆن هەڵدەچوو و لەگەڵ خۆیدا ناتەبا بوو، چونکە نەیدەتوانی تێ بگات بۆچی من مرۆڤێکی وەهام. ئەگەرچی بەتەواویش نەبێ، ئیدی زۆر باش دەیزانی بەدوای چیدا دەگەڕێ و بە چ ئاکامێک بگات. شێوازی تریشی تاقی کردەوە: لەپڕ قسەی بە دان پێداهێن دەبڕی و پێی دەگوت درۆ دەکەی. ئیدی پیاوەکانی ئێمە کابرای گوناهبارییان دارکاری دەکرد. هەندێ جار قسەی کابرای دان پێداهێنی دەبڕی و دەیگوت برادەرەکەت پێچەوانەی ئەوەی تۆ دەڵێ. ماوەیەک شێوازێکی تری تاقی کردەوە: خەڵکەکەی بەجووتە بۆ بەردەم خۆی بانگ دەکرد. سەرباری زەبروزەنگی پیاوەکانمان، گوندنشینەکان شەرمیان لە یەکدی دەکرد و وەک پێویست بەقووڵاییی ڕاستییەکاندا نەدەچوونە خوارێ. خۆجە بەبینینی ئەو دۆخە هێندەی تر کەللەیی دەبوو.

ئەو کاتەی بارانێکی بێ بڕانەوە دەستی پێ کرد، ئیدی منیش لەگەڵ ڕووداوەکاندا ڕاهاتبووم. بیرم دێ کۆمەڵێک گوندنشین لە مەیدانی قوڕاویی گوندەکەیاندا

کۆکرابوونەوە و تا سەر ئێسقان تەڕ بووبوون. نە لە توانایاندا بوو و نە نیازیشیان هەبوو شتێک بڵێن و چەندین سەعات بەدەم تێ هەڵدانەوە ڕاگیران. تا دەهات دەرچوونمان بۆ ڕاو لە کزیی دەدا و کەم دەبووەوە. گەرچی جاروبار ئاسکێکی چاو جوان، کە دەبووە هۆی غەمباربوونی سوڵتان، یاخۆ نێرە بەرازێکی کێویمان ڕاو دەکرد، بەڵام ئیدی لەبری وردەکارییەکانی ڕاو، ئەو لێپرسینەوانە ئەقڵمانی داگیر کردبوو، کە کتومت وەک ڕاو زۆر زووتر تەدارەکی بۆ ساز دەکرا. شەوانە خۆجە وەک ئەوەی لەبەرامبەر کارەکانی ڕۆژیدا هەست بە ئازاری ویژدان بکات، ناخی خۆی بۆ من هەڵدەڕشت. ڕووداوەکان و بەکارهێنانی توندوتیژی ئۆقرەی لەبەر بڕیبوو، بەڵام دەیویست زانیارییەک بسەلمێنێ، زانیارییەک کە بەکەڵکی هەموومان بێ و نیشانی سوڵتانیشی بدات. دواترێ گوتی: "پێت وا نییە ئەو گوندنشینانە ڕاستییەکان دەشارنەوە؟" پاشان گوتی: "دەبێ هەمان تاقیکردنەوە لە گوندێکی موسڵمانیش ئەنجام بدەین." بەڵام لەوەشدا سەرکەوتوو نەبوو، چونکە ئەوانیش هەمان شتی جۆری هاوسێ کرسیتانەکانیان گوتبوو و هەمان چیرۆک و باڵۆرەیان گێرابووەوە. ڕۆژێک لەو ڕۆژە بەربادانەی کە باران خۆشی نەدەکردەوە، خۆجە لەبەر خۆیەوە بۆڵەیەکی بۆ کرد و گوتی ئەوانە موسڵمانی ڕاستەقینە نین. بەڵام ئێواران لە کاتی لێکدانەوەی ڕووداوەکانی ڕۆژدا، دەمبینی هەستی کردووە سوڵتان لەم ڕاستییە بێ ئاگا نییە.

بەڵام ئەمە جگە لە هەڵچوونی زیاتری خۆجە و بێزاربوونی لە ئامادەبوونی سوڵتان لە کاتی لێپرسینەوەکاندا و بەکارهێنانی زیاتری توندوتیژی وەک دواین ئومێد، کە من تەنیا لە پەرۆشیی خۆمەوە دوای کەوتبووم، بەکەڵکی هیچ شتێکی تر نەهات. لە ڕێ و ڕەوتماندا بەرەو باکور، گەیشتینە ناوچەیەکی داپۆشراو بە دارستان کە خەڵکی گوندەکانی بەزمانی سلاڤی قسەیان دەکرد. بە چاوی خۆمان خۆجەمان بینی کاتێک لە گوندێکی خنجیلانە و جواندا بەدەستی خۆی لە مێردمنداڵێکی جوانکارەی دەدا، لەبەرئەوەی جگە لە درۆیەکی منداڵانە هیچی تری بیر نەکەوتبووەوە. ئێوارە هەستێکی خۆ بەتاوانبار زانینی ئەوتۆ دای گرتبوو، کە تەنانەت منیش زیادەڕۆییم پێوە دەبینی. گوتی: "هەرگیز ئەو ڕەفتارە دووبارە ناکەمەوە." جارێکی تر وا هەستم

کرد لە دوورەوە کۆمەڵێک ژنم لە ژێر بارانێکی زەردباودا بینیبێ کە بۆ چارەنووسی نێرینەکانیان دەگریان. ئیدی پیاوەکانیشمان، کە ئەزموونێکی زۆریان لە کاری خۆیاندا پەیدا کردبوو، لە ڕووداوەکان بێزار بووبوون. هەندێ جار ئەوان پێش ئێمە دەکەوتن و کەسێکی دان پێداهێنیان هەڵدەبژارد و دەیانهێنایە بەردەممان. بەر لە خۆجە، کە بەهۆی بەکارهێنانی توندوتیژییەوە شەکەت دەبوو، وەرگێڕەکەمان خۆی پرسیارەکانی سەرەتای لە کابرای دان پێداهێن دەکرد. ئەوە نەبێ بڵێی کەسانێکی سەرنجڕاکێشمان لێ هەڵنەکەوتبێ کە لە ترسی ئەو زەبروزەنگی جۆری ئەفسانە تەشەنەکردووەمان بە گوندەکاندا، یاخۆ وەک ئەوەی سالانێکی درێژ بە ترس و سەرسوڕمانی دادپەروەرییەکی بالای نادیارەوە، چاوەڕوانی ئەم ڕۆژی لێپرسینەوەیەیان کردبێ و بەدووروردرێژی دانیان بە گوناهەکانی خۆیاندا نەنابێ. بەلام چیرۆکی بێ وەفایی ژنان و پیاوان و ئێرەیی پێبردنی گوندنشینانی هەژار بە هاوسێ خواپێداوەکانیان، چی دی بۆ خۆجە مایەی بایەخ پێدان نەبوو. بەردەوام دووپاتی دەکردەوە کەوا ڕاستییەکی قووڵتر هەیە، بەلام پێم وابێ خۆیشی وەک ئێمە لەبەرەوە دەکەوتە گومانەوە لە گەیشتن بەو ڕاستییە. بەلانی کەمەوە هەر کاتێک پەی بە گومانی ئێمە ببردایە، شێت و دەهری دەبوو، بەلام ئێمە و سوڵتانیش دەمانزانی نیازی دەست هەڵگرتنی نییە. لەوانەیە لەم سۆنگەیەشەوە بووبێ بێدەنگ بووین لەوەی خۆجە هەموو سەرەداوەکانی گرتبووە دەستی خۆی. جارێکیان شەهلەوەندێکمان ڕاکێشایە ژێر بانێک. لاوەکە تا سەر ئێسقان تەڕ بووبوو و نەفرەتی لە باوەپیارەکەی و خراپەی ئەو دەرهەق بە دایکی و نەفرەتی لە زڕخوشک و براکانی دەکرد. کەمێک ئومێدمان هاتەوە بەر کاتێک خۆجە چەندین سەعات دایە بەر پرسیار، بەلام ئێوارە گوتی ئەویش لاوێکی ئاساییی شایەن بە لەبیر بردنەوەیە و بەوجۆرە بابەتەکەی داخست.

زۆر زیاد بەرەو باکور پێشوەچوونمان کردبوو. کاروانی سوپاکەمان وەک مار لە نێوان چیا بەرزەکاندا پێچی خواردبوو و بەرێگای قوڕاویی ناو دارستانە تاریکەکاندا زۆر لەسەرخۆ ڕێی دەکرد. حەزم لە نهێنیی بێدەنگیی گومان ورووژێنەر و ئەو هەوا فێنک و تاریکە بوو کە لە دارستانە بە دارسنەوبەر و ڕەشەداربەڕوو

داپۆشراوەکانەوە دەهات. گەرچی کەس ئەو ناوەی بەکار نەدەهێنا، بەڵام پێم وابێ لە دامێنی ناوچەی کارپات بووین، ئەو ناوچەیەی کاتی خۆی لەسەر نەخشەیەکی ئەورووپای بە مامز و کۆشکی گۆتیک خەملێنراوی دەستکاری نیگارکێشێکی خراپ لەبەر دەستی باوکمدا بینیبووم. خۆجە لەبەر باران سەرمای بووبوو و نەخۆش کەوتبوو، بەڵام سەرباری ئەوەش، هەموو بەیانیانێک لە شارێ، کە وەک ئەوەی بیەوێ بە هۆی پێچ و دەوری زۆریەوە درەنگ بگەینە شوێنی مەبەست، جیا دەبووینەوە و دەچووینە ناو دارستانەکانەوە. ئیدی ڕاو و شکار کەوتبووە خانەی لە بیرچوونەوە. وەک بڵێی هەڵوەدای ڕاوکردنی ئاسکێک لە قەراغ ئاوێک یان لە کەناری نەواڵێک نەبووین، بگرە چێژمان لە زیاتر ڕاگرتنی ئەو گوندنشینانە دەبینی کە بۆ ئێمە ئامادە دەکران! دواتر، لە کاتی گونجاودا بڕیار دەدرا و دەچووینە یەکێک لە گوندەکانەوە. دوای ئەنجامدانی ئەوەی دەبوو بیکەین و کاتێکیش ئەو گەوهەرەمان بۆ نەدەدۆزرایەوە کە عەوداڵی بووین، خۆجە بەمەبەستی لە بیرکردنی بەدرەفتاری و دارکاریی خەڵکەکە و بەر لە هەموو شتێکیش بۆ لە بیربردنەوەی بێ ئومێدیی خۆی، داوای لێمان دەکرد دەستبەجێ ڕوو لە گوندێکی تر بکەین و ئێمەش دەکەوتینە شوێنی. جارێکیان ویستی تاقیکردنەوەیەکی تر ئەنجام بدات. سوڵتان کە بەدان بەخۆداگرتن و پەرۆشیی خۆی، منی تووشی سەرسوڕمان کردبوو، دەستووری دا بیست یەنیچەرەی بۆ بهێنن. خۆجە هەمان ئەو پرسیارانەی جارێک لەوان دەکرد و جارێکیش لە گوندنیشنانی داماوی ڕاگیراو لەبەردەم دەرگای ماڵەکانیاندا. جارێکی تریان، گوندنشینانی بردە لای کاروانی سوپا و ئامێرەکەمانی نیشانیان دا، کە بۆ ئەوەی فریای ڕەوتی سەربازەکانی سوڵتان بکەوێ، بە چەتوونی و بە جیڕوهۆڕ بە ڕێگا قوڕاوییەکەدا دەڕۆیشت. لە بۆچوونیانی پرسی و داوای لە نووسەران کرد وەڵامەکانیان تۆمار بکەن. بەڵام لەبەر هۆیەک کە من نەمدەزانی چییە، ئیدی خۆیشی بڕستی لێ بڕابوو: ڕەنگە لەبەرئەوە بووبێ، وەک خۆی دەیگوت، ئێمە هەر بەڕاستی تێ ناگەین. یان دەبوو خۆیشی لە زەبروزەنگی بێ واتا بێزار بووبێ. یاخۆ بەهۆی ئەو هەستی خۆ بەتاوانبار زانینەوە بوو کە شەوان تووشی دەبوو. یان وای بۆ دەچووم لە منگەمنگی سوپا و شازادەکان لەبارەی ڕووداوەکانی ناو دارستانەکان و

چەکەکە بێـزار بووبێ. لەوانەشـە تەنیا لـەبەر نەخـۆشـییـەکەی بووبـێ. کۆکە دەنگی گۆڕیبـوو و دەنگی وەک جـاران گڕ نەبوو، وەڵامی هـەمـوو پرسـیـارەکـانی لەبەر بوو و بەجۆشی جارانەوە نەیدەپرسی. شەوانە لەمەڕ سەرکەوتن، داهاتوو و ڕزگاربوونمان لە فەوتان قسەی دەکرد، بـەڵام بڕوای بە قسەکانی خۆی و بە دەنگی خـۆیشی، کە تا دەهات لاوازتر دەبوو، نەدەکرد. لە بیـرمـە چۆن دواجـار لەژێر بارانێکی هاوشـێوەی ڕەنگی دووکەڵی گۆگردا چەند گوندنشـینێکی سـلاڤیی دامـاوی کۆکردەوە و زۆر بێ بەزەییـیانە خـستـنیە بەر لێپرسـینەوە. ئێمە لەبەرئـەوەی نەماندەویست چی دی گوێ بگرین، لـە دوورەوە ڕاوەسـتـابووین. لە تیـشـکێکی خـەیاڵیی ئەفـشـانکراو بە باراندا دەمـانبـینی لە ئـاوێنەیەکی چوارچێوەزیوین، کـە خـۆجـە ئـەم دەست و ئەو دەسـتی پێ دەکرد، داماوانە سەیری ڕووی لاوازی خۆیان دەکرد.

چی دی بۆ ڕاو و شکار دەرنەچووین. لە ڕووبار پـەڕیبـووینـەوە و چووبووینە خـاکی پۆلۆنیاوە. بارانی بەرباد ڕێگاوبانەکانی پڕ کردبوو لە قوڕ و لیتە و چەکەکـەمان وەک پێویست ڕێی نەدەکرد و ڕەوتی سـوپاشی، کە دەبوو خێراتر بڕوات، سست کردبوو. قسـەی شـازادەکان، کە هـەر لە بنەڕەتەوە خۆشییان بەچارەی چەکەکەماندا نەدەهات، دەربارەی شـوومی و نەفـرەت هێنانی ئامـێـرەکـەمـان لـەو مـاوەیەدا زیاتر پەرەی سـەندبوو. قسـە و قسـەڵۆکی یەنیچەرەکانی بەشدار لە تاقیکردنەوەکانی خۆجە، ترش و خـوێی زیاتری بەسـەر بابەتەکەدا دەکرد. وەک هـەمـوو جـارێکیش، لە خـۆجـە زیاتر، منـی گـاوریـان تاوانبـار دەکـرد. کـاتێک خـۆجـە دەسـتی بەهەمـان چەنەبـازیی شیـعرئامێز، کە سوڵتـان خۆیشی لێی بێزار بـووبوو، دەکردەوە و باسـی پێداویسـتیی چەکـەکـە و هێـزی دوژمن و پێـویسـتـیی هـەوڵدانمان بۆ ڕزگـاربـوون لە کـارەسـاتی چاوەڕوانکراوی دەکرد، ئـەو شـازادانـەی لە چادری سـوڵتـاندا گـوێیـان لێ دەگـرت، باوەڕیان بە سـاخـتـەکاریی ئێمـە و نەگـبـەتیی چەکەکەمـان پتـەوتر دەبوو. بە چاوی کـەسێکی لەڕێ لادەر، بەڵام وەک نـەخۆشێکی بەتەواوی ئومێد لێنـەبڕاو بۆ خۆجـەیان دەڕوانی. بە بۆچوونی ئـەوان، مەترسیی بنەڕەتی و تاوانباری سـەرەکی، منی گاورم کـە بەهۆنینەوەی شـوومی و نەگبـەتی، سـوڵتـان و خـۆجـەم لەخشـتـە بردووە. شـەوانە دوای گەڕانەوەمان بۆ چادرەکەی خـۆمان، خـۆجە بە دەنگە نـەخۆشـەکەی و بەهەمـان

شێوەی باسکردنی ئەوان و گەمژەکانی ساڵانی ڕابردوو، بە ڕق و هەڵچوونەوە قسەی دەکرد، بەڵام چی دی ئەو نەشئە و ئومێدەی ساڵانی ڕابردووی، کە باوەڕم وابوو دەتوانین بەردەوام بە زیندوویی ڕای بگرین، نەمابوو.

سەربارى ئەوەش، دەمبینی ئەوەندە ئاسان نییە سەری داوەکە بەربدات. دوای دوو ڕۆژ کاتێک بینیم چەکەکەمان لە قوڕ و لیتەی پاشماوەی باراندا چەقی و بووەتە هۆی ڕاوەستاندنی ڕەوتی بەرەوپێشچوونی سوپا، من بەتەواوی بێ ئومێد بووم. خۆجە سەرباری نەخۆشییەکەی، ورەی بەرنەدا. کەس پیاوی نەدا پێمان، تەنانەت ئەسپیشیان پێمان ڕەوا نەبینی. خۆجە چووە لای سوڵتان و نزیکەی چل ئەسپێکی پەیدا کرد. زنجیری تۆپەکانی کردەوە و کۆمەڵێک پیاوی کۆکردەوە. دوای ئەوەی بەدرێژایی ڕۆژ هەوڵمان دا، لەگەڵ نزیکبوونەوەی سوورایی ڕۆژئاوابووندا، لەژێر نیگای ئەوانەی دەپاڕانەوە لە قوڕەکە بچەقێ و نقوم ببێ و بەدەم لێدانی ئەسپەکانەوە، جانەوەرە زەبەلاحەکەمان تەکانی دا. ئێوارەش، خۆجە بەرەنگاری ئەو شازادانە بووەوە کە دەیانویست ڕزگاریان بێ لێمان و دەیانگوت چەکەکە نەک هەر بەتەنیا نەگبەتی، بگرە گرفتی سەربازیش لەگەڵ خۆیدا دێنێ. بەڵام هەستم دەکرد ئیدی باوەڕیشی بە سەرکەوتن نەماوە.

شەو لە چادرەکەی خۆماندا بووین، عوودێکم بەدەستەوە بوو کە لە سەرەتای سەفەرمانەوە لەگەڵ خۆمدا هێنابووم. ویستم کەمێک بژەنم، بەڵام عوودەکەی لە دەستم وەرگرت و فڕێی دایە گۆشەیەکەوە و گوتی: "داوای کەللەت دەکەن." پرسی: "ئەرێ بەمە نازانی؟" دەمزانی. خۆشحاڵ دەبوو ئەگەر لەبری من، داوای کەللەی ئەویان بکردایە. پەیم بەوەش بردبوو، بەڵام هیچم نەگوت. لەوەدا بووم عوودەکەم هەڵبگرمەوە، دەستمی گرت و ویستی باسی ئەوێ، وڵاتەکەمی بۆ بکەم. هەروەک ئەوەی بۆ سوڵتانم دەکرد، یەک دوو بەسەرهاتی خەیاڵکردم بۆ ئەویش گێڕایەوە، بەڵام لەپڕ هەڵچوو. ڕاستیی دەویست، وردەکارییە ڕاستەقینەکان: پرسیاری دایکم و دەزگیرانەکەم و خوشک و براکانمی لێم کرد. کاتێک من وردەکارییە "ڕاستەقینەکان"م دەگێڕایەوە، ئەو خۆی هاویشتە ناو قسەکانمەوە و بەو ئیتاڵییەی لە من فێر بووبوو، لەژێر لێوەوە چەند وشەیەکی خنکاو و بڕێک ڕستەی کورت و

ناتەواوی گوتەوە کە من نەمتوانی لە واتاکانیان بگەم.

ڕۆژانی دواتر کاتێک بڕێک شوورا و سەنگەری سوتێندراو و ڕووخێندراوی بینی کە قوڵی پێشەوەی هێزەکانمان دەستیان بەسەریاندا گرتبوو، هەستم کرد وەک دواین تیشکی هیوا کۆمەڵێک بیرۆکەی سەمەرە و دزێوی بۆ هاتووە. سەرلەبەیانی کاتێک لەسەرخۆ بە گوندێکی ئاگر تێبەردراودا تێ دەپەڕین، کۆمەڵێک برینداری بینی لەبن دیوارێک لە گیانەڵادا بوون. لە ئەسپەکەی دابەزی و بەرەوڕوویان چوو. سەرەتا وامزانی دەیەوێ بە هانایانەوە بچێ، لەوە دەچوو ئەگەر وەرگێڕی لەتەک بووایە، پرسیاری دەرد و ئازارەکانی لێیان بکردایە. لە دوورەوە سەیرم دەکرد، دواتر تێ گەیشتم جۆش گرتی، وەک بڵێی پەیم بەهۆی جۆش گرتنەکەی بردبوو. دەیویست شتی زۆر جیاوازیان لێ بپرسێ. ڕۆژی دواتر، کاتێک لەگەڵ سوڵتاندا چووین بۆ بەسەرکردنەوەی شوورا و سەنگەرەکانی ڕاست و چەپی ڕێگا، خۆجە لە هەمان جۆش و خرۆشدا بوو. کاتێک لە خانووە وێرانکراو و لە نێوان دیواری تەختەی بەگوللەتۆپ کون تێکەوتوودا بریندارێکی سەر هێشتا نەپەڕێندراوی دەبینی، خۆی پێ دەگەیاند. منیش، بۆ ئەوەی شتی قۆڕی لێ نەوەشێتەوە و دواتر بەسەر مندا بهێندرێ، یاخۆ هەروا لە ڕووی فزوولەوە دوای دەکەوتم. بریندارانی جەستە کون تێبوو بە فیشەک و پارچەی گوللەتۆپ وا دەهاتنە بەرچاو وەک ئەوەی بەرلەوەی دەمامکی مردن بپۆشن، بیانەوێ شتگەلێک بۆ خوجە بگێڕنەوە. خۆجە خۆی بۆ پرسیار و وەڵام ئامادە دەکرد و چاوەڕێی دەکرد ئەو ڕاستییە قووڵەی بۆی هەبوو لەپڕ هەموو شتێک بگۆڕێ، لە دەمی ئەوان ببیستێ. بەڵام دەمبینی بێ ئومێدیی ڕووی ئەو بریندارانەی کە لەگەڵ مردن لە زۆرانبازیدا بوون، لەگەڵ بێ ئومێدیی خۆیدا بەراورد دەکات. تا زیاتر لێیان نزیک دەکەوتەوە، ئێستێکی دەکرد و بێدەنگ دەبوو.

ئێوارەی ئەو ڕۆژە کاتێک بیستی سەرباری هەوڵی زۆر، دەست بەسەر قەڵای دۆپیۆدا نەگیراوە و ئەمەش سوڵتانی توورە کردووە، بەهەمان جۆشی پێشووەوە خۆی گەیاندە لای سوڵتان. دوای گەڕانەوەی بە گومان بوو، بەڵام وا دیار بوو نەیدەزانی لە چ بەگومانە. داوای لە سوڵتان کردبوو چەکەکە بخاتە شەڕەوە و پێی

گـوتبـوو سـالانێکی درێژ ئامـێـرەکـەی بۆ ڕۆژێکی وەک ئەمـڕۆ دروست کـردووە. بە پێـچـەوانـەی بۆچوونی منەوە، سـوڵتـان گوتبـووی کـاتی هاتووە، بـەڵام فـەرمـووبووی جـارێ پێـویسـتـە چاوەڕێی شـازادە سـاری حـوسـێن بکرێ، کـە هـەمـان ئـەرکی پێ سـپێردراوە. بۆچی ئەمـەی گوتووە؟ ئەمـە یەکێک بوو لەو جۆرە پرسیـارانەی چەندین سـاڵ بوو مـن نەمـدەزانی لە خـۆی دەپرسێ یان لە مـن؟ نازانم لەبەر چـی بوو وام بە خـەیاڵدا هات پێی وابێ من هەست بـە نزیکی لەو نـاکـەم و لەتـاو بێ ئۆقـرەییی خـۆم بێــزار بـووم. خـــۆی وەڵامی دایـەوە: "چونکـە ترسـی ئـەوەیـان هـەیـە من لـە بـەشـــە سەرکەوتنی ئەوان بخۆم."

تا نیوەڕۆی ڕۆژی دواتر کـاتێک بیستمـان شازادە ساری حوسێن هێشتا قـەڵاکەی بۆ نەگیراوە، خۆجـە هـەموو هـەوڵی خۆی خستە کـار بۆ ئەوەی بڕوا بەو وەڵامەی خۆی بهێنێ. لەبەرئەوەی قسـە و قسـەڵۆکی سـەبارەت بە شـوومی و سـیـخـوڕیی من زۆر تەشـــەنەی کـــردبوو، ئیـــدی من بۆ چادری ســوڵتــان نەدەڕۆیشــتم. شـــەو کــاتێک بەمەبەستی ڕووداوەکانی ڕۆژ ڕووی لە چادری سوڵتان کردبوو، خۆجە لە گێڕانەوەی بەسـەرهـاتی سەرکەوتن و بەختەوەریدا سـەرکـەوتبوو و بە ڕووی سـوڵتـانیشـەوە دیار بووە باوەڕی پێ هێناوە. لە گـەڕانەوەیدا بۆ چادرەکـەمـان، گـەشـبـینیی کـەسێک، کە باوەڕی وایە لە ئاکامدا قـاچی ئیبلیس دەشکێ، باڵی بەسـەردا کێشـابوو. گوێم لێ گرت، نەک لەبەر گـەشبـینییەکـەی، بگرە لەبەرئەوەی چاودێریی هـەوڵی بێ وچانیم بۆ خۆ لەسەر پێ ڕاگرتنی دەکرد.

دیســـانەوە بـاسـی بـەســـەرهـاتە کـــۆنەکـــان و ئێــمـــە و ئەوان و ســـەرکـــەوتنی چاوەڕوانکراوی کـردەوە، بەڵام غـەمـیگینیـیـەک لە دەنگیـدا هـەبـوو کـە پێـشــتـر لە گـــێـــڕانەوەی بـەســـەرهـاتـەکـــاندا هـیچ پێی ئاشنا نەبووبووم: وەک بڵــێی بـاسـی بیـرەوەرییـەکی هـاوبەشی سـەردەمی منداڵیمـان بکات. عـوودەکـەم گـرتـەوە دەسـتـم، ئەمـجـار هـیچ دەنگی نەکـرد. کـاتێک من نەزانانە زیقـەم لە عـودەکە هـەسـتـاند، ئەو باسی ئەو ڕۆژە جـوانانەی داهـاتووی دەکرد کە تیـایاندا دەتوانین ئاراسـتـەی ڕووبار بەو ڕووکارەدا ببەین کە خۆمان مەبەستمانە، بەڵام هەردووکمان دەمانزانی لە بارەی ڕابردووەوە دەدوێ. لە زەینی خـۆمـدا داری بێ جـووڵەی ناو بـاخـچـەیەکی پشـتـەوە،

ژووری گەرم و ڕووناک و مێزێکی خواردنم دەبینی کە بە خزم و کەسوکار دەورە درابوو. یەکەم جارم بوو لەو هەموو ساڵەدا لە گوێگرتن لە خۆجە هەست بە ئاسوودەیی بکەم. دەیگوت ئەمانەی ئێرەی خۆش دەوێ و لەبەر شانی گرانە لێیان دوور بکەوێتەوە، منیش قسەکانیم بۆی سەلماند. کاتێک گوتی مرۆڤ دوای بیرکردنەوە لەمانەی ئێرە گەمژەکانی بیر دەکەوێتەوە و لەگەڵ ئەم قسەیدا هەڵچوو، من دیسان قسەکانیم بۆ سەلماند. پێ دەچوو گەشبینییەکەی لەبەرامبەر داهاتوو زۆر ڕووکەشانە بێ. ڕەنگە لەبەرئەوە بووبێ هەردووکمان پەیمان بە ژیانی نوێی بردبێ کە بەم زووانە دەستی پێ دەکرد. یان لەوەوەوە بووبێ ئەگەر منیش لە جێی ئەو بوومایە، هەمان شتم دەکرد. بڵێم چی، نازانم!

سەرلەبەیانیی ڕۆژی دوایی کاتێک بەمەبەستی تاقیکردنەوە چەکەکەمان بەرەو سەنگەرێکی بچووکی دوژمنی نزیک لەڕێی خۆمان بەڕێ کرد، هەردووکمان بە هەستێکی سەیری پێشوەختەوە دەمانزانی ئامێرەکەمان بە کەڵکی هیچ شتێک نایەت. سوڵتان بۆ پشتیوانیکردن، نزیکەی سەد پیاوی خستبووە خزمەتمان. بەڵام لەدوای یەکەم هێرشی چەکەکەمان، ڕۆیشتن و بڵاوەیان لێ کرد. چەکەکە هەندێکیانی پان کردەوە و لەتوپەتی کردن. برێکیشیان بەهۆی تەکانی کاریگەریی چەکەکەمانەوە، کە دوای تەقاندنی چەند گوللەیەکی ئەنجام نەپێکاو نامەردانە لە قوڕدا چەقی، بەرکەوتن و کوژران. بەشی زۆریشمان لە ترسی شوومی و نەگبەتی هەڵهاتین، نەمانتوانی کۆببینەوە و خۆمان سەرلەنوێ بۆ پەلامار ساز بدەینەوە. دەبێ لەو کاتەدا هەردووکمان بیرمان لە هەمان شت کردبێتەوە.

دواتر پیاوەکانی شازادە حەسەنی قەڵەو بێ ئەوەی زیانێکی زۆریان لێ بکەوێ، بە سەعاتێک سەنگەرەکەیان گرت. کاتێک خۆجە ئەمەی بیست، ویستی بە ئومێدێکی ترەوە، کە پێم وابێ منیش ئەمجارە زۆر بەباشی لێی حاڵی بووبووم، ئەو زانیارییە قووڵە بسەلمێنێ کە عەوداڵی بووبوو، بەڵام سەرلەبەری سەربازەکانی ناو سەنگەرەکە بە شمشێر لەت کرابوون. تەنانەت لەبن دیوارە ڕووخاو و ماڵە ئاگر تێبەربووەکانیشدا کەس بەدەم گیان کێشانەوە نەدەبیندرا. کاتێکیش ئەو کەللە سەرانەم بینی کە بەمەبەستی بردن بۆ بەردەم سوڵتان کۆکرابوونەوە، یەکسەر تێ

گەیشتم بیر لە چ دەکاتەوە. لەوەش زیاتر، ڕەواییم بە پەرۆشی و گەڕانی بەدوای زانستدا بەخشی، وەلێ ئیدی نەمدەویست زۆر چوونە پێشەوەی ببینم. پشتم تێ کرد، بەڵام دوای کەمێک خۆم بۆ ڕانەگیرا و سەیرێکم کرد. لە کەللە سەرەکان دوور دەکەوتەوە، هیچ کاتێکیش تێ نەگەیشتم تا چ ڕادەیەک لە نەخشەکانی ناو سەریدا چووەتە پێشێ.

نیوەڕۆ کاتێک گەڕاینەوە بۆ ناو کاروانی سوپا، گوتیان هێشتا دەست بەسەر قەڵای دۆپیۆدا نەگیراوە. سوڵتان بەتەواوی هەڵچووبوو، باسی سزادانی شازادە ساری حوسێنی کردبوو. گوتبووی بە هەموو سوپاوە بۆ ئەوێ دەچین! بە خۆجەی گوتبوو ئەگەر تا ئێوارە قەڵاکە نەگیرێ، ئەوا ئامێرەکەی ئێمە لە هێرشی سبەینێدا بەشدار دەبێ. لەو کاتەدا دەستووری دابوو لە ملی قۆماندانێک بدرێ، کە بەدرێژاییی ڕۆژێک نەیتوانیبوو دەست بەسەر سەنگەرێکی بچووکدا بگرێ. چەکەکەمان گەیشتبووەوە کاروانی سوپا. سوڵتان گوێی بە سەرنەکەوتنی چەکەکەمان لەبەرامبەر سەنگەرێکی بچووک، یاخۆ قسە و قسەڵۆکی لەمەڕ نەگبەتی چەکەکەمان نەدا. خۆجە ئیدی باسی وەرگرتنی بەشی خۆی لە سەرکەوتن نەدەکرد. نەیدەدرکاند، بەڵام دەمزانی بیر لە چی دەکاتەوە: کۆتاییی گەورەی ئەستێرەناسانی پێشوو؛ یان کاتێک من منداڵیی خۆم و ئاژەڵەکانی ناو کێڵگەکانی خۆمانم دەهێنایەوە بەرچاوم، دەمزانی هەمان شت بە خەیاڵی ئەویشدا تێپەڕ دەبێ. دەمزانی ئەویش بیر لەوە دەکاتەوە کەوا گەیشتنی هەواڵی سەرکەوتن لە قەڵاکەوە دواین بەختی ئێمەیە، بەڵام ڕاستییەکەی باوەڕی بەو بەختە نەبوو، بگرە نەیدەویست باوەڕی پێ هەبێ. من دەمزانی کڵێسایەکی بچووکی ئاگرتێبەربووی گوندێکی وێرانکراو کە قەڵاکەی دوای شەڕێکی دژوار گیراوە و پاڕانەوە و نزای دواتری قەشەی بوێریش هەستی ژیانێکی نوێی لەمەدا وروژاندووە. دەمزانی ئاوابوونی ڕۆژ لە پشت گردە بە دارستان داپۆشراوەکانی لای چەپمانەوە لە کاتی ڕەوتمان بەرەو باکور، وەک لە من، لەویشدا هەستی بێ کەموکوڕیی شتێکی دەخوڵقاند کە بە بێدەنگی و بەوردی لە قۆناغی پێگەیشتندا بوو.

دوای ڕۆژئاوابوون و دوای گەیشتنی هەواڵی ئەوەی نەک هەر شازادە ساری

حوسێن تێک شکاوە، بگرە زانینی ئەوەی کە ئۆتریشی و هەنگار و کازاکەکانیش بەهانای پۆلۆنییەکانەوە هاتوون بۆ قەڵای دۆپیۆ، قەڵاکە خۆیمان بینی. بەسەر گردێکی بەرزەوە بوو، سوورایی ڕۆژی بەر لە ئاوابوون لە چەند شوێنێکی قولله بە ئاڵا خەملێندراوەکانی دەدا. سپی بوو؛ سپی و جوان. نازانم لە چییەوە بوو بیرم بۆ ئەوە چوو کە مرۆڤ تەنیا لە خەوندا دەتوانێ شتێکی وا جوان و دانسقە ببینێ. لەو خەونەدا بە پەشۆکاوی دەتەوێ بە ڕێگایەکی پێچ و پەنای ناو دارستانێکی تاریکدا بگەیتە ڕووناکیی سەر گردەکە و ئەو باڵەخانە سپییە؛ وەک ئەوەی لەوێ ئاهەنگێک ساز بکرێ و تۆش بتەوێ ئامادەی بیت، یان کامەرانییەک هەبێ؛ بەڵام ئەو ڕێگایەی کە دەڵێی هەر ئێستا نا ئێستا کۆتاییی پێ دێ، هەر نابڕێتەوە و نابڕێتەوە. بیستم ڕووبارەکە لە تەختاییی نێوان دارستانە تاریکەکە و دامێنی قەدپاڵەکەدا زۆنگاوێکی بۆگەنی دروست کردووە، هێزەکانی پیادە گەرچی بە پشتیوانیی تۆپ توانیویانە خۆیانی بۆ شۆڕ بکەنەوە، بەڵام نەیانتوانیوە بگەنە قەدپاڵەکە. من کە بەمەم زانی، بیرم لەو ڕێیە دەکردەوە کە ئێمەی گەیاندبووە ئێرە. هەموو شتێک وەک قەڵا سپییەکە، کە باڵندەی بەسەردا دەفڕی و جۆری قەدپاڵە بەردینەکە، تا دەهات تاریکتر دادەگەڕا و وێنەی دارستانە بێدەنگ و تاریکەکە، بێ کێماسی دەینواند: دەمزانی زۆربەی ئەو شتانەی چەندین ساڵ بوو وەک ڕێککەوت بەسەرم هاتبوون، ئێستا ناچارین و دەمزانی سەربازەکانمان هەرگیز ناگەنە قولله سپییەکانی قەڵاکە و دەمزانی خۆجەش وەک من بیر دەکاتەوە. ئەگەر بەیانی دەستمان بە هێرش بکردایە، بۆی هەبوو چەکەکەمان لە زۆنگاوەکەدا نقوم بووایە و پیاوانی ناوی و دەوروبەری ڕووبەڕووی مەرگ بوونایەتەوە. پاشان بۆ ئەوەی قسە و باسی شوومی و نەگبەتی و ترسی سەربازەکان هێور بکەنەوە، داوایان دەکرد کەللەی سەرم فڕێ بدرێتە بەردەمیان و دەمزانی خۆجەش بەقەد من پێشبینیی ئەمەی کردبوو. هاتەوە بیرم چەندین ساڵ لەمەوبەر بەمەبەستی ئەوەی دنەی بدەم لە بارەی خۆیەوە بدوێ، باسی هاوڕێیەکی سەردەمی منداڵیی خۆم بۆی کردبوو کە خۆمان لەسەر هەمان کات بیرکردنەوە لە هەمان شت ڕاهێنابوو. هیچ گومانم نەبوو لەوەی هەمان شت بە خەیاڵی ئەویشدا تێپەڕی دەکرد.

درەنگانی شەو چووە چادری سوڵتان و ماوەیەکی زۆر تێ پەڕی و هەر نەگەڕایەوە. لەبەرئەوەی زۆر باش پێشبینیم دەکرد چی بە شازادەکان و بە سوڵتان، کە داوای لێکدانەوەی رووداوەکانی رۆژ و داهاتووی لێ دەکات، دەڵێ، لەپڕ وام بە خەیاڵدا هات هەر لەوێ کوشتویانەوە و وای بۆچووم پیاوکوژەکان دوای کەمێکی تر دەگەنە لای منیش. دواتر خەیاڵم چوو بۆ ئەوەی لە چادرەکە دەرچووبێ و بێ ئەوەی بە من بڵێ، راستەوخۆ بەرەو قەڵا سپییەکە، کە دیوارەکانی لە تاریکیدا دەدرەوشانەوە، چووبێ. وام هێنایە بەرچاوی خۆم لە ئێشککگر و زۆنگاو و دارستانەکە پەڕیوەتەوە و زۆر لەمێژە خۆی گەیاندووەتە وێندەرێ. خۆم زۆر تێک نەدا، لەو دەمەیدا چاوەڕێی رۆژی داهاتووم دەکرد و بیرم لە ژیانی نوێی خۆم دەکردەوە، هاتەوە. دوای ساڵانێکی زۆر و پاش گفتوگۆی درێژ و ورد لەگەڵ ئەوانەی ناو چادرەکەدا، زانیم خۆجە لە چادری سوڵتان هەمان ئەو شتانەی گوتبوو کە من پێشبینیم کردبوو. هیچی بۆم نەگێڕایەوە، وەک کەسێک کە لەسەر سەفەر بێ، پەلەپەلی بوو. گوتی تەمێکی چڕ دەرەوەی داگرتووە. من لە مەبەستی تێ گەیشتم.

تا تاریک و لێڵی دەمەوبەیان باسی ئەوەم بۆ کرد چۆن شتە لە پاش بەجێماوەکانی وڵاتەکەم و ماڵەکەم بدۆزێتەوە و کێ لە ئەمپۆلی و فلۆرنسا دەمانناسێ و باسی خووی دایکم و باوکم و خوشک و براکانم بۆ کرد. باسی هەندێ جیاوازیی بچووک و تایبەتم بۆ کرد کە مرۆڤگەل لە یەکتر جیا دەکەنەوە. بەدەم قسەکردنەوە بیرم کەوتەوە من پێشتر هەموو ئەم شتانەم بۆ گێڕاوەتەوە تەنانەت تا بە خاڵە گەورەکەی سەر پشتی برا بچووکەکەشم دەگات. گەلێک جار کاتێک ئەم بەسەرهاتانەم بۆ سوڵتان دەگێڕایەوە، یان لە کاتی نووسینەوەی ئەم کتێبەدا، وا هەستم دەکرد بەسەرهاتەکانم لە راستییەوە دوور بن و زادەی خەیاڵی خۆم بن، بەڵام ئەو کاتەی بۆ خۆجەم دەگێڕایەوە، بەتەواوی باوەڕم پێیان بوو. هەر بەڕاستیش خوشکەکەم لە کاتی قسەکردندا کەمێک زمانی دەیگرت. جلوبەرگیشمان کوژەکەی زۆری پێوە بوو. ئەو شتانەش راست بوون کە لەو پەنجەرەوەی بەسەر باخچەی پشتەوەی ماڵەکەمانیدا دەڕوانی، دەمبینی. دەمەوبەیانی هاتمە سەر ئەو باوەڕەی بۆیە کەوتوومەتە بەر جادووی ئەم بەسەرهاتانەم، چونکە پێم وابوو، ئەگەرچی درەنگیش بێ، رەنگە رۆژێک

لەو شوێنەی تیایدا ڕاوەستاون، دەست پێ بکەنەوە. دەمزانی خۆجەش بیر لەهەمان شت دەکاتەوە و بە خۆشحاڵییەوە باوەڕی بە بەسەرهاتی خۆی هەیە.

بێ پەلەپڕزێ و بێ ئەوەی یەک وشە قسە بکەین، جلوبەرگی خۆمان گۆڕییەوە. ئەنگوستیلە و مەدالیاکەی خۆمم، کە بەدرێژاییی چەندین ساڵ لە شاردنەوەیاندا لەبەر چاوی ئەو سەرکەوتبوو بووبووم، دایە دەستی. مەدالیاکەم وێنەی دایکی دایکم و پرچی لەخۆوە سپیبووی دەزگیرانەکەمی تێدا بوو. پێم وابێ بەدڵی بوو، لە ملی کرد. دوایی لە چادرەکە دەرچوو و ڕۆیشت. سەیری ونبوونی لەسەرخۆیم کرد لە ناو تەمە کپەکەدا. خەریک بوو دەوروبەر ڕووناک دەبووەوە و منیش زۆر خەوم دەهات، چوومە ناو جێگاکەی ئەوەوە و بە ئاسوودەیی لێی نووستم.

# 11

ئیدی وا گەیشتمە کۆتاییی کتێبەکەم. لەوانەیە خوێنەرە ئاوەزیاوەکانم ڕایان وابێ لەمێژە بەسەرهاتەکەم بەکۆتایی گەیشتووە و ڕەنگە تەنانەت کتێبەکەشیان فڕێ دابێتە لاوە. سەردەمانێک منیش بیرم لە هەمان شت دەکردەوە: ئەم لاپەڕانە، کە ساڵانێکی زۆر لەمەوبەر نووسیبوومن، بەنیازی ئەوەی جارێکی تر نەیانخوێنمەوە، فڕێم دابوونە گۆشەیەکەوە. ئەو سەردەمە نیازم وابوو هەموو هۆشی خۆم بدەمە کۆمەڵە چیرۆکێک کە بە زەوقەوە بۆ خۆم هۆنیبوومەوە، نەک بۆ سوڵتان: وەک چیرۆکی ئەو بازرگانەی بووبوو بە گورگ و تێکەڵ بە گەلەگورگ بووبوو؛ یاخۆ ئەو چیرۆکی ئەڤیندارییانەی لە بیابانی چۆڵی وڵاتانی هەرگیز نەدیوم و لە دارستانە تەزیوەکاندا دەقەوماند. دەمویست ئەم کتێبە و ئەم بەسەرهاتە لە بیر بکەم. دوای ئەو هەموو قسە و قسەڵۆکەی بەر گوێم کەوتبوو و ئەو گشت ڕووداوەی بەسەرم هاتبوو، گەرچی دەشمزانی کارێکی وا ئاسان نییە، خەریک بوو زۆر بەئاسانی ئەو ئامانجەم بپێکم. بەڵام بە قسەی میوانێک، کە دوو هەفتە لەمەوبەر بۆ دیدەنیم هاتبوو، فریوم خوارد و سەرلەنوێ کتێبەکەم هێنایە دەرەوە. ئەمڕۆ ئیدی دەزانم ئەمە خۆشەویستترین کتێبی منە و بڕیارم داوە وەک پێویست و وەک ئەوەی خۆم دەمەوێ و بەپێی خەون و خەیاڵی خۆم بە ئەنجامی بگەیەنم.

کاتێک بۆ بە ئەنجام گەیاندنی کتێبەکەم چوومە بەردەم مێزە کۆنەکەمان، نیگام کەوتە سەر ئاشێکی ناو دارزەیتوونە دوورەکان و بەلەمێکی بچووکم بینی لە جەنەتحیسارەوە بەرەو ئەستەنبوڵ دەچوو. لای خوارەوەی باخچەکەش بڕێک منداڵ

بە شادمانی لە ناو دارهەنجیرەکاندا گەمەیان دەکرد و ئەو ڕێگا تۆزاوییەم دەبینی کە لە ئەستەنبوڵەوە دەچووە گەبزە. لە بەفری زستاندا ڕێبواری زۆر بە ڕێگاکەدا ڕانابوورن، بەڵام بەهاران و هاوینان ئەو کاروانانەم دەبینی کە بەرەو ڕۆژهەڵات، بۆ ئەنادۆڵ و تا بەغدا و شام دەڕۆیشتن. هەرە زیاتر عەرەبانەی دوای گا، کە هێدی هێدی ڕێیان دەکرد، بەوێدا تێ دەپەڕین. هەندێ جاریش بە بینینی ئەسپسوارێک کە لە دوورەوە جلوبەرگیم بۆ نەدەناسرایەوە، ترپەی دڵم زیادی دەکرد. بەڵام کاتێک نزیک دەکەوتەوە، حاڵی دەبووم ڕێبوارەکە بۆ لای من نایەت. لەم دواییانەدا کەس نەدەهات، ئیدی دەشمزانی نایەن.

بەڵام گازندەشم نەدەکرد و باکم لە تەنیایی نەبوو: لەو ساڵانەی وەک گەورەی ئەستێرەناسان کارم کردبوو، پارەوپوولێکی زۆرم پێکەوە نابوو. ژنم هێنابوو و چوار منداڵم هەبوو. هەر زوو و لە کاتی گونجاودا دەستم لە کارەکەم هەڵگرت، چونکە پیشەکەم فێری کردبووم پێشوەخت هەست بەو کارەساتانە بکەم کە لەوانە بوو دواتر بەسەرم بێن. ماوەیەکی زۆر بەرلەوەی سوپای سوڵتان بەرەو ڤیەننا بەڕێ بکەوێ و لێبووکەکانی دەروربەری لەتاو ڕقی تێکشکان کەللەی گەورەی ئەستێرەناسانی دوای من بپەڕێنن و سوڵتانی ئالوودەی ئاژەڵ لە تەخت بهێننە خوارێ، من بۆ ئێرە، بۆ گەبزە، هەڵهاتم. ئەم خانووەم بە دروستکردن دا و لەگەڵ کتێبە خۆشەویستەکانم و منداڵەکانم و یەک دوو پیاوی خۆم تیایدا نیشتەجێ بووین. هاوسەرەکەم، کە ئەو کاتەی گەورەی ئەستێرەناسان بووم، خواستبووم، زۆر لە خۆم گەنجتر بوو. کەیبانوویەکی شارەزا بوو و گەلێک بە باشی سەری لە کاروباری ناوماڵ دەردەچوو و هەموو ئەرک و کاروباری بچووکی منی لە ئەستۆی خۆی گرتبوو. ئیدی تەمەنم خۆی لە حەفتا ساڵ دەدا و هاوسەرەکەم بەدرێژاییی ڕۆژ بەتەنیا لەم ژوورەدا بەجێمی دەهێشت بۆ ئەوەی داڵغە لێ بدەم و کتێب بنووسم. بەمجۆرە لەپێناوی دۆزینەوەی کۆتاییییەک بۆ بەسەرهاتەکەم و بۆ ژیانم، تێروپڕ و بە ئارەزووی دڵ بیر لە (ئەو) دەکەمەوە.

بەمەرجێک لە ساڵانی دەسپێکدا هەوڵم دەدا خۆم لەو بیرکردنەوەیە بپارێزم. سوڵتان یەک دوو جار ئارەزووی کردبوو باسی (ئەو) بکات، بەڵام بۆی دەرکەوتبوو

من بەهیچ جۆرێک پێم خۆش نییە خۆم لە قەرەی ئەو باسە بدەم. پێم وابوو ئەویش لەم هەڵوێستەم ڕازی بوو. ئەوەندە نەبێ دەیویست شتێکی بۆ ڕوون بێتەوە، بەڵام هەرگیز نەمتوانی بزانم دەیەوێ چی و تا چ ڕادەیەکی بۆ ڕوون ببێتەوە. هەر لە سەرەتاوە پێمی گوتبوو پێویست ناکات شەرم بکەم لەوەی کە (ئەو) کاریگەریی لەسەرم داناوە و شتی لێوە فێربووم. پێمی دەگوت: "من هەر لە سەرەتاوە دەمزانی هەموو ئەو کتێب و ساڵنامە و پێشبینیکردنانەی کە بەدرێژایی ئەو ساڵانە پێشکەش بە منت کردووە، لە نووسینی (ئەو) بووە. ئەو کاتەی تۆ خزابوویتە کونی ماڵەوە و سەرقاڵی پرۆژەی چەکەکەت بووی، من هەمان شتم بە (ئەو) دەگوت. دەشزانم هەروەک چۆن (ئەو) هەموو شتێکی بە تۆ و تۆش هەموو شتێکت بە (ئەو) گوتووە، ئەمەشی بۆت گێڕاوەتەوە." لەوانەیە لەو کاتەدا هێشتا هیچ کاممان سەری پەتەکەی لە دەست نەترازابێ، بەڵام هەستم دەکرد سوڵتان لەسەر زەمینێکی پتەوتر ڕاوەستاوە. ئەو کاتە سوڵتانم وا هاتە بەرچاو کە لە من ژیرترە و هەر شتێک بۆ زانین بشێ دەیزانێ و بۆ ئەوەی من بخاتە لەپی دەستیەوە، گەمەی دەکرد. لەوانەیە کاریگەریی خۆ بەقەرزاربار زانینیشم بەسەر ئەم هەڵوێستەمەوە هەبووبێ، چونکە سوڵتان منی لە دەست ئەو سەربازانە ڕزگار کرد کە بەهۆی تێکشکانمان لە زۆنگاوەکە و بەهۆی قسە و قسەڵۆکی شوومی و نەگبەتییەوە هار بووبوون و داوای پەڕاندنی کەللەی سەری منیان دەکرد. ئەگەر سوڵتان لە ساڵانی سەرەتا بە ڕاشکاوی پرسیاری بکردایە، لەوانەبوو هەموو شتێکی بۆ بگێڕمەوە، چونکە ئەو کاتانە هێشتا ورتەورتی لەمەڕ ئەوەی من من نیم، بڵاو نەبووبووەوە. دەمویست لەگەڵ کەسێک سەبارەت بە ڕووداو و پێشهاتەکان بدوێم. تاسەی (ئەو)م کردبوو.

بەتەنیا ژیان بەسەربردن لەو ماڵەی ساڵانێکی زۆرمان پێکەوە تێدا بەڕێ کردبوو، بێ ئۆقرەیی منی زیاتر دەکرد. گیرفانەکانم پڕ بوون لە پارە، لەو سەروبەندەدا بوو لاقەکانم لەسەر ڕۆیشتن بۆ بازاڕی بەدیل گیراوان ڕاهات. لە ئاکامدا بەلەنگازێکم کڕی کە نە بە (ئەو) و نە بە منی نەدەکرد و هێنامەوە بۆ ماڵ. شەو، کاتێک چوومە بەردەم ئاوێنەکە و داوام لێ کرد هەموو شتێکم فێر بکات و باسی وڵات و ڕابردووی خۆیم بۆ بکات و لەوەش زیاتر خراپەکارییەکانی خۆیم بۆ بگێڕێتەوە، لێم ترسا.

شەوێکی بەرباد بوو، بەزەییم بەو داماوەدا هاتەوە و بڕیارم دا سبەینێ ئازادی بکەم. بەڵام بەخیلی یەخەمی گرت، بۆیە بردمە بازاڕی دیلەکان و فرۆشتمەوە. دواتر بە گەڕەکدا بڵاوم کردەوە کەوا بڕیاری ژن هێنانم داوە. لەبەرئەوەی پێیان وابوو منیش دەبمە کەسێکی وەک ئەوان و ئاسوودەیی باڵ بەسەر گەڕەکدا دەکێشێ، بە شادمانییەوە هاتنە لام. منیش ڕازی بووم بچمە ڕیزی ئەوانەوە، گەشبین بووم، بیرم دەکردەوە قسە و قسەڵۆک کۆتاییی پێ دێ و ساڵانی ساڵ چیرۆک و بەسەرهات بۆ سوڵتانم دەهۆنمەوە و بە ئاسوودەیی دەژیم. ژنەکەم زۆر بەوردی هەڵبژارد. شەوانە عوودیشی بۆم دەژەند.

کاتێک واتەوات سەری هەڵدایەوە، سەرەتا پێم وابوو گەمەیەکی سوڵتانە، چونکە باوەڕم وابوو چێژ لەوە وەردەگرێ چاودێریی نیگەرانییەکانم بکات و بە پرسیارکردن تووشی سەرسوڕمانم بکات. دەسپێک، کاتێک کە لە خۆیەوە قسەی لە جۆری "ئایا خۆمان دەناسین؟ پێویستە مرۆڤ خۆی باش بناسێ"ی دەکرد، زۆر نیگەران نەدەبووم؛ چونکە دەمزانی لێبووکەکان دیسان دەوریان داوە و ئەو پرسیارە وەڕەسکەرانە لە لەوچەیەکی شەیدای فەلسەفەی یۆنانەوە فێر بووە. کاتێک منی ڕاسپارد شتێک لەو بارەیەوە بنووسم، نوێترین کتێبی خۆم پێشکەش کرد. کتێبەکە تایبەت بوو بە چیرۆکی ئەو کارمامز و چۆلەکانەی لەبەرئەوەی بیریان لە خۆیان نەدەکردەوە و لە خۆیان نەدەپرسی کێن، زۆر شادمان بوون. کاتێک بیستم کتێبەکەی بەهەند گرتووە و بەزەوقەوە خوێندوویەتیەوە، ئاهێکم بەبەردا هاتەوە، بەڵام هێشتا قسە و قسەڵۆکم بەر گوێ دەکەوتەوە: دەگوترا من سوڵتان بە گەمژە دەزانم، چونکە هیچ لەو کەسە ناچم کە شوێنیم گرتووەتەوە، گوایە (ئەو) لاواز و من قەڵەو بووم. کاتێک دەمگوت من ناتوانم هەموو شتەکانی (ئەو) بزانم، منیان بە درۆزن دەزانی و پێیان وابوو منیش ڕۆژێک لە گەرمەی شەڕێکدا دوای هێنانی نەگبەتی بەسەر سوپادا وەک (ئەو) هەڵدێم و نهێنییەکانی شەڕ بە دوژمن دەگەیەنم و ڕێ بۆ بەزینی سوپا خۆش دەکەم و هتد... بۆ خۆپاراستن لەم قسە و قسەڵۆکە کە پێم وابوو لە سوڵتانەوە سەرچاوەی دەگرت، پێم لە ئاهەنگ و بەزم و ڕەزم بڕی و زۆر لە نێواندا نەدەبینرام. لاواز بووم و بەوردی دوای ئەو بابەتانە کەوتم کە دوایین شەو لە چادری

سوڵتاندا باس کرابوون و هەموویم بۆ ڕوون بووەوە. ژنەکەم یەک بەدوای یەک منداڵی دەبوو. داهاتێکی باشم هەبوو، دەمویست قسە و قسەڵۆک و (ئەو) و ڕابردوو لە بیر بکەم و بە ئاسوودەیی درێژە بەکاری خۆم بدەم.

نزیکەی حەوت ساڵ خۆم بۆ ڕاگیرا. ئەگەر ئۆقرەم لێ نەبڕایە، یان ڕوونتر بڵێم ئەگەر پەیم بە خاوێنکردنەوەیەکی تری دەوروبەری سوڵتان نەبردایە، دەمتوانی تا کۆتایی بەردەوام بم، چونکە بەتێپەڕبوون بەو دەرگایانەی سوڵتان بۆمی خستبووە سەرپشت، ناسنامەی کۆنی خۆم سڕیبووەوە و دەمویست بەیەکجاری لە بیری خۆمی ببەمەوە. ئیدی بەشێوەیەکی بێ سەروبەر وەڵامی پرسیارەکانی تایبەت بە ناسنامەم دەدایەوە کە پێشتر منی نیگەران دەکرد: دەمگوت: "ئەوە کەی گرینگە مرۆڤ کێیە یان کێ نییە، گرینگ کار و کردەوەمانە." پێم وابێ سوڵتان لەم دەرگایەوە چووە دۆڵابی ئەقڵمەوە! داوای لێم کرد باسی ئەو وڵاتەی بۆ بکەم کە (ئەو) بۆی هەڵاتووە، باسی ئیتاڵیا. کاتێک دەمگوت زانیاریی ئەوتۆم نییە، ئەو هەڵدەچوو: "بە منی گوتووە هەموو شتێکی بۆ تۆ گێڕاوەتەوە، بۆچی دەترسی، قسەکانی (ئەو) بێنەوە بیری خۆت و هیچی دی." منیش ناچار باسی منداڵیی (ئەو) و یەک بەیەکی ئەو بیرەوەرییە جوانانەم بۆ سوڵتان ڕیز کرد کە بەشێکیشیم خستووەتە دووتوێی ئەم کتێبەوە. سەرەتا ئەوەندە ئۆقرەم لێ نەبڕابوو، سوڵتان بەجۆرێک گوێی لێم دەگرت وەک ئەوەی باسی کەسی سێیەمی بۆ بکەم. بەڵام ساڵانی دواتر زۆر چووە پێشەوە. ئیدی بەجۆرێک گوێی بۆ قسەکانم ڕادەگرت وەک ئەوەی گوێی بۆ (ئەو) ڕاگرتبێ: بەڵام کاتێک پرسیاری وردەکارییەکانی لای (ئەو)ی دەکرد، داوای لە من دەکرد نەترسم و ئەو وەڵامەی بدەمەوە کە لەو ساتەدا بە خەیاڵمدا دێ: "دوای کام ڕووداو خوشکەکەی تووشی قسە بزرکاندن بووبوو؟ بۆچی لە زانکۆی پادووا وەرنەگیرابوو؟ لە یەکەم نمایشی فیشەکبازیدا کە (ئەو) لە ڤینیسیا سەیری کردبوو، ڕەنگی جلی بەر براکەی چۆن بوو؟" ئەو کاتانەی ئەم وردەکارییانەم بەجۆرێک وەک ئەوەی بەسەر خۆم هاتبێ بۆ سوڵتان دەگێڕایەوە، یان پێکەوە بە بەلەم بە ئاوی دەریادا دەگەڕاین؛ یاخۆ بەدیار حەوزێکی گوڵڕەنگی پڕ لە بۆقەوە بووین؛ یان لەبەردەم قەفەسی زیوینی مەیموونە بێ ئابڕووەکاندا بووین؛ یاخۆ لە یەکێک لەو باخچانەدا بووین کە پڕ بوون لە بیرەوەریی

ئەو سەردەمانەی پێکەوە پیاسەمان تێدا دەکرد. ئەو کاتانە سوڵتان بە چیرۆکەکان و بە گەمەی پشکوتنی گوڵ لە باخچەی مێشکماندا خۆشحاڵ دەبوو، زیاتر لە من نزیک دەبووەوە و بەشێوەیەک باسی (ئەو)ی دەکرد وەک ئەوەی بەدوای دۆستێکی دێریندا بگەڕێ کە ناپاکیی لە هەردووکمان کردبێ: لەو کاتانەدا بوو گوتی: «باشی کرد هەڵهات، ئەگەر نا، سەرباری ئەوەی سەفای زۆری بۆم دەسازاند، زۆر بیرم لەوە کردبووەوە بەرگەی بێ ئابڕوویییەکەی نەگرم و ڕۆژێک دەستووری کوشتنی بدەم.» دواتر لەبەرئەوەی سەرم لێ دەرنەدەچوو کە باسی کاممان دەکات، چەند لێدوانێکی دا منی ترساند، بەڵام بەتوندی نا، بە بەزەییەوە قسەی دەکرد: ڕۆژی وا هەبووە ترسی ئەوەی هەبووە خۆی لەبەر نەزانیی (ئەو)دا بۆ ڕانەگیرێ و بڕیاری کوشتنی بدات و هێندەی نەماوە لە دواین شەودا بانگی پیاوکوژەکان بکات! پاشان گوتی: "تۆ بێ ئابڕوو نیت، خۆشت بە ژیرترین و بێتاوانترین مرۆڤی جیهان دانەناوە؛ کارەساتی پەتاکەشت لە بەرژەوەندیی خۆت لێک نەداوەتەوە. بە گێڕانەوەی چیرۆکی ئەو پاشا بچووکەی لەسەر مێخزنجیر دانرابوو، شەوانە خەوت لە چاوی کەس نەفڕاندووە. کەسیشت نەبووە دوای بیستنی خەونەکانی سوڵتان بۆ ماڵ ڕابکەیت و بەدەم گاڵتە پێکردنەوە بۆی بگێڕیتەوە. کەست نەبووە بۆ فریودانی سوڵتان چیرۆکی قۆڕ و پڕ لە بەزمی لەگەڵدا بنووسی!" کاتێک گوێم بۆ ئەم قسانە ڕادەگرت، بەترسەوە هەستم دەکرد خۆیشم و هەردووکمان، وەک لە خەوندا، لە دەرەوە دەبینم و سەری پەتەکەم لە دەست ترازاوە. بەڵام لە چەند مانگی ڕابردوودا سوڵتان وەک ئەوەی بیەوێ شێتم بکات، زیاتری دەگێڕایەوە: "تۆ لەو ناچی، وەک (ئەو) هەموو هۆشی خۆت نەداوەتە ئەو سۆفیگەرییەی کە ئێمە لە ئەوان جیا دەکاتەوە! ساڵانێکی زۆر لەمەوبەر کاتێک من هەشت ساڵان بووم و ئێوە هێشتا منتان نەناسیبوو، پێکەوە نمایشێکی فیشەکتان کرد و منیش لە کەناری ئەوبەرەوە سەیرم دەکرد. ئیبلیسەکەی تۆ کە هینەکەی (ئەو)ی لە تاریکاییی ئاسماندا بەسەرکەوتن گەیاند، ئێستا لەگەڵ (ئەو)دایە، لەگەڵ (ئەو)دا چووەتە وڵاتێک، کە پێی وایە ئاسوودەیی تێدا دەدۆزێتەوە!" دواتر لە میانەی گەڕانمان بەناو باخچەکاندا کە زوو زوو دووبارە دەبوونەوە، سوڵتان دەیپرسی: "ئایا مرۆڤ هەر دەبێ سوڵتان بێ بۆ ئەوەی بتوانێ

تێ بگات کە مرۆگەل لە هەموو جیهاندا لەیەک دەچن؟" بە ترسەوە بێدەنگ دەبووم. وەک ئەوەش بیەوێ دواین هێڵی بەرگریم بڕوخێنێ، دەیپرسی: "ئایا توانای مرۆڤ بۆ جێگرتنەوەی یەکدی باشترین بەڵگە نییە بۆ ئەوەی کە مرۆگەل هەموویان لەیەک دەچن؟" ئیدی بەوجۆرە کار لە کار ترازابوو.

پێ دەچوو بتوانم بە پشوودرێژیی خۆم بەرگەی هەموو ئەمانەم بگرم، چونکە ئومێدم وابوو ڕۆژێک دێ سوڵتانیش و منیش (ئەو) لە بیر خۆمان ببەینەوە و بیریشم لە پێکەوەنانی پارەی زیاتر دەکردەوە. ئیدی لەسەر ترسان لە ناڕوونی و لێڵی ڕاهاتبووم، بەڵام سوڵتان وەک ئەوەی بەسەر ئەسپەوە بەدوای کەروێشکێکدا غار بدەین و لە دارستانێکدا ڕێگامان ون کردبێ، زۆر بێ پەروایانە دەرگاکانی ئەقڵمی دەکردەوە و دایدەخست. لە هەمووشی خراپتر، ئەمەی بە بەرچاوی هەموانەوە دەکرد. دیسان هەمان ئەو لێبووکانە دەورەیان دابوو، لەبەرئەوەی پەیم بە نزیکبوونەوەی کارەسات و خاوێنکردنەوەیەکی نوێ و دەستگرتن بەسەر ماڵ و سامانی هەمووماندا بردبوو، ترسام. ئەو ڕۆژەی سوڵتان داوای لێم کرد لەبارەی پردەکانی ڤینیسیا، قردێلەی ڕازاوەی سەرپۆشی سەر ئەو مێزەی (ئەو) لە سەردەمی منداڵیی خۆیدا نانی بەیانیانی لەسەر دەخوارد، ئەو ساتەی بۆ ئەوەی ببێ بە موسڵمان، هێندەی نەمابوو سەری بپەڕێنرێ و ئەو دیمەنانەی لەو پەنجەرەیەوە دەیبینێ کە بەسەر باخچەی پشتەوەی ماڵەکەیاندا دەڕوانێ، قسەی بۆ بکەم و داوای لێم کرد هەمووی، وەک ئەوەی کتومت بەسەر خۆم هاتبێ، لە کتێبێکدا بنووسمەوە، بڕیارم دا بەزووترین کات لە ئەستەنبوڵ هەڵێم.

بەمەبەستی لە بیرکردنی (ئەو)، لە گەبزە لە ماڵێکی تر نیشتەجێ بووین. سەرەتا لەوە دەترسام پیاوانی کۆشک بێن و بمدەنە پێش خۆیان و بمبەن، بەڵام نەکەس بەدوامدا گەڕا و نە کەس لێمی پرسییەوە. کەسیش دەستی لە داهاتەکانم نەدا. یان لە بیر کرابووم، یاخۆ لە ژێر چاودێریی نهێنیی سوڵتاندا بووم. گوێم نەدایێ و درێژەم بە کارەکانم دا. ئەم خانووەم بە بنیاتنان دا و باخچەی پشتەوەم بە ئارەزووی خۆم و بەجۆرێک لە ئاستی وەڵامدانەوەی دەنگەکانی ناخمدا بێ، ڕازاندەوە. کاتی خۆم بە خوێندنەوەی کتێب و نووسینی چیرۆکی پڕ لە بەزم بۆ خۆشیی خۆم و لەگەڵ

ئەو میوانانەی کاتم بەسەر دەبرد، کە بەهۆی ئەوەی کۆنە گەورەی ئەستێرەناسان بووم، بۆ پرس و ڕاوێژ دەهاتە لام و کەمتر بۆ پارە و زیاتر بۆ بەزم و سەرگەرمیی خۆم گوێم بۆ چیرۆکەکانیان ڕادەگرت. دەتوانم بڵێم لەو ماوەیەدا بوو بە باشترین شێوە ئەو وڵاتەم ناسی کە منداڵیی خۆمم تێدا بەسەر بردبوو: کەمئەندامان، کەسانی داماوی کوڕ و برا لێ بزر بوو، نەخۆشانی بێچارە، باوکی کچانی لەماڵەوە ماو، ئەو گرگنانەی باڵایان هیچ زیادی نەدەکرد، پیاوانی دڵپیس، کوێر، بەلەموان و ئەڤیندرانی سەودا و سەرگەردان دەهاتنە کنم. منیش بەرلەوەی داهاتوویان بۆ بخوێنمەوە، بە دوورودرێژی گوێم بۆ بەسەرهاتی ژیانیان ڕادەگرت و لە دەفتەرێکدا دەمنووسینەوە بۆ ئەوەی کتومت وەک لەم کتێبەدا کردوومە، دواتر بیخەمە سەر چیرۆکەکانی خۆم.

هەر لەو ساڵانەشدا بوو ئەو پیاوە بەساڵاچووەم ناسی کە غەمێکی لەگەڵ خۆی بۆ ژوورەکەم هێنا. دەبێ دە یان پازدە ساڵ لە من بەتەمەنتر بووبێ. ناوی ئەولیا بوو. هەر کە غەمی سەر ڕوویم بینی، لەجێدا تێ گەیشتم کوشتەی دەستی تەنیاییە، بەڵام ئەو وای نەگوت: هەموو تەمەنی خۆی بۆ گەڕان و گەشتنامەیەکی دە بەرگی، کە لە تەواوبووندا بوو، تەرخان کردبوو. دەیویست بەرلەوەی ماڵئاوایی لە ژیان بکات، بچێتە مەکە و مەدینەی نزیکترین شوێن لە خوا و خوازیار بوو لە بارەی ئەو شوێنانەشەوە بنووسێ. بەڵام کێماسییەک لە کتێبەکەیدا هەبوو ئۆقرەی لێ بڕیبوو. بەنیاز بوو باسی ئیتاڵیاش، کە زۆری لەبارەی کانیاو و پردەکانیەوە بیستبوو، بۆ خوێنەرانی بگێڕێتەوە. ناوبانگی منی لە ئەستەنبوڵ بیستبوو و هاتبووە لام و پرسیاری لێم کرد داخۆ دەتوانم باسی ئەوێی بۆ بکەم؟ کاتێک پێم گوت من هەرگیز ئیتاڵیام نەبینیوە، بۆمی ڕوون کردەوە ئەویش وەک هەموو کەسێکی تر بەمە دەزانێ. ئەمجار گوتی بەڵام تۆ سەردەمانێک کۆیلەیەکی خەڵکی ئەو وڵاتەت هەبووە و هەموو شتێکی بۆت گێڕاوەتەوە. پێشنیازی کرد ئەگەر من ئەو شتانەی بۆ بگێڕمەوە، ئەویش چیرۆکی بەچێژم بۆ دەگێڕێتەوە. پێمی گوت مەگەر خۆشترین لایەنی ژیانت هۆنینەوە و گوێگرتن لە چیرۆکی بەتام و پڕ لە چێژ نییە؟ بە دوودڵییەوە نەخشەیەکی لە جانتاکەی دەرهێنا، خراپترین نەخشەی ئیتاڵیا بوو کە تا ئەو کاتە دیبێتم. بڕیارم

دا باسی ئیتاڵیای بۆ بکەم.

بە دەستی خرپنی، کە منداڵێکی دەهێنایەوە بیری مرۆڤ، ئاماژەی بۆ شارێکی سەر نەخشەکە کرد و دوای ئەوەی ناوەکەی بە حینجە خوێندەوە، بەوردی ئەو فانتازیایانەی منی تۆمار دەکرد کە لەبارەی شارەکەوە بۆم گێڕایەوە. بۆ هەر شارێکیش بەسەرهاتێکی دانسقە و پڕ لە سەمەرەی دەویست. بەوجۆرە، شەوێک تا بەیانی دانیشتین و لە سیازدە شەودا لە باکورەوە بۆ باشوور بە سێزدە شاری ئەو وڵاتەدا گەڕاین کە یەکەم جارم بوو لە ژیانمدا دەمبینی. پاشان کەشتییەک ئەوی لە سیسیلیاوە بۆ ئەستەنبوڵ هێنایەوە. ئەویش لە گێڕانەوەکانم ڕازی بوو و بڕیاری دا لە پاداشتی ئەوەدا دڵم خۆش بکات و باسی ونبوونی تەنافبازەکان لە ئاسمانی عەکادا، ئەو ژنەی قۆنیا کە فیلێکی بووبوو، گای شین و باڵداری قەراغی ڕووباری نیل، پشیلەی پەمەیی، قوولەی سەعاتی ڤیەنا، ددانەکانی پێشەوەی کە لەوێ بە دروستکردنی دابوو و بەدەم زەردەخەنەوە نیشانی منی دا، ئەشکەوتی قسەکەری کەنار دەریای ئازۆف و مێرووڵەی سووری ئەمەریکای بۆم کرد. ئەم بەسەرهاتانە، لەبەر هۆیەک کە نەمدەزانی چییە، غەمێکی سەیریان لە ناخمدا دەچاند و لە ناوەوە دەمویست بگریم. تەواوی سوورایی ڕۆژ لە ژوورەکەمی دابوو؛ کاتێک ئەولیا لێمی پرسی داخۆ منیش چیرۆک و بەسەرهاتی سەیروسەمەرەم لا دەست دەکەوێ یاخۆ نا، داوام لێ کرد خۆی و پیاوەکانی لای ئێمە ڕۆژ بکەنەوە، چونکە بەڕاستی دەمویست تووشی سەرسوڕمانی بکەم. پێم گوت چیرۆکێکم هەیە لەبارەی دوو کەس کە جێی یەکیان گرتووەتەوە و زۆرت پێ خۆش دەبێ.

شەو، دوای ئەوەی هەرکەس چووە ژووری خۆی و ئەو بێدەنگییەی هەردووکمان چاوەڕێی بووین، هاتە کایەوە، گەڕاینەوە بۆ ژوورەکە. بۆ یەکەمجار لەو کاتەدا پێشبینیی ئەم چیرۆکەم کرد کە ئێوە وا خەریکن لە خوێندنەوەی دەبنەوە! لەوە نەدەچوو چیرۆکەکەم دەستکرد بێ، وەک ئەوە وابوو کەسێکی تر بە نەرمی هەموو ئەو وشانەی بە گوێی مندا چرپاندبێ و ڕستەکان هێدی هێدی بەدوای یەکدا ڕیز بووبن: "لە ڤینیسیاوە بەرەو ناپۆلی دەچووین، کاتێک کەشتییەکانی تورک ڕێیان پێمان بڕی..."

درەنگانێکی دوای نیوەشەو، پاش کۆتایی هێنان بە بەسەرهاتەکەم، بێدەنگییەکی درێژ هاتە کایەوە. هەستم دەکرد میوانەکەم و خۆشم بیرمان لە (ئەو) دەکردەوە، بەڵام (ئەو)ێکی زۆر جیاواز لەوەی من لە سەری ئەولیادا بوو. هیچ گومانم نەبوو لەوەی کە لەو ساتەدا بیر لە ژیانی خۆی دەکاتەوە! منیش بە خەیاڵمدا هات ژیانی خۆم و (ئەو) و بەسەرهاتی خۆمم خۆش دەوێ. شانازیشم بە هەموو شتێکەوە دەکرد کە بەسەرم هاتبوو یان بە خەیاڵمدا هاتبوو. ئەو ژوورەی تیایدا دانیشتبووین، تژە بوو لە بیرەوەریی ئەو شتانەی سەردەمانێک دەمانویست بە ئەنجامی بگەیەنین. ئەو کاتە ڕاست و ڕەوان تێ گەیشتم ناتوانم (ئەو) لە بیر بکەم و ئەمەش تا کۆتایی ژیان ناشادم دەکات. ئیدی دەمزانی هەرگیز ناتوانم بەتەنیا بژیم. لەگەڵ گێڕانەوەی بەسەرهاتەکەمدا، تارماییی خێوێک، وەک ئەوەی بیەوێ هەردووکمان پەرۆش و نیگەران بکات، لە نیوەی شەودا باڵی بەسەر ژوورەکەدا کێشابوو. میوانەکەم لە بەرەبەیاندا دوای ئەوەی گوتی بەسەرهاتەکەمی خۆش ویستووە و دڵخۆشی کردم، ئەوەشی بۆ قسەکانی زیاد کرد کە چەند شتێک ڕەت دەکاتەوە. منیش، لەوانەیە بەمەبەستی ڕزگاربوونم لە بیرەوەریی تاڵی خۆم و برا جمکەکەم بووبێ، بەوردی گوێم بۆ ڕاگرت.

ئەو بە پێویستی زانی بەدوای شتە سەمەرە و سەرسوڕهێنەکانی وەک ئەوانەی ناو بەسەرهاتەکەمدا بگەڕێین. بەڵێ، ڕەنگە ئەمە تەنیا شتێک بێ لەبەرامبەر داهێزراویی وەڕەسکەری دنیادا لە دەستمان بێ. لەبەرئەوەی هەر لە سەردەمی منداڵی و ساڵانی خوێندنەوە پەی بەم شتە بردبێ، هیچ کاتێک بە خەیاڵیدا نەهاتووە ژیانی خۆی لە ناو چوار دیواردا بەسەر ببات. بۆیە سەرلەبەری ژیانی لە گەڕان و لە ڕێگاوبانە بێ کۆتاییەکاندا بەدوای کۆکردنەوەی بەسەرهاتدا بەسەر بردووە. پێی وابوو دەبێ لە دنیا، نەک لە ناخی خۆماندا، بەدوای شتی نامۆ و سەمەرەدا بگەڕێین و دەیگوت گەڕان بەدوای خۆمان و بیرکردنەوەی زۆر لە خۆمان، ناشادمان دەکات! پێی وابوو ئەمە هەمان شت بوو کە بەسەر مرۆڤەکانی ناو چیرۆکەکەی مندا هاتبوو و دەیگوت بۆیە قارەمانەکان بۆیان ناکرێ خۆیان بن و بەردەوام لە هەوڵی ئەوەدان ببن بە کەسێکی تر. دواترێ لێمی پرسی: "با وا دابنێین ڕووداوەکانی ناو ئەم بەسەرهاتە

ڕاستن، ئایا تۆ باوەڕ دەکەی ئەو مرۆڤانە، کە جێی یەکیان گرتووەتەوە، دەتوانن لە ژیانی نوێیاندا بەختەوەر بن؟" دوایی نازانم لەبەر چی بوو، بڕگەیەکی ناو بەسەرهاتەکەمی هێنایەوە بیرم: "پێویستە خۆمان بە ئومێدی لە جۆری ئەوەی کۆیلە ئیسپانییە قۆڵ پەڕێنراوەکە دڵخۆش نەکەین! ئەگەر نا، بە نووسینی بەردەوامی ئەو جۆرە بەسەرهاتانە و بە گەڕانی بەردەوام بەدوای شتە سەیروسەمەرەکان لە خۆماندا، دەبینین بووین بە کەسێکی تر. خوا خۆمان و خوێنەرانمان بنپارێزێ." ئەولیا نەیدەویست بیر لە دنیایەکی ترسناکی ئەوتۆ بکاتەوە کە تیایدا مرۆگەل بەردەوام باس لە خۆیان و سەیروسەمەرەی خۆیان بکەن و بەردەوام لە کتێب و بەسەرهاتەکانیشیاندا هەمان شت بگێڕنەوە.

بەڵام من دەمویست! بۆیە پاش ئەوەی ئەو پیاوە زەریفەی بە ڕۆژێک خۆشم ویست، لەگەڵ تاریک و ڕوونی بەیاندا پیاوەکانی کۆکردەوە و بەمەبەستی چوون بۆ مەکە وەک تیر بۆی دەرچوو، یەکسەر دانیشتم و کتێبەکەم نووسییەوە. هەتا لە دەستم هات شتی زۆرم لەمەڕ خۆم و لەمەڕ (ئەو)ی لە خۆم جیاوەبوو خستە سەر کتێبەکەم. ڕەنگە ئەمەم لەبەر باشتر وێناکردنی مرۆڤەکانی ئەو دنیا ترسناکە بووبێ کە ئەولیا باسی دەکرد. بەڵام ئەمڕۆ دوای خوێندنەوەی ئەم کتێبە، کە ماوەی شازدە ساڵ بوو فڕێم دابووەوە لاوە، تێ گەیشتم زۆرم لە دەست نەهاتووە. لەبەرئەوە داوای بووردن لەو خوێنەرانەم دەکەم کە حەز ناکەن مرۆڤ لە بارەی خۆیەوە بدوێ بەتایبەتیش کاتێک مرۆڤ دەکەوێتە بەر شەپۆلی بەهێزی هەستەکانی و ئەم لاپەڕەیە بۆ کتێبەکەم زیاد دەکەم:

(ئەو)م زۆر خۆش دەویست، وەک دیمەنی بێچارە و شێواوی خۆم کە لە خەونمدا دەمبینی، وەک نقومبوونم لە شەرم و هەڵچوون و تاوان و غەمی ئەو دیمەنەدا؛ وەک کەسێکی شەرمن لەبەردەم ئاژەڵێکی کێویدا کە بەدەم ئازارەوە مردار دەبێتەوە؛ وەک ئەوەی بە بێ ئابڕوویی کوڕەکەی خۆم هەڵچم؛ وەک ئەوەی خۆم بە قینێکی بوودەڵانە و شادییەکی گەمژانەوە بناسمەوە. زیاتریش بەمجۆرە خۆشم دەویست: کتومت چۆن ڕاهاتبووم وەک مێش و مەگەز دەست و قۆڵم لە خۆڕا بجووڵێنم؛ جۆری زانینی ئەو بیرۆکانەم کە هەموو ڕۆژێک دەکوژانەوە و بە دیواری ئەقڵمەوە دەنووسان؛ وێنەی

بۆنی بێ وێنەی ئەو هەڵمەی لە جەستەی شەکەتمەوە دەردەچوو؛ وەک ناسینی پرچی شێواوم؛ دەمی درێوم و دەستی پەمەییم کە پێنووسەکەی گرتووە. بەوجۆرە خۆشم دەویست، بۆیە کەس نەیتوانی فریوم بدات. دوای ئەوەی کتێبەکەم نووسی و بەنیازی لە بیرکردنی (ئەو) توورم هەڵدایە گۆشەیەکەوە، بەهیچ جۆرێک بە قسە و قسەڵۆک و گەمەی ئەوانەی ناوبانگی ئێمەیان بیستبوو و دەیانویست سوودی لێ وەربگرن، فریوم نەخوارد! کەسانێک هەبوون بەدەم سوێند خواردنەوە دەیانگوت: والییەک لە قاهیرە خستوویەتیە ژێر باڵی خۆیەوە و گەلاڵەی دروستکردنی چەکێکی نوێی پێ سپاردووە! لە کاتی تێکشکانمان لە ڤیەنا، (ئەو) لە ناو شاردا بووە و بۆ ئەوەی بەزووترین کات بە دۆرانمان بدات، ڕاوێژی پێشکەش بە دوژمنان کردووە! لە ئەدرنە لە جلوبەرگی سواڵکەردا بینراوە! خۆی لە شەڕێکی خاوەن پیشەکان هەڵقورتاندووە، لێفەدروویەکی بەر چەقۆ داوە و دوایی بێ سەروشوێن بووە! لە مزگەوتی گەڕەکێکی ناوچەیەکی دووردەستی ئەنادۆڵ پێشنوێژی دەکات! مووەقیتخانەیەکی کردووەتەوە! دەستی کردووە بە کۆکردنەوەی پارە بۆ قوللەی سەعات! بەدوای پەتاکەدا چووەتە ئیسپانیا و لەوێ بە کتێب نووسین دەوڵەمەند بووە! تەنانەت کەسانێک هەبوون دەیانگوت بەهۆی فێڵ و تەڵەکەبازیی سیاسیی (ئەو)ەوە بووە سوڵتان لە تەخت هێنراوەتە خوارێ! دەگوترا لە گوندەکانی سەلاڤ ئەوەندە گوێی لە دان پێداهێنانەکان گرت تا لە ئاکامدا بە ڕاستی گەیشت و ئێستا وەک قەشەیەکی ئەفسانەیی ئاماژەی بۆ دەکرێ و سەرقاڵی نووسینی کتێبی گوماناوی و بێ سەروبەرەیە! بە ئەنادۆڵدا دەسووڕێتەوە و دەڵێ سوڵتانە گەمژەکان لە تەخت دەهێنێتە خوارێ. دەستەیەکی داوەتە دوای خۆی کە بە فاڵگرتنەوە و شیعر چاوبەستی کردوون و منیشی بۆ لای خۆی بانگ کردووە! بەدرێژاییی ئەو شازدە ساڵە کە دەمویست (ئەو)ی تیادا لە بیر بکەم و خۆم بە مرۆڤە ترسناکەکانی داهاتوو و دنیای ترسناکەوە سەرقاڵ بکەم، بۆ چێژ وەرگرتن لە خەیاڵەکانم چیرۆکم نووسی و زۆر قسە و قسەڵۆکی لەوە زیاتریشم بیست، بەڵام بڕوام بە هیچیان نەکرد. نازانم، ئایا ئەوانی دیش هەستیان بەهەمان شت دەکرد: جاروبار کاتێک چوار دیوارەکەی پشت کەنداوی زێڕینمان لەیەکتر دەکرد بە زیندان، کاتێک بێهودە چاوەڕێی

بانگهێشتنی کۆشک یان سەرایەکمان دەکرد، کاتێک بەچێژەوە نەفرەتمان لەیەکتر دەکرد، کاتێک بەدەم نووسینەوەی لێکۆڵینەوەیەکی ترەوە بۆ سوڵتان، بەیەکتر پێ دەکەنین، لەپڕ هەردووکمان سەرنجمان لە وردەکارییەکی بچووکی ژیانی ڕۆژانە دەدا: سەگێکی تۆقیو کە بەیانیان دەمانبینی، ئەندازەی بیچم و ڕەنگی ڕیزی جلوبەرگی هەڵواسراوی سەر تەنافێکی نێوان دوو دار، یان هەڵەیەکی زمان کە هاوشێوەی ژیانی دەخستە ڕوو! ئێستا من لە هەموو شتێک زیاتر تاسەی ئەو شتانە دەکەم! بۆ ئەوەی جارێکی تر هەموو شتەکان لە خەیاڵی خۆمدا زیندوو بکەمەوە: شەوانی پەتاکە، سەردەمی منداڵیم لە ئەدرنە، ئەو ساتە جوانانەی لە باخچەکانی سوڵتاندا بەسەرمان بردبوو و ئەو لەرینەوەی لە کاتی بینینی ڕووی بێ ڕیشی (ئەو)دا لەبەردەم دەرگای والی هەستم پێ کرد، گەڕامەوە سەر کتێبی سێبەری خۆم. ئەو کتێبەی پێشبینیم کرد چەندین ساڵ، بگرە سەدان ساڵ دوای مردنم، لەوانەیە کەسێکی فزوولی لە کاتی خوێندنەوەیدا زیاتر پێشبینیی ژیانی خۆی بکات وەک لە ژیانی ئێمە. خۆ ئەگەر کەسیش نەیخوێنێتەوە، هیچ باکم نییە و لەم سۆنگەیەشەوەیە ناوی (ئەو)م، ئەگەر زۆر بە قووڵیش نەبێ، تێدا شاردووەتەوە و ناشتووە. هەموو کەسێ دەزانێ بۆ بەدەستهێنانەوەی ژیانی بەسەرچوو و خەیاڵەکانمان، پێویستمان بە پێشبینیکردنیان هەیە: من باوەڕم بە بەسەرهاتی خۆم هێنا!

بەوەسفکردنی ئەو ڕۆژەی بڕیارم دا بەئەنجامی بگەیەنم، کۆتایی بە کتێبەکەم دەهێنم: دوو هەفتە لەمەوبەر، دیسان چوومەوە بەردەم مێزەکەمان و هەوڵم دا پێشبینیی بەسەرهاتێکی تر بکەم. لەو کاتەدا ئەسپسوارێکم بینی لەلای ئەستەنبوڵەوە دەهات. ماوەیەک بوو کەس نەبوو هەواڵی (ئەو)م بۆ بێنێ. لەوانەیە لەبەرئەوە بووبێ زۆر وشک بووم لەگەڵیاندا. زۆر باوەڕیشم نەدەکرد لەمەودوا کەسی تر بێ، بەڵام کاتێک ئەو ڕێبوارە سەمەرە و عەبا لەبەر و چەتر بەدەستەم بینی، دەستبەجێ تێ گەیشتم بۆ لای من دێ. بەرلەوەی بچینە ژوورەکەم، گوێم لێ گرت. ئەگەر هێندەی (ئەو)یش نەبێ، بەهەمان هەڵەکانی ئەوەوە بە تورکی دەدوا. بەڵام هەر کە چووینە ژوورەکەم، یەکسەر وەری گێڕایە سەر ئیتاڵی. دوای ئەوەی بینی چارەم دا بە یەکدا و هیچ وەڵامم نەدایەوە، بە تورکییە خراپەکەی خۆی گوتی وای زانیوە هەر هیچ نەبێ من کەمێک ئیتاڵی دەزانم. دواتر دەستی بە گێڕانەوە کرد: ناوی منی

له (ئەو)ەوە بیستووە. (ئەو) دوای گەڕانەوەی بۆ وڵاتەکەی، کتێبێکی ئەستووری لەبارەی ئەو بەسەرهاتە لە ئەقڵ بەدەرانەی لە ناو تورکاندا بەسەری هاتووە و دەربارەی دواین سوڵتانی ئاژەڵدۆستی تورک و خەونەکانی و لەبارەی تورک و پەتا و کۆشک و ڕێساکانی شەڕی تورکان نووسیوە. لەبەرئەوەی ماوەیەکە پەرۆشییەکی پڕ لە ئەفسووس بۆ ناسینی ڕۆژهەڵات لە ناو چینی ئۆرۆستراکتەکان و بەتایبەتیش لە نێوان خاتووناندا تەشەنەی کردووە، بە گەرمی پێشوازی لە نووسینەکانی دەکرێ. کتێبەکانی زۆر دەخوێندرێنەوە و لە ئەکادیمیاکان دەرس دەڵێتەوە و زۆر دەوڵەمەند بووە. لەوەش زیاتر، دەزگیرانە کۆنەکەی شەیدای نووسینەکانی بووە و بێ گوێدانە تەمەنی، لە پیاوەکەی جیابووەتەوە و لەگەڵ (ئەو) زەماوەندی کردووە. خانووی دابەشکراو و فرۆشراوی خێزانی سەرلەنوێ کڕیوەتەوە و تیایدا گیرساونەتەوە، ماڵەکە و باخچەکەیان هێناوەتەوە دۆخی جاران. میوانەکەم هەموو ئەم شتانەی دەزانی، چونکە لەبەرئەوەی شەیدای کتێبەکانی بووە، لە ماڵەوە سەری لێ داوە. (ئەو) زۆر نەرم و نیان بووە، ڕۆژێکی تەواوی بۆ میوانەکەم تەرخان کردووە و وەڵامی پرسیارەکانی داوەتەوە و جارێکی تریش بەسەرهاتەکانی ناو کتێبەکانی بۆ گێڕاوەتەوە. هەر لەو کاتە دوورودرێژ باسی منی کردووە. کتێبێکی بە ناوونیشانی "تورکێک، کە لە نزیکەوە دەمناسی"، دەربارەی من نووسیوە. پشت ئەستوور بە لێکدانەوەی زیرەکانەی خۆی بۆ تایبەتمەندییەکانی تاکی تورک، سەرلەبەری ژیانی منی هەر لە سەردەمی منداڵیمەوە لە ئەدرنە تا ڕۆژی جیابوونەوەی (ئەو) خستووەتە دووتوێی کتێبەکەیەوە و لەوەدایە بیخاتە بەردەستی خوێنەرانی فزوولیی ئیتاڵی. میوانەکەم گوتی: "ئای کە بەڕێزتان چەندە باسی خۆتان بۆ (ئەو) گێڕاوەتەوە!" پاشان بۆ ئەوەی تووشی سەرسوڕمانم بکات، هەندێ وردەکاریی چەند لاپەڕەیەکی کتێبەکەی بیر کەوتەوە کە خوێندبوویەوە: لە کاتی منداڵیمدا، دوای ئەوەی بێ بەزەییانە لە هاوڕێیەکی گەڕەکی خۆمانم داوە، لەبەر ئەو ڕەفتارەم شەرمم بەخۆمدا هاتووەتەوە و بە غەمگینی گریاوم. زۆر ژیرم و لە ماوەی شەش مانگدا هەموو ئەو زانستی گەردووناسییەم هەرس کردووە کە (ئەو) فێری کردووم. خوشکەکەم زۆر خۆش دەوێ و پابەندی ئاینی خۆمم و سەرم بچێ، نوێژم ناچێ. شەیدای مورەبای گێلاس و خولیای تایبەتیم بۆ لێفەدرووی هەیە کە پیشەی باوەپیاوەکەم بووە. لەبەرئەوەی دەمزانی لەگەڵ ئەو گەمژەیەدا بە ساردی هەڵسوکەوت ناکەم و بۆم ڕوون

بووبووەوە شـەیدای کـەسـانی لەو جـۆرەیە، دوای ئەو هەمـوو بایەخـەی بە منی دا، ژووربەژووری مـاڵەکەم نیشـان دا. پاشـان گەمـەی منداڵە وردەکانم و هـاوڕێکانم لە باخـچەکە سـەرنجی ڕاکێشا؛ نـەک تەنیا ڕێسـاکانی وازیی هەلووکێن، بگرە لە دەمی منداڵەکانەوە ڕێوشـوێنی گەمـەکانی چاوشـارکێ و باباتونا و یاریی کـەری درێژ، کـە من هیـچ حەزم لـێ نەدەکـرد، لە دەفـتـەرێکدا تۆمـار کـرد. لەو کـاتەدا بوو گـوتی کـە یەکێکە لە دۆسـتانی تورک. لەبـەرئەوەی هیـچی ترمان نەمـابوو بیکەین، دوای نیـوەڕۆ باخـچەکەمـان و گەبزە و ئەو مـاڵەم نیشـانی دا کـە لەگـەڵ (ئەو) سـاڵانێکی درێژمـان تێـدا بەسـەر بردبوو. ئەو هەمـان شـتی دووبارە دەکـردەوە. پـەرۆشی بینینی ژێرزەمینەکەمان بوو. بەدەم هـەنگاونانی وردەوە بەنێوان کوپەی مورەبا و ترشیات و گۆزەی ڕۆنی زەیتوون و سرکەدا، نیگای کەوتە سەر نیگایەکی بۆیەی زەیتیی خۆم کە نیگارکێشێکی ڤینیسیایی بۆمی کێشابوو، کەمێکی تر چووە پێشەوە و دانی پیادا نا کـە ئەو دۆسـتێکی ڕاسـتەقینەی تورکـان نییـە و وەک ئەوەی پەردە لەسـەر نـهێنیی ئەوەی زۆر شـتی دزێوی لەسـەر تورک نووسـیوە، هەڵبـماڵێ، گـوتی: (ئەو) دەنووسێ ئیـدی کـەوتووینـەتە لێـژی و وەک ئەوەی باسـی کـۆنە دۆلابێکی پڕ لە پیس و پۆخـڵی بکات، بەوجـۆرە لە بارەی شـتـەکانی نـاو مێشـکمانەوە دەدوێ. دەڵێ نـەمانتوانیـوە خـۆمـان چاک بکەین، بۆ خـۆ قـورتارکردن، جگە لە ملکەچکردن لەبەرامـبەر ئەوان‌دا، هیچ چارێکی ترمـان نییـە. دوای ئەوەش جگە لە لاسـاییکردنەوەی ئەوانـەی ملمـان بۆیان کەچ کردووە تا ماوەی سەدان سـاڵ، هیچی ترمان لە دەست نایەت. بۆ ئەوەی زۆر درێژەی پێ نەدا، گـوتم: "بەڵام (ئەو) دەیویست ئێمـە ڕزگار بکات." مـیوانەکەم یەکسـەر گوتی: "بەڵێ، بۆ ئەو مـەبەستە چەکێکیشی دروست کردووە، بەڵام ئێوە لێی تێ نـەگـەیشـتـوون. ئامـێـرەکـە، لە بەیانیـیـەکی تـەمـاویدا، وەک چۆن با و تۆفـان کـەشـتـیـیـەکی ترسناکی چەتەی دەریا فـڕێ دەداتە نـاو بەردەوە، چەقـیـوە و لە زۆنگاوێکی نامۆدا بەجێ ماوە." درێژەی دایێ و گوتی: "بەڵێ، (ئەو) زۆر، هەر زۆر لە غـەمی ڕزگـارکـردنی ئێـوەدا بووە، بەڵام ئەمـە واتای ئەوە ناگـەیەنێ کـە (ئەو) لە ڕەفـتـاری ئیـبلیـسـیـیـانە بەری بێ. هـەمـوو داناکـان هەر وابوون!" نیگارەکـەمی بەدەسـتـەوە گـرت و لە نزیکەوە و وردتر سـەیری کـرد. لـەبەر خـۆیەوە چـەند شـتـێکی گوت: "ئەگەر بە دیلی نەکەوتایەتە دەست ئێوە و ژیانی خۆی لە وڵاتی ئێوەدا بەسـەر نەبردایە، ئەوا (ئەو) تەنانەت دەیتوانی ببێ بە لیۆناردۆی سەدەی حەڤدەیەم." دواتر

جارێکی دی گەڕایەوە سەر بابەتی خراپەکاری کە دیار بوو زۆری حەز لێ دەکرد. یەک دوو قسەڵۆکی قرێژی تایبەت بە پارەی بۆم گێڕایەوە کە لەبارەی (ئەو)ەوە دەماودەم دەکات و ئەم بە باشی لە بیری نەماوە. دواترێ گوتی: "سەیر ئەوەیە بەڕێزتان هیچ نەکەوتوونەتە ژێر کاریگەریی (ئەو)ەوە!" دوای ئەوەی منی ناسی و خۆشی ویستم، سەرسوڕمانی خۆی دەربڕی: "من تێ ناگەم چۆن دوو مرۆڤ ئەو هەموو ساڵە پێکەوە ژیاون، ئەوەندە کەم لەیەک دەچن؟" ترسی ئەوەم بوو داوای وێنەکەم لێ بکات، بەڵام نەیویست و لە شوێنی خۆی دایناوە. پاشان پرسی: "ئایا دەتوانم لێفەکانیش ببینم؟" من بە نیگای خاڵییەوە گوتم: "کام لێفانە؟" ئەو بە پەشۆکانەوە پرسی: "مەگەر کاتی بێکاریی خۆت بە لێفەدوورینەوە بەسەر نابەیت؟" لەو کاتەدا بوو بڕیارم دا ئەو کتێبەی نیشان بدەم کە شازدە ساڵ بوو دەستم بۆی نەبردبوو.

زۆر شڵەژا، ڕوونی کردەوە کە دەتوانێ تورکی بخوێنێتەوە و گوتی زۆر پەرۆشی هەر کتێبێکە لەبارەی (ئەو)ەوە بێ. چووینە ژووری کارەکەم کە لەسەرەوە بوو و بەسەر باخچەی پشتەوەیدا دەڕوانی. لەبەردەم مێزەکەماندا دانیشت. دوای شازدە ساڵ، وەک ئەوەی دوێنێ لەوێم دانابێ، کتێبەکەم لەو شوێنەدا دۆزییەوە کە لێم فڕێ دابوو. کردمەوە و لە بەردەمیدا دامنا. گەرچی لەسەرخۆش بووایە، دەیتوانی تورکی بخوێنێتەوە. بەهەمان شێوەی ئەوەی لە هەموو گەڕیدەکاندا بینیبووم و منی کەللەیی دەکرد، ئەویش بەنیازی بەدەستهێنانی کەمێک سەرسوڕمان، بێ ئەوەی لە جیهانی ساغڵەم و بەمتمانەی خۆی جودا بێتەوە، لە کتێبەکەمدا نقوم بوو. بەتەنیا جێم هێشت و چوومە باخچەکە. لە سەر کورسییەکی حەسیر لە شوێنێک کە ئەوم لە پەنجەرە کراوەکەوە لێوە دیار بوو، دانیشتم. دەسپێک دڵخۆش بوو، لە پەنجەرەکەوە بانگی کرد: "هەر زۆر ئاشکرایە پێتان نەناوەتە سەر خاکی ئیتاڵیا!" بەڵام دواتر منی لە بیر چوو. ماوەی سێ سەعات لە باخچەکەدا دانیشتم و چاوەڕێم کرد تا لە خوێندنەوەی کتێبەکە بووەوە. جاروبار بە تیلەی چاو سەیرێکم دەکرد. دوای خوێندنەوەی، لە هەمووی تێ گەیشتبوو و نیشانەی سەرسوڕمان بەڕوویەوە دیار بوو، بەدەمی پڕ لە هاوارەوە یەک دوو جار ناوی قەڵای سپیی پشت ئەو زۆنگاوەی گوتەوە کە چەکەکەمانی هەڵلووشیبوو. چەند جارێکیش، بێ ئەوەی پێویست بکات، بە ئیتاڵی لەگەڵمدا دوا. پاشان بەمەبەستی هەرسکردنی سەرسوڕمانی خۆی و ئەو

شتانەی خوێندبوویەوە و بۆ ئەوەی ماندوویی بحەسێتەوە، ڕووی لە پەنجەرەکە کرد و بە نیگای خاڵییەوە بۆ دەرەوەی ڕوانی. بەخۆشحاڵییەوە دەمبینی، وەک ئەوەی مرۆڤ بەردەوام لە سەرەتاکانی دۆخی لەو جۆرانەدا دەیکات، ئەویش نیگای بڕیبوە خاڵێکی بێکۆتایی لە بۆشاییدا و سەیری چەقێکی نەبووی دەکرد. بەڵام دواتر، وەک منیش چاوەڕێم دەکرد، بینی: ئەمجار سەیری ئەو شتانەی دەکرد کە لە چوارچێوەی پەنجەرەکەوە لێوەی دیار بوو. نەخێر، خوێنەرە ژیرەکانم حاڵی بوون. میوانەکەم هێندە گەمژە نەبوو جۆری ئەوەی من بۆی چووبووم. وەک چاوەڕێم دەکرد، بە پەرۆشەوە دەستی کردە هەڵدانەوەی لاپەڕەکانی کتێبەکەم و دەگەڕا. منیش بەجۆشەوە چاوەڕێ بووم بیدۆزێتەوە. لە ئاکامدا، ئەوەی بۆی دەگەڕا، دۆزییەوە و خوێندیەوە. پاشان، جارێکی تر سەیری ئەو شتانەی کرد کە لە پەنجەرەی سەر باخچەی پشتەوەیماڵەکەمەوە دەبیندرا. بێگومان زۆر باش دەمزانی چی دەبینێ:

خۆخ و گێلاس لەسەر سینییەکی گەوهەرڕێژی سەر مێزێک داندرابوون، لە پشت مێزەکەوە کورسییەکی لە حەسیر چندراو هەبوو. چەند سەرینێکی پەڕی باڵندەش، کە لە هەمان ڕەنگی سەوزی چوارچێوەی پەنجەرەکە بوون، لەسەر کورسییەکە داندرابوون. منیش، کە تەمەنم دابووی لە حەفتا، لەوێ دانیشتبووم. لە دواتریش، ئەستێرکێکی ژێر بڕێک دارزەیتوون و گێلاسی دەبینی کە چۆلەکەیەک بە قەراغیەوە نیشتبووەوە. جۆلانەیەکیش، کە بەلقێکی بەرزی دارگوێزێکی دوای ئەوانەوە هەڵواسرابوو، هێدی هێدی بە بایەکی نادیار لەرەی دەکرد.

١٩٨٥-١٩٨٤

کۆتایی

# فەرهەنگۆک

ئالماگاست:

کتێبی المجسطی، ناوە ڕاستەقینەکەی بە یۆنانی (ماتماتیکا سینتاکسیس)ە و واتای نامەی بیرکاری دەگەیەنێ. ئەم کتێبە لەبارەی گەردوون و بیرکارییەوەیە و زانای یۆنانی پەتلیمۆس لە ساڵی ١٤٨ی زاینی لە ئەسکەندەرییەی میسر نووسیویەتی. "حنین بن إسحاق" لە یۆنانییەوە وەری گێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی و لە عەرەبیشەوە کراوە بە لاتینی و لە لاتینیشەوە بۆ زمانە ئەوروپییەکانی تر وەرگێڕدراوە. ناوی کتێبەکە لە زمانە ئەوروپییەکاندا بە ناوە عەرەبییەکەی (المجسطی – ئالماگاست) ڕۆیشتووە.

ئازتیەک:

ئیمپراتۆریەتێکی کۆنی پارزەمینی ئەمەریکایە کە لەنێوان سەدەکانی چواردەیەم و شازدەیەمی زاینیدا لە مەکسیکی ئەمڕۆ فەرمانڕەوایی کردووە.

ئەمپۆلی:

شارێکی ئیتاڵیایە دەکەوێتە سنووری پارێزگای فلۆرنساوە لە هەرێمی تۆسکانا و لە دەشتێکی قەراغ ڕووباری ئارنۆدا بنیات نراوە. ئەمپۆلی لەم چاخەدا بە پیشەسازیی مۆبیلیا و خواردەمەنی و چنین و ڕستن و شووشە بەناوبانگە.

ئەیاسۆفیا:

لە ڕابردوودا کلێسا و مزگەوت و ئێستا مۆزەخانەیەکی بەناوبانگە لە ئەستەنبوڵ و بە نموونەی بیناسازیی بێزەنتی دادەنرێ. ساڵی ٥٢٣ی زاینی بە فەرمانی ئیمپراتۆری بێزەنتی جەستنیان و لەژێر چاودێریی ئەودا بیناکراوە و ماوەی هەزار ساڵی ڕەبەق خزمەتی بە ئاینی مەسیحی کردووە. عوسمانییەکان، ساڵی ١٤٥٣ی زاینی قوستەنتینیەیان داگیر کرد و کلێساکەیان کرد بە مزگەوت. مستەفا کەمال ئەتاتورکیش لە چارەکی یەکەمی سەدەی ڕابردوودا کردی بە مۆزەخانە.

باباتونا:

گەمەی بازدانی منداڵان بەسەر پشتی یەکتردا.

بۆزا:

خواردنەوەیەکی خەست و ساردی زستانەیە لە گەنمەشامیی هاڕاو دروست دەکرێ.

بۆزجائادا:

سێیەمین گەورەترین دوورگەی تورکیایە لە دەریای ئیجەدا و ڕووبەرەکەی ٤٢ کیلۆمەتری چوارگۆشەیە. ئەم دوورگەیە بەشێک بوو لە خاکی یۆنان، بەڵام ساڵی ١٩٢٣ لە چوارچێوەی پەیمانی لۆزاندا خرایە سەر تورکیا و ئێستا سەر بە پارێزگای چاناکالایە.

بۆکاچیۆ:

نووسەر و شاعیر Giovanni Boccaccio، ١٣١٣- ١٣٧٥ ز، یەکێکە لە دیارترین ناوەکانی ئەدەبیاتی ئیتاڵی. ئەمیش وەک دانتێ ڕۆڵێکی گرینگی لە پێشخستنی زمانی ئیتاڵیدا هەبووە و یەکێک بووە لە داکۆکیکەران لە هیومانیزم لە سەردەمی ڕوێنەسانس. بە قسەی خۆی لە حەوت ساڵییەوە دەستی بەچیرۆک نووسین کردووە و لە ژیاندا شەیدای گەشتەوەری و لێکۆڵینەوەی ئەدەبی و نیگارکێشی و تێگەیشتن لە باری دەروونیی مرۆڤ بووە. دەکامیرۆن یەکێکە لە بەناوبانگترین بەرهەمەکانی بۆکاچیۆ.

پاڤوریا:

جۆرێکە لە قرژاڵی دەریایی.

پەتلیمۆس:

کلاودیۆس پتولیمایۆس ٩٠-١٦٨ ز. بە پەتلیموس ناسراوە و زانایەکی بیرکاری و جوگرافی و گەردوونناس و ئەستێرەناسێکی یۆنانییە. بڕوا دەکرێ لە نزیک ئەسکەندەرییەی میسری سەردەمی ڕۆمانی لە دایک بووبێ. خاوەنی چەندین لێکۆڵینەوەی زانستییە گرینگترینیان برێتییە لە کتێبی المجسطي-ئالماگاست.

توکیدیدەس:

Thukidides، دەوروبەری ٤٦٥ پ. ز- ٣٩٥ پ. ز، مێژوونووسێکی یۆنانییە و نەوەی یەکێک لەو خێزانە گەورانەیە کە سامانی زێڕی تراقیایان لە ژێر دەستدا بووە. ڕێبازێکی نوێی بۆ نووسینەوەی مێژوو داهێناوە و هەوڵی داوە پەند لە شەڕ و

ڕووداوەکان دەربهێنێ. دەستی لە نووسینەوەی داستان و ئەفسانەی دەستێوەردانی خواکان لە کاروباری مرۆڤ هەڵگرتووە و تەنیا ڕووداوە ڕاستەقینەکانی تۆمار کردووە. بەوە ناسراوە لە نووسینەوەی مێژووی شەڕەکانی سەردەمی ژیانی خۆیدا زمانێکی کاریگەری بەکارهێناوە.

تونجا:

ڕووبارێکە لە بولگارستان هەڵدەقووڵێ و لە تورکیا دەڕژێتە دەریاوە.

تەنگەی بوسفۆر:

Bogaz، ئەو ڕێگا ئاوییەیە کە دەریای ڕەش و دەریای مەڕمەڕە پێکەوە گرێ دەدات و ئەستەنبوڵ بەسەر دوو بەشی بەشی ڕۆمیی (ئەوروپا) و ئەنادۆل (ئاسیا)دا دابەش دەکات.

دانووب:

ڕووباری دانووب یان دۆناو درێژترین ڕووباری ناو سنووری یەکێتیی ئەوروپا و دوای ڕووباری ئۆلگا، دووەمین درێژترینی ڕووباری پارزەمینی ئەوروپایە. بە ڕووباری پایەتەختان بەناوبانگە، چونکە بە شارەکانی ڤیەنا، براتیسلاڤا، بودابست و بەلگرادا تێ دەپەڕێ. درێژییەکەی ٢٨٥٠ کیلۆمەترە و دوای تێپەڕبوونی بە هەشت وڵاتدا، دەڕژێتە دەریای ڕەشەوە.

دەریای ئازاک:

دەریایەکە دەکەوێتە باکوری ڕۆژهەڵاتی دەریای ڕەشەوە. ڕووبەرەکەی ٣٧٧٠٠ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە و تەنگەی کەرچ و دەریای ڕەش بەیەک دەگەیەنێ.

پادوا:

یەکێکە لە شارە هەرە کۆنەکانی ئیتاڵیا. پایەتەختی هەرێمی پادوایە و بەدووریی ٣٠ کیلۆمەتر لە ڕۆژئاوای ڤینیسیاوە هەڵکەوتووە.

فلاندەرستان:

برێتییە لە بەشی فلامەنی بەلجیکا.

قەرەگوێز و هاجیڤات:

دوو ئەکتەری سەرەکیی گەمەی بووکەشووشەی تورکین.

قولەدیبی:

گەڕەکێکی زۆر کۆنی ئەستەنبوڵە.

کارپات:

ناوچەیەکی شاخاوییە لە ناوەڕاست و ڕۆژهەڵات و باشووری ڕۆژهەڵاتی ئەوروپا. لای براتیسلاڤا و ڤیەناوە دەست پێ دەکات و لە نزیک ڕووبارەکانی مۆراڤا و نیشاڤا و تیمبۆک لە ڕۆژهەڵاتی سربستان کۆتایی پێ دێ. بەرزترین زنجیرە چیای ناوچەی کارپات چیای تاترایە کە دەکەوێتە پۆڵۆنیا و سلۆڤاکیایەوە و لە بەرزترین شوێنیدا ٢٦٥٥ مەتر لە ڕووی دەریاوە بەرزە.

کۆرتێز:

هێرنان کۆرتێزی ئیسپانی ١٤٨٥– ١٥٤٧. لە تەمەنی نۆزدە ساڵیدا ئیسپانیای بەجێهێشتووە و بەنیازی گەڕان بەدوای سامانداا ڕووی لە ئەمەریکا کردووە. لە ئاکامدا لەگەڵ سوپای ئیسپانیدا خۆی گەیاندووەتە سەرزەمینی ئازتیکەکان و دەستی هەبووە لە ڕووخاندنیدا.

کۆسمۆگرافی:

بریتییە لە زانستی وەسپکردنی زەوی و گەردوون. لە دوو وشەی یۆنانی: کۆسمۆس – زەوی و گرافی – وەسفکردن، پێک دێ.

کەنداوی زێڕین:

Haliç، کەنداوێکی بچووکی ئەستەنبوڵە و لەگەڵ دەریای مەرمەڕەدا نیمچە دوورگەیەک پێک دێنێ. لە سەردەمی ئیمپراتۆریەتی بێزەنتەدا ناوەندی هێزی دەریایی ئیمپراتۆریەت بووە. لەم ڕۆژگارەدا سێ پردی هاچەرخ ئەمبەر و ئەوبەری کەنداوی زێڕین، گالەتا و ئەمینوێنو، بەیەک دەگەیەنن.

گۆتیک:

شێوازێکی بیناسازیی ئەوروپییە کە دەسپێکی سەرهەڵدانی بۆ سەدەکانی ناوەڕاست دەگەڕێتەوە. وشەکە لە ناوی هۆزەکانی گۆتیی ئەڵمانییەوە دێ کە لە سەدەی پازدەیەمدا ئیتاڵیایان داگیر کرد. شێوازی بیناسازیی گۆتیک هاوپێوەندە بە بنیاتنانی کلێساوە لە باکوری ئەوروپا. کلێسای بنیاتنراو لەسەر شێوازی گۆتیک بڵندە و ڕووبەرێکی کەم داگیر دەکات، بە پێچەوانەی شێوازی بیناسازیی ڕۆمانی کە کلێسا نزمە و ڕووبەرێکی گەورە داگیر دەکات.

لیمنی:

ناوچەیەکی گەشتەوەریی دڵگیرە کەوتووەتە کەناری ڕۆژئاوای دوورگەی ئێڤیای

یۆنانییەوە. لیمنی بەهاوینان شوێنێکی دڵگیری حەسانەوەی گەشتیارانی ئەوروپییە.

مووەقیتخانە: ناوەندێکی پاشکۆی مزگەوتە بۆ چاودێری و دەستنیشانکردنی کاتەکانی نوێژو و ڕۆژوو و جەژن و بۆنە ئیسلامییەکان.

مەریچ: ڕووباری مەریچ، بە یۆنانی ئەڤرۆس، ڕووبارێکە سنووری وشکایی تورکیا و یۆنان و بەشێکیش لە سنووری تورکیا و بولگارستان لەیەک جیا دەکاتەوە.

نەعیمە:

مێژوونووسی عوسمانی مستەفا نەعیمە ١٦٥٥-١٧١٥ز.

هەیبەلی:

یەکێکە لە سەوزترین دوورگەکانی دەوری ئەستەنبوڵ و چوار گردۆلکەی بەسەرەوەیە کە هەرە بەرزەکەیان ١٤٠ مەتر لە ئاستی ڕووی دەریاوە بەرزە.

هیپۆکرات:

کوڕی ئاکدیلۆس هیپۆکراتە. ساڵی ٤٦٠ پ.ز. لە دوورگەی ئیستانکۆی یۆنان لە دایک بووە و ساڵی ٣٧٧ پ.ز. لە لاریسا کۆچی دوایی کردووە. بە باوکی زانستی نۆشداری دادەنرێ و یەکەمین کەسە لە مێژوودا کتێبی پزیشکیی نووسیبێ.

یاسیادا:

دوورگەیەکی بچووکە لە دەریای مەرمەڕەدا، لە نزیک ئەستەنبوڵ هەڵکەوتووە.

ڕۆمانی بەفر:

(کا)ی شاعیر دوای بەسەربردنی دوازدە ساڵ ژیان لە تاراوگەی ئەڵمانیا، بۆ ئەستەنبوڵ دەگەڕێتەوە. چوار ڕۆژ دوای گەڕانەوەی، ڕۆژنامەیەکی ئەستەنبوڵی بۆ ئەنجامدانی ریپۆرتاجێک لەبارەی دیاردەی خۆکوشتنی ژنان و هەڵبژاردنەکانی شارەوانی، کە چاوەڕێ دەکرێ ئیسلامییەکان سەرکەوتنی تێدا بەدەست بهێنن، ڕەوانەی شاری قارس دەکات. ئەمیش بەژێر بەفرێکدا کە هێدی هێدی و بێ وچان دەبارێ، کۆڵان بە کۆڵان و دوکان بە دوکان دەگەڕێ و دەکۆشێ، ئاشنای ئەو شارە غەمگین و جوانە و دانیشتووانی دەبێ. لە گەڕانەکانیدا دەچێتە چایخانەکانی سیخناخ لە بێکارانی کورد و سەر لە خێزانی کچان و ژنانی خۆکوشتوو دەدات و لە هۆکارەکانی خۆکوشتنیان دەکۆڵێتەوە. لە ئاکامی هاتوچۆی زۆر و تاوسەندنی خولیای لێکۆڵینەوەدا، دەکەوێتە ناو تەنگژەی سیاسی و ئاینی و ڕاپێچی تۆڕێکی تەمومژاویی پێوەندی و شەڕی دەسەلات و پیلانگێران دەبێ. بێ پەروا بە کوچە و کۆڵانەکانی

شـارێکـی نەگبـەت، کـە خـواش فـەرامـۆشـی کـردووە، بەدوای ئەڤـینی کۆنـی سـەردەمی زانکۆ و ڕاستی و لێکدانەوەی شیعرەکانیدا دەگەڕێ. لەپڕ کودەتایەک دەقـەومێ. بەفر ڕێگا و بانەکان دەگرێ و کەس ناتوانێ شـار بەجێ بهێڵێ.

**ڕۆمـانەکـانی ئۆرهـان پامـوک ئەوە دەسـەلمێنن ئەو شـایەنی خـەڵاتی نۆبڵ بوو.**

کۆواری ئایندە – کوردستان

**– ئۆرهـان پامـوک نـە ئیـدۆلۆگ و نە سـیـاسـەتوان و نە ڕۆژنامـەوانە، بگرە ڕۆمانووسێکی گەورەیە.**

ڕۆژنامەی نیۆیۆرک تایمز – وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا

**ڕۆمـانـووسـی تورک ئۆرهـان پامـوک چۆنیـەتیی ڕۆمـانـووسـین نیـشـانی ئەورووپا دەدات.**

ڕۆژنامەی فرامکفۆرتە ئالگامانیە – ئەڵمانیا